# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی

52

ئەیلولی

2007

سـاڵی نۆیەم

–سەردەم گۆڤارێکە بە سێ مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

–تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

–بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

–هەر نووسەرێك لە ئەنتەرنێتەوە بەرهەم وەردەگێڕێت سایتەکە و ڕۆژی بڵاوبوونەوەی بنووسێت.

–هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت.


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی شوان ئەحمەد

د. شاهۆ سەعید

دەرهێنان و کاری کۆمپیوتەری

تاڤگە فائق

بەرگ: قادر میرخان

هەڵەچنی چاپ: ساکار ڕەووف

سەرپەرشتیاری چاپ: فەرهاد ڕەفیق



ناونیشان

سلێمانی – شەقامی سالم

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 2136659

دەزگای سەردەم *3129609*

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

**Tel - Fax: 0044 7543129839**

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە ( ***14665/615*** و ***14665/616***) تاران

لە ڕێگەی ( ئیمەیل )ەوە:

govarysardam@yahoo.com

govarisardam@sardamco.com

www.sardamco.com



دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە

# ناوەرۆك



## وێستگەکانی سەردەم



**نرخی** (1200) **دینارە**

# پرۆژەی تێگەیشتن و راڤەکردنی ئاین

## سۆسیۆلۆژیا و ئاین

نووسینی: دانیال هیرڤیۆلێژی
ژان پۆل ویلیەم
لە فەرەنسییەوە: عادل باخەوان

بەشی دووەم

### 5-راڤـەکردنی ئـاین لـە چوارچـێوەی مـاکرۆ - سۆسیۆلۆژیادا

لــە قوتابخانــەی مارکسیســتدا هەمیشــە "ئەولەویــەت" بــە چوارچــێوەیەکی گــەورەی مـاکرۆ- سۆسـیۆلۆژی راڤـەکردن دراوە. هـەموو دیـاردە کۆمەڵایەتیـە تایبەتـەکان، بـۆ نموونـە ئاین، لە چوارچێوەیەکی گلۆبالی راڤەکردندان، چوارچــێوەیەك کــە "ئەولەویــەت" دەدات بــە فاکتــەری ئــابوری و "مــەوقیعی" تاکــەکان لــە نێــو پەیوەندیــەکانی بەرهەمهێنانــدا. لــە قوتابخانەی مارکسیستدا کۆمەڵگە بەم شێوەیە وێنا دەکرێت:

ئـانفرا- سـتراکتۆر ئـابوری: بناغـەی هـەموو چوارچێوەکانە.

ئانفرا – ستراکتۆر ئابوری: لەلایەن پانتایی بەرهـەمهێنانی مـاددی و سـوپەر- سـتراکتۆری دەزگایی و ئایدۆلۆژیەوە دروستبووە.

لە هەمانکاتدا ئەو دوو رەگەزەی سەرەوە، لە بەرامبەر ئانفرا-ستراکتۆر ئابوری بێدەسەڵاتن و دەکرێـت بڵـێین لـە باشـترین حاڵەتـدا خـاوەنی ئۆتۆنــۆمیکی "رێــژەیی" و پــەراوێزین، ئۆتۆنۆمیــەك کــە توانــای گــۆڕینی رەوتــی رووداوەکانی نییە.

ئــانفرا- ســتراکتۆر ئــابوری هــەموو چوارچێوەکان دیاری دەکات، واتە چوارچێوە

دەزگاییەکان (سیاسی و یاسای و پەروەردەی و ئاینی، ..) و چوارچێوە ئایدۆلۆژیەکان (تیۆری، کۆنسێپت، نوێنەرایەتیکردن، ..) پێکەوە لەلایەن ئانفراستراکتۆری ئابوریەوە دەستنیشاندەکرێن.

لەم خەیاڵدانەدا کۆمەڵگە وەك بینایەکی چەندین قاتی راوەستاو لەسەر بناغەیەك دەردەکەوێت. قاتەکان بریتین لە سوپەر – ستراکتۆرە دەزگای و ئایدۆلۆژیەکان، بناغەکەش بریتیە لە ئانفرا- ستراکتۆرە ئابوریەکە. بێگومان لە خەیاڵدانی مارکسیستدا، قاتەکان دەتوانن کارایی دابنێن بەسەر ژیان و بوون و ئامادەیی بناغەوە، سوپەر – ستراکتۆرەکان دەتوانن بەشداری بکەن لە بەرهەمهێنانی روداوەکاندا، بەڵام ئەوەی دوا رستەی ئەو رووداوانە دەنوسێتەوەو بریاری کۆتاییان لەسەر دەدات و چوارچێوەی کۆتاییان بۆ دەستنیشان دەکات سوپەر ستراکتۆرەکان نین، بەڵکو هێزە بەرهەمهێنەرەکان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانن. گەر ئاین یان سیاسەت لە قۆناغێکی مێژوویدا توانیبێتی رۆڵێکی کارا ببینێت، لەبەر ئەوە بووە کە هەلومەرجە ئابوریەکە ئەو دەرفەتەی پێبەخشیوە. سەبارەت بە سەدەی ناوەڕاست و ئەنتیکیتیٚ لە سەرمایەدا مارکس دەنووسێت:

"هەلومەرجی ئابوری دەتوانێت پێمانبڵێت بۆچی ئاین و سیاسەت لەو سەردەمانەدا توانیویانە رۆڵی سەرەکی ببینن" (کارەکانی مارکس، بەشی یەکەم، لا617).

لە رێگای ئەم خەیاڵدانەوە، ئێمە لە رۆژئاوا[11]، یاسایەکی گشتیمان سەبارەت بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی داناو ئابوریمان کرد بە چرکەی یەکەم و دەسەڵاتی چوارچێوە دانەری کۆی کۆمەڵگەکانمان. ئەم یاسا گشتیە رێگا دەگرێت لە گەڕانەوە بۆ سەر رابوردوی کۆمەڵگەو شارستانیەتەکانی دیکە بە مەبەستی تێگەشتن لە پەیوەندی تایبەتیان بە ئابوریەوە، بێگومان ئەمە مانای نەفیکردنی بەشداری زیندوی فاکتەری ئابوری لە بەرهەمهێنانی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکاندا نییە.

قسەکردن لە دیاردە کولتوریەکان وەك سوپەر – ستراکتۆری ئایدۆلۆژی چوارچێوە بۆکێشراو لەلایەن ئانفرا–ستراکتۆری ئابوریەوە، کردەی مێژوویی "چۆنیەتی بوون بە" سوپەر – ستراکتۆری ئەو دیاردانە پەردە پۆشدەکات[12]. بە دیوێکی دیکەدا دەمانەوێت بڵێین، بۆ بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی دروست، دەبێت ئێمە بە جیا چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی دەرهاویشتە ئابوری و دیمۆگرافی و سیاسی و کولتووری و ئاینیەکانی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا، راڤە بکەین، میشێل دو سێرتۆ لەم بارەیەوە دەنووسێت:

"لە کۆمەڵگەیەکدا، سامبۆلە گشتی و بۆچوونەکان وەك چۆن هۆکاری گۆڕانکاریەکانن ئاواش رەنگدانەوەیانن. گۆڕانکاریەکان لە یەککاتدا دەستکاری ستراکتۆر و (باوەڕپێکراوەکانیش) دەکەن. ئەمە ئەو بزووتنەوەیەیە کە کۆمەڵگە بە بۆچوونەکانیشیەوە رێکدەخات.

بزووتنەوەی گۆڕانکاریەکان لەسەر چەن رژێمێك خۆی مانیفێست دەکات (ئابوری،

کۆمەڵایــەتی، زانســتی، هتــد) دەکرێــت ئــەم ڕژێمانــە لــە پانتاییەکــدا یەکبگرنــەوە، بــەڵام هەمیشە بە سەربەخۆیی دەمێننەوە بەڕادەیەك کە ڕژێمێك نابێتە هۆکاری بوون و ئامادەیی ڕژێمێکــی دیکــە. واتــە سیســتەمەکانی کۆمەڵایەتی – ئابوری و بەسەمبۆڵکردن یەکتری تەواو دەکەن بەبێ ئەوەی لەیەك شووناسدا بتوێنەوە یان وەك بینایەکی ڕاوەستاو لەسەر بناغە و قات دەربکەون"[13]

هەر لە چوارچێوەی ڕاڤەکردنی کۆمەڵگە لەسەر بنەمای ئانفرا–ستراکتۆر و سوپەر – ستراکتۆردا، مارکس و ئینگلس پەی دەبەن بە جۆرێك لە پەیوەندی تایبەت لە نێوان سەرمایەداری و کریستیانیسم لە چاپە "پرۆتستانت"ەکەیدا. کۆمەڵگەی کەپیتالیست:

"لــە کریستیانیســم و پەرەســتنە موجەرەدەکانی و تیپە بۆرژواکانی و بە تایبەتی لە پرۆتستانتیسم دا، ئەو ڕەهەندە ئاینیە دەدۆزێتەوە کە پێویستی پێیەتی و لەگەڵ بزووتنەوەکەیدا یەکدەگرێتەوە" (ه، س، پ، 613–614)

لێرەدا تێبینی دەکەین کە مارکس پێش ڤێبەر، باسی لە پەیوەندی نێوان کەپیتالیسم و پرۆتستانتیسم کردوەو وەك ئاینێکی بۆرژواز" خستویەتیە سەر شانۆ. بەڵام بە پێچەوانەی ڤێبەرەوە، گرفتی مارکس لەوەدایە کە کارناکات لەسەر گەشەپێدانی تێوریەك لەسەر ئەم پەیوەندیە.

مارکس پێیوایە چاخی سەرمایەداری لە سەدەی شازدەوە دەستپێدەکات. ریفۆرمی پرۆتستانت و دەستگرتن بەسەر کەنیسەدا، لە بەریتانیادا، ڕێگا خۆشدەکات "بۆ ئەوەی گەل لە سەدەی شازدەهەمدا نەتوانێت ببێت بە خاوەنی موڵك" (ه، س، پ، 1170).

پرۆتستانتیسم ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە دروستبوونی پێکهاتەی سەرمایەداریدا بەتایبەتی "لەو چرکەوە کە زنجیرەی گۆڕانکاریەکانی لە کردنەوەی ڕۆژەکانی پشوودان بۆ کارکردنەوە دەسپێکرد" (سەرمایە، لا 1170).

لەسەر هەمان ڕێگای بیرکردنەوە، ئینگلس قۆناغەکانی ململانێی نێوان بۆرژوازی و فیودالیسم دیاریدەکات و دوای ئەوەی کە لۆتەریانیسم بەو "ئاینە دەزانێت کە پاشانشینی ڕەها پێویستی پێیەتی"، دێت و باس لە پەیوەندی نێوان کەلڤینیسم[14] و کەپیتالیسم دەکات:

"دۆگمی کەلڤینیست وەڵامێکی ئیجابیانەی پێویستیەکانی چینی بۆرژوازی ئەو سەردەمەی دەدایەوە. لە مەزهەبە قەدەریەکەی کەلڤیندا، جیهانی بازرگانی موناقەسە، بردنەوەو دۆڕاندن، پەیوەندی بە چالاکی و زیرەکی مرۆڤەوە نییە، چونکە شتەکان پێشتر لەلایەن خواوە بڕیاریان لەسەر دراوەو مرۆڤ کۆنترۆڵی بەسەریاندا نیە"[15].

بەڵام لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە دووپاتکردنەوەی "دڵداریەك" لە نێوان چەند گوزارشتێکی ئاینی و چەند بەرژەوەندیەکی ئابوری – سیاسیدا شتێکەو کورتکردنەوەی ئاینیش لە ماسکێکدا کە گوزارشت لە بەرژەوەندیەکانی دەکات شتێکی دیکەیە. فەیلەسوفێکی مارکسستی وەك ئێرنست بلۆش

(1885-1977)، لـــه ســاتی تویژینـــەوه لەسەر تۆمـاس مـونزەر کـه یـەکێك بـوو لـه ئەکتـــەره بەناوبانگـــەکانی ریفــــۆرمی رادیکـــاڵی ســـەدەی شـــازدەهەم، دێـــت و گوزارشـــتی "تیۆلۆژیـــای شـــۆرش" بـــۆ ناساندنی ئـەم پیـاوه هەڵدەبـژێرێت. ئێرنسـت بلـــۆش پێـــدادەگرێت لەســـەر ئامـــادەیی "ســـتراکتۆره رۆحیـــەکان" لەســـەر ئاســـتی جیهان و هەوڵدەدات سیفەتی "جیهانیبوونیـان" پێببەخشێت:

"گـەر بەرژەوەندیـە ئابوریـەکان لـە هـەموو شتەکانی دیکه جەوهەریتر و گرنگتر بن، دەتوانم بڵـێم ئـەوان، بـە تـەنهاو بـە درێـژایی مێـژوو، لـە هـەموو شـتەکانی دیکـە بـەهێزتر نـین و هۆکـاره سەرەکیەکانی جولآنەوەی رۆحی مرۆڤەکان نین، بـە تایبـەتی لـەو قۆناغانـەدا کـە سـۆزی ئـاینی هەیمەنـە دەکـات بەسـەر کۆمەڵگـەدا (...) لـە پـەنای روداوه ئابوریەکانـدا، ئێمـە تێبـینی دەکەین کە، نەك هەر بە تەنها بڕیاره ئازادەکان، بـــەڵکو ســـتراکتۆره رۆحیـــەکانیش لەســـەر ئاســتی جیهـانی و بـە شـێوەیەکی کـارا لـە بەرهـــەمهێنانی چـــالاکیدان و بـــوون بـــە واقیعێکی سۆسیۆلۆژی"(16).

### 6-راڤەکردنی ئاین لە چوارچێوەی ئیشکالیەتی چینە کۆمەڵایەتیەکاندا

بـە سـتراکتۆرکردنی چـالاکی ئـابوری ئـەو پانتاییه کە مارکس بە ناڵدانی کۆی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیـەکانی دادەنێـت. ئـەو دوو چـینی کۆمەڵایـەتی دەستنیشـان دەکات کـە لـە رێگـای "مـــەوقیعیان" لـــە نێـــو پەیوەندیـــەکانی بەرهەمهێنانـــدا شووناســـی خۆیـــان دەخەنـــە سەر شانۆ.

-چـینی یەکـەم بریتیـە لـە بـۆرژوازی کـە خاوەنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانە.

-چینی دووەمیش بریتیە لە پرۆلیتاریا کە تەنها هێزی بازوی هەیە بۆ فرۆشتن.

مارکس و ئینگلس پێیانوایە ئەو پرۆسەیەی کە پەیوەندی نێوان ئەم دوو چینە رێکدەخات لەســـــەر بنـــــەمای "ئیســـــتیغلال - ئیکسپلواتاسیۆن" دامەزراوه:

ســەرمایەدارەکان وەك کــالاً مامەڵــە لەگــەڵ چـینی پرۆلیتاریـادا دەکـەن. لێـرەوه تیـوری "ئیسـتغلال - ئیکسپلواتاسـیۆن" لای مـارکس دەبێت بە تیوری ململانێ لە نێوان موچەوەرگرو موچەدەرەکاندا و هەر لایەك دەیـەوێت بـە هاکان ماڵی بکات.

هەرچـــەند "موقارەبـــەی" مارکسیســـت بـەردەوام گلـۆپ لەسـەر ململانێـی دوو چـینی کۆمەڵایـــەتی دادەگیرســـێنێت، بـــەلآم خـــودی مـارکس، لـە چـەند تێکسـتێکیدا، دان بـە بـوونی زیاتر لە دوو چینی کۆمەڵایەتیدا دەنێت. کاتێك مـارکس لـە ئایـدۆلۆژیا دێتـە دەرەوەو لـە گۆشـە نیگای دەستنیشانکردنی واقیعەوه وەك ئـەوەی هەیـە دێـت و تێبـینی چـەند چـینێکی دیکـە دەکـات. بـۆ نموونـە چـینی جوتیـاران، چـینی بـورژوا بچـووکەکان، چـینی ئەریستۆکراسـی، چینی خوار - پرۆلیتاریا، هتد.

بـــەلآم ئایـــا ئێمـــە دەتـــوانین قســـە لـــە بـوونی چـینێکی کۆمەڵایـەتی بکـەین، بـەبێ ئامادەبوونی لایـەنی کـەمی وشیاری چینایەتی لای چینی باسکراو؟

ئەم چیرۆکە دەمانباتەوە سەر ئیشکالیەتە مێژووییەکەی "وشیاری چینایەتی". لە مەیدانێکی ئاوادا، ئێمە ناتوانین بازبدەین بەسەر ئەو شووناسانەی کە ئەکتەرە کۆمەڵایەتیە "تویژینەوە لەسەر کراوەکان" بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ یەکتر و دەرەوەی خۆیاندا دەیانخەنە سەر شانۆ. بە دیوێکی دیکەدا دەکرێت بپرسین:

ئایا ئینتیمای ئەکتەرێك بۆ چینێکی کۆمەڵایەتی چوارچێوەی شووناسەکەی دیاری دەکات یان نا؟

ژان- پۆل سارتەر لە باسکردنی نووسەر "پۆل ڤالیری"دا بە سەلبی وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە. ئەو دان بەوەدا دەنێت کە ڕەهەندی کۆمەڵایەتی دەکرێت بەشداری بکات لە دیاری کردنی چوارچێوەی ڕەفتار یان نووسینی کتێبێکدا، بەڵام کۆی چوارچێوەی ڕەفتارێك یان نووسینی کتێبێك بە تەنها لەلایەن ڕەهەندی کۆمەڵایەتیەوە دیاری ناکرێت. ئەو دەڵێت:

"پۆل ڤالیری نووسەرێکی وردە بۆرژوایە، بەڵام هەموو نووسەرێکی وردە بۆرژوا پۆل ڤالیری نییە".

لای مارکس و ئینگلس، ئیشکالیەتی چینە کۆمەڵایەتیەکان و ئیشکالیەتی هەیمەنە لەیەکتری جیادەکرێن. مارکس لە "ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی"دا دەنووسێت:

"فیکری چینی هەیمەنەدار، لە هەموو قۆناغێکی مێژوویدا، دەبێت بە فیکری هەیمەنەدار"

مارکس دەیەوێت بڵێت، ئەو چینە کۆمەڵایەتیەی کە لە کۆمەڵگەیەکدا کۆنترۆڵی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان دەکات، لەسەر ئایدۆلۆژیاش هەیمەنەی خۆی دەسەپێنێت. چینی هەیمەنەکار باوەڕی وایە کە بەتەنها ئەو نوێنەرایەتی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگە دەکات و بۆچوونە سیاسی و یاسای و ئەخلاقیەکانی حەقیقەتی ڕەهاو هەمیشەیین!

دابەشکردنی کۆمەڵگە بەسەر چینەکاندا، ڕێگا بۆ ئینگلس خۆشدەکات کە لەسەر جیاوازیە کۆمەڵایەتیەکانی گوزارشتە ئاینیەکان رابووەستێت، بەتایبەتی لەسەر کریستیانیسم. لە تویژینەوەکەیدا لەسەر "جەنگی جوتیارەکان" (1850) ئینگلس دوو بەرە جیادەکاتەوە: بەرەی کاتۆلیك (بەرەی کاردانەوە، لۆتەری بۆرژوا - ریفۆرمیست) لەلایەك و بەرەی شۆڕشگێڕەکان کەلەلایەن "تۆماس مونزەر"ەوە نوێنەرایەتی دەکرا لەلایەکی دیکەوە. لەم تویژینەوەیەدا، ئینگلس وەك چۆن کلیك دەکات لەسەر ڕەهەندە شۆڕشگێڕییەکەی چەمکە ئاینیەکانی "تۆماس مونزەر" کە دەیویست لەیەککاتدا ئاین و کۆمەڵگە پێکەوە بگۆڕێت، ئاواش روناکی دەخاتە سەر تێکەڵبوونی گوزارشتە ئاینیەکان بە ئیشکالیەتی چینە کۆمەڵایەتیەکانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئینگلس کردەی راڤەکردنی سەر لە نوێ سنوردار دەکاتەوەو لە دەرەنجامی تویژینەوەکەیدا ململانێی ئاین دەکات بە پاشکۆی ململانێی چینایەتی:

"تەنانەت لەو جەنگەشدا کە ناونراوە جەنگی ئاینەکانی سەدەی شانزەهەم، ململانێی چینەکان دەردەکەوێت و هاوپەیمانیەکان لە بەریتانیا و فەرەنسادا لەسەر بەرژەوەندیەکانی

چـــین دادەمـــەزرێت. دەركـــەوتنی ململانێـــی چینەكان، بەرژەوەندیەكانیان، پێویستیەكانیان، داواكاریـــەكانیان، لـــەو قۆناغـــە مێژووییـــەدا، بەكارەكتـەرێكی ئاینیـەوە، هـیچ لـە هاوكێشـەی ململانێـی چـینایەتی ناگۆڕێـت، چـونكە هـەر قۆناغێـك هەلومـەرجی تایبـەتی خـۆی هەیـە." (*SR, 99*)

راسـتە لـە سـەدەی شـازدەهەمدا ئـاین و سیاسـەت بـە شـێوەیەك تێكـەڵ بـە یـەكتری بووبـــوون تـــا ڕادەیـــەك كـــە تەنانـــەت شۆڕشـــگێڕەكانیش دەبـــوو لـــە سەرشـــاری "هەرتەقەی تیۆلـۆژی"ەوە گوزارشـت لـە خۆیـان بكەن. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە كە هـەموو ئـەو ململانـێ ئاینیانـەی سـەدەی شـازدەهەم لـە بەرژەوەندی چینایەتیدا كورتبكەینەوە؟ لە وەڵام دانـەوەی ئـەم پرسـیارەدا، راڤـەكردنی كـردە ئاینیـەكان قورسـایی خۆیـان بـەكاردەهێنن بـۆ بەرهـــەمهێنانی زانســـتێكی بابەتیانـــەی نـــا ئایدۆلۆژی.

لـە گۆشـە نیگـای سۆسـیۆلۆژیاوە، سـەرەتا ئێمـــە قـــەرزاری ئینگلســـین كـــە لـــە ڕێگـــای راڤەكردنـەوە پێـی گـوتین: ماكینـەی ململانێـی نێوان هێزە كۆمەڵایەتیە دژ بە یەكەكان پانتایی ئـــاین تێدەپـــەڕێنێت و تەنانـــەت گوزارشـــە ئاینیـــەكانیش بـــە پێـــی جیـــاوازی ناوەنـــدە كۆمەڵایەتیەكان خۆیان دەگۆڕن.

لێـــرەوە ئێمـــە دەتـــوانین بڵـــێین، بـــە بەرهـەمهێنانی ئـەم راڤەكردنـە لەسـەر پەیوەنـدی نێوان ئاین و ململانێی چینایەتی و بە رۆشنایی خسـتنە سـەر ئـەوەی كـە گوزارشـتە ئاینیـەكان ناتوانن لە "دێتێرمینیسم"ی كۆمەڵایـەتی بڕۆنـە دەرەوەو گوتارە جیهانیەكانی ئاینی وەك "ئێمـە هـەموومان بـرای یـەكترین" ناتوانێـت كـارایی ناوەنـدە كۆمەڵایەتیـەكان لەسـەر دەركەوتنـە ئاینیـەكان بشـارێتەوە، ئیـنگلس بەشـدارێكی گرنگ دەكات لە دامەزراندنی سەرەتاكانی كاری سۆسیۆلۆژیا لەسەر ئاین و كردە ئاینیەكان.

بـــەم شـــێوەیە، لەســـەرەتای كارەكـــانی سۆسـیۆلۆژیاوە لەسـەر كاتۆلیسیسـم، ئیـنگلس دێـت و لـە یەككاتـدا دوو مەلـەف بـۆ ئێمـە دەكاتەوە:

–مەلـەفی كـاركردن لەسـەر مێـژووی جـوگرافی ئـــاین و گرنگـــی رۆڵـــی كولتـــورە لۆكـــاڵ و ناوچەییەكان..

–هـــەروەها مەلـــەفی كـــاركردن لەســـەر رونكردنـەوەو دەرخستنی چۆنیەتی بیانكردنی جیاوازی "موقارەبە"كانی كریستیانیسم لە نێو ناوەندە كۆمەڵایەتیە جیاوازەكاندا.

ئێمیـل پـین لـە توێژینەوەیەكیـدا بـە نـاوی "پراكتیكـی ئـاینی و چـینی كۆمەڵایـەتی" كـە ســـاڵی 1959 بڵاوبـــووەوە، چـــەندین "كریستیانیسم"مان دەخاتە بەردەست:

–كریستیانیسمی بورژوا.

–كریستیانیسمی جەماوەری.

–كریستیانیسمی چینی ناوەڕاست.

ئینتیما بۆ چەند سامبۆلێكی ئاینی توانای ئـــەوەی نییـــە جیاوازیـــە كۆمەڵایەتیـــەكان بكوژێنێتـەوە. ڕاسـتە ئـاین دەتوانێـت ئـەو جیاوازیانـە لاواز بكـات و سـنوریان بـۆ دابنێـت، بەڵام ناتوانێت لە ڕیشەوە هەڵیان بكەنێت. كاری سۆسیۆلۆژیای ئاین لێرەوە دەست پێدەكات و دەبێـت بۆمـان رونبكاتـەوە: چـۆن گەردوونـە

ئاینیەکان، بەپێی ئینتیمای کۆمەڵایەتی تاکەکان، چوار چێوە جیاوازەکانیان بینادەکەن. ماکس ڤێبەر، بەبێ ئەوەی خۆی فڕێبداتە نێو هاوکێشەی ململانێی چینە کۆمەڵایەتیەکان، بەوپەڕی بایەخەوە باس لە جیاوازیەکانی نوێنەرایەتیکردن و دەرکەوتنە ئاینیەکان بەپێی جیاوازی ناوەندە کۆمەڵایەتیەکان دەکات.

ئینگلس زۆر ئارەزوومەند نەبوو بە دروستکردنی پردی پەیوەندی و لەیەکچواندنی کریستیانیسمی سەرەتایی بە بزووتنەوەی کرێکاری. لەگەڵ ئەوەشدا بە دەستی خۆی ئەم کارە ئەنجام دەدات. لە "بەشداریکردنی کریستیانیسمی سەرەتایی لە مێژوودا"، ساڵی 1894–1895 بڵاو بووەتەوە، بەم شێوەیە دەنووسێت:

"وەك ئەوەی بزووتنەوەی کرێکاری نوێ، کریستیانیسم لە سەرەتادا بزووتنەوەی چەوساوەکان بووە: لەسەرەتادا ئاینی کۆیلە و بێنەواو ستەملێکراوو بێماف و گەلە سەرشۆڕکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی رۆم بوو. کریستیانیسم و سۆسیالیسمی کرێکاری پێکەوە، بانگەشە دەکەن بۆ رزگار بوون لە کۆیلایەتی و کلۆڵی، کریستیانیسم ئەم رزگاربوونە لە "ئەوێ"، لە ژیانی دوای مردن، لە ئاسماندا دەبینێت، بەڵام سۆسیالیسم "لێرە"، لە گۆڕانەکانی کۆمەڵگادا دەیبینێت. هەردوولاش کەوتوونەتە بەر زەبر و زەنگ و پەلاماردان. (...) بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو توندوتیژیەشدا هەردوولا رێگای سەرکەوتن دەگرنە بەر و بەرەنگاری دەکەن" (*SR, 310*)

کریستیانیسم و سۆسیالیسم بزووتنەوەی جەماوەرین و لە سەرەتاوە وەك چەند "سێکت"ێکی بچووك دەردەکەون. ئینگلس پەرەگرافێکی ئرنست رێنان لێرەدا تۆمار دەکات، پەرەگرافێك کە تیایدا کردەی بەراوردکردن پێچەوانە دەکاتەوە:

"ئەگەر ویستتان لە کۆمینۆتی سەرەتاییەکانی کریستیانیسم تێبگەن، تەماشای لقێکی لۆکالی رێکخراوی ئەنتەرناسیۆنالی کرێکاران بکەن".

ئینگلس هەوڵدەدات تەفسیرێکی ماتریالیستانەی گەشەکردنی کریستیانیسم بکات: لە رێگای چەمکی "قووربانیی تاقانەوە"، کە هەموو گووناهەکانی مرۆڤ لە هەموو سەردەمەکاندا دەسڕێتەوە، کریستیانیسم:

"دەرگای کردەوە لەسەر هەموو ئەو بازرگانیەی کە پێشتر قەدەغە بوون لە نێوان ئایندارە جیاوازەکاندا". (*SR, 321-322*)

لە ساتەکانی شکست و گرفتە هەرە گەورەکانی بزووتنەوەی کرێکاریدا، ساڵی 1895، ئینگس ئەم لێکچواندنە قوڵدەکاتەوەو بۆ دڵدانەوەی بزووتنەوەی کرێکاری نموونە بە مەسیحیە سەرەتایەکانی سەدەی یەکەم دەهێنێتەوە ئەو باس لەوە دەکات کە مەسیحیە سەرەتاییەکان، لە یەکەم هەنگاویاندا وەك "گروپێکی مەترسیداری روخێنەری ئاین و دەوڵەت تەماشا دەکران"، بەڵام چەند ساڵێك دواتر ئاینەکەیان دەبێت بە ئاینی رەسمی دەوڵەت. لێرەوە تێدەگەین لەوەی کە هەموو رەخنە فەلسەفی و سیاسیەکانی لە ئاین، نەیانتوانی رێگا بگرن لە سەرسامیی ئینگلس

لــە بەرامبــەر قــەدەری  مێــژووی و کۆمەلایــەتی ئاینەکاندا.

## 7-بەشداری و سنورەکانی ڕەڤەکردنی مارکسیست لە سۆسیۆلۆژیای ئاینەکاندا

کـــردەی راڤـــەکردنی مارکسیســـت ســـێ سەرچـــاوەی گـــرنگ دەخاتـــە بەردەســـتمان: سەرچـاوەیەکی میتۆدۆلـۆژی، سەرچـاوەیەکی تێماتیک، سەرچاوەیەکی سیاسی.

لـــە سەرچـــاوەی یەکەمـــدا، کـــارکردنێکی بـــــەردەوام ئامادەیــــە بـــۆ ئاشـــــکراکردنی "ئەنتراکســیۆن"ی نێــوان چــرکە جیاوازەکــانی کۆمەڵگــە. واتــە کــارکردن لەســەر کۆکردنــەوەی هــەموو شــتەکانی کۆمەڵگــە لــە "گشــتێك"دا. ئـــــەم "گشـــــت"ە دێـــــت و ســــــەرلەنوێ کـــــردە کۆمەلایەتیـــــەکان دادەڕێژێتـــــەوە، بەتایبــەتی ئــەو کردانــەی کــە پێویســتن بــە جیهـــــــــــانی "نوێنەرایـــــــــــەتیکردن" و "بۆچـــوون"ەکانـــەوەو دانانیـــان لـــە نێـــوان چوارچـــێوەیەکدا کـــــە هـــــەموو ڕەهەنــــدە کۆمەلایەتیەکان لە خۆبگرێت (ئابوری، سیاسی جیاوازیـــە کۆمەلایەتیـــەکان، مەوقیعـــە دژ بـــە یەکەکان، هتد،.).

لە سەرچاوەی دووەمدا، گرنگیـەکی بێسنور دەدرێت بـە ناوەنـدە کۆمەلایەتیـەکان (لـە زمـانی مارکســـــیدا تێرمـــــی چـــــینی کۆمەلایـــــەتی بــــــەکاردەهێنرێت) و ململانێکـــــانی. ئــــــەم سەرچاوەیە دەیـەوێت لـە یادەوەری ئێمـەدا ئـەم بنەمایە بچەسپێنێت:

گـەر حەقیقـەتی جیهـانی کۆمەلایـەتی بـریتی بێـت لـە گـرەوی ململانـێ (پیـەربۆردیۆ)، ئـەوا دەتوانین بە هەمان شێوە بڵێین، حەقیقـەتی هـەر ئاینێکیش گرەوی ململانێیە.

لـەبیرمان نەچێت کـە ئەمانـەی گوزارشـت لـە ئـاین وەك ترادیســیۆنێکی زینـدوو دەکـەن، ئـەو پیاوو ژنانەن کە لە قولایی ناوەنـدە کۆمەلایـەتی و کولتوریەکانـــەوە دێنـــە دەرەوەو، بـــەردەوام خۆیان لەسەر ئاستی ململانێ پێناسـە دەکـەن و دەکەنەوە.

لەسەرچاوەی سێیەمدا، مارکسیسـم گرنگـی دەدات بە سیستەمەکانی هەیمەنەو شـەرعاندنی دەسەلات. لەم سەرچاوەیەدا مارکسیسم روناکی دەخاتــە ســەر رۆڵــی کــارای "میدیاســیۆن"ی رەمـزی لـە بەرهـەمهێنانی کـردەی کۆمەلایەتیـدا ئەم "میدیاسیۆن"ە هەروەك چۆن دەکرێت ببێت بـە ماکینـەی شـەرعاندنی "هەیمەنـە"، ئـاواش دەکرێت ببێت بە بازووی بەهێزی "یاخیبوون". مـــارکس هـــەردوو حاڵەتەکـــە دەخاتـــە ژێـــر پرسیارەوە.

یـــەکێك لـــە بۆشـــاییەکانی راڤـــەکردنی مارکسیست، بریتیە لەوەی کە نە مارکس و نە ئیـــنگلس، ســـەرەڕای کـــارە مێژوویـــەکانیان، بایـەخی "تـەواو"یـان نـەداوە بـە رەهەنـدی یاخیبوونـــە ئاینیـــەکان. ژنـــە فەیلەســـووفی مارکســـی، میشــێل بێرترانــد، لــەم بارەیــەوە دەنووسێت:

"مـــارکس و ئیـــنگلس بـــە هەڵـــە لـــە پێشـکەوتنەکانی کریستیانیسم تێگەیشتبوون. ئەوانە تێنەگەشتبوون لـەوەی کـە کریستیانیسـم دەتوانێــت باوەشــبکاتەوە بــۆ خــەم و ئــازاری چەوساوەکان(...). گومانی ئەوان لە، دەسەلاتی ســەرلەنوێ لێکدانــەوەی جیهــانی گــۆڕاوی

کریستیانیسم، لە شوێنی خۆیدا نەبوو (...) قسەکردن لە کۆتایی هەستی ئاینی و پەیوەندی ئاین بە جیهانەوە زۆر لەوە ئاڵۆزترە کە ئەوان باسی دەکەن (...) ئێمە دەبێت تێبگەین لەوەی کە مەرج نییە هەمیشە هەستە ئاینیەکان لەلایەن ناوەندە کۆمەڵایەتیەکانەوە چوارچێوەیان بۆ کێشرابێت و کاتی ئەوە هاتووە ئێمە قسە لە گریمانەی ئاین وەك فۆرمێکی وشیاری بکەین."[17]

یۆتۆپیای مارکسیست لە ڕێگای "ئیدیعاکردنی" زانستیبوونیەوە خۆی جیادەکاتەوە لە یۆتۆپیاکانی دیکە. یۆتۆپیای مارکسیست لە نێو ئەم چوارچێوە تیۆریەدا دەناسرێتەوە:

–ڕژێمی سەرمایەداری پڕە لە لێکدژی – کۆنترادیکسیۆن.

–لە قۆناغێکی مێژوویدا ئەم لێکدژیانە دەتەقێنەوەو شۆڕش لەدایکدەبێت.

–چرکەی شۆڕشیش چرکەی سەرکەوتنی کۆتایی کۆمۆنیسم و دامەزراندنی کۆمەڵگەی بێ چینە.

ئەم یتۆپیایە بە بزوتنەوەی کرێکاری دەگووت: سەرکەوتنی تۆ لە قوڵایی سیستەمی سەرمایەداریدا تۆمارکراوە، لێکدژیەکانی سیستەمی سەرمایەداری حەتمیەتی بردنەوەی ململانێی تۆیە. لێرەوە یۆتۆپیای مارکسیست خۆی دەکرد بە تاقانە خەونی بزووتنەوەی کرێکاری. بەم شێوەیە مارکسیسم وەك ئایدۆلۆژیا لەسەر دوو ئاست خۆی دەردەخات: ئاستی یۆتۆپیا و ئاستی زانست.

لە دوا وشەماندا لەسەر مارکسیسم دەکرێت بڵێین: مارکس لە سەرەتاوە ئاینی وەك "ئەفیونی گەل" پێناسە کرد. چەند جێگای تێبینیە کاتێك، پاش خۆی هەست بەوە دەکەین کە، ئەم ئایدۆلۆژیایە کە بەردەوام "فەزحی" ئاینی دەکرد، خۆی وەردەگێڕێتە سەر جۆرێکی تایبەت لە ئاین و هەڵدەسێت بەبینینی ڕۆڵی "ئەمر بە مەعروف و نەهی لە مونکەر".

### فەرهەنگی کۆنسێپتەکان

1) دێتێرمینیسم

بە فەرەنسی: *Determinisme*

بە ئینگلیزی: *Determinism*

بە ئەڵمانی: *Determinismus*

بە ئیسپانی: *Determinismo*

بە ئیتالی: *Determinismo*

بە شێوەیەکی گشتی دێتێرمینیسم بریتیە لە چوارچێوەیەکی فراوانی تێگەیشتن لە واقیع. لەم چوارچێوەیەدا کۆمەڵێك یاسا هەن کە ئاراستەی ڕووداوو دیاردە و پەیوەندیەکان دیاری دەکەن و بەشێوەیەکی ماتماتیکی ڕەفتارو گووتاری مرۆڤەکان لەقاڵب دەدەن و کاتێك ئێمە لەو یاسایانە تێدەگەین ئیتر دەتوانین ئەو شتانە ببینین کە لە ئێستاداو داهاتووشدا ڕوودەدەن.

ئەم چەمکە بە درێژایی چاخە کلاسیکیەکان ئامادەبووە، بەڵام لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە زۆر بە تۆختر سەر ئاو دەکەوێت. یەکەمین چیرۆکی ئەم چەمکە ڕاستەوخۆ لکاوە بە مێژووی میتۆدی ئەزموونگەرای و ڕێژەگەرایی ماتماتیکەوە.

بەشێکی زۆر لە زانستە کۆمەڵایەتیەکان ئەم چەمکەیان لەو گەردوونەوە وەرگرتووە و پراکتیکیان کردووە بەسەر جیهانی کۆمەڵایەتیدا. دێتێرمینیسم، هەر لە مارکسەوە تا دەگاتە دۆرکایم و پاشان پیەر بۆردیۆ، وەك چەمکی سەنترالْ بەکارهاتووە. ئەم سێ گەورە سۆسیۆلۆگە پێیانوایە کە هەر فاکتێکی کۆمەڵایەتی لەلایەن چەند یاسایەکەوە دەبرێت بەڕێوە، لێرەوە بۆ پەیبردن بە فاکتێکی کۆمەڵایەتی، ئێمە دەبێت بەدوای یاساکانیدا بگەڕێین. بێگومان ئەو یاسایانەش لە نێو مێژوویەکی کۆمەڵایەتیدا دروستبوون و دەقیان گرتووە و بوون بە چوارچێوەی گشتی فاکتی کۆمەڵایەتی. لە تێگەشتندا، تاك و گرووپ و چینە کۆمەڵایەتیەکان هەموویان لە دێتێرمینیسمدا دەژین، واتە هەموویان "مەحکومن" بەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیانەی کە لە نێو مێژووە کۆمەڵایەتیەکانداو بە پێی چەند یاسایەکی کۆمەڵایەتی دەقیان گرتووەو هەمیشە لێرەن بۆ ئەوەی هەموو شتەکانمان پێبڵێن. لەم بیرکردنەوەیەدا، چۆنیەتی نانخواردن و بەرگپۆشین و نمرەی تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵ و چۆنیەتی قسەکردن و مەکانەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی تاکەکان و چۆنیەتی خێزان دروستکردن و پەروەردەکردنی منالْ و رۆشتن بۆ سینەما و مزگەوت و چۆنیەتی بانگکردنی منالْەکانت و هتد، "مەحکومن" بەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیانەی کە ئامارژەمان پێدا. بۆ نموونە: کاتێك سیاسیەکی گەورەی کورد دەبینیت لە کاتی پێشوازیکردن لە سەرۆکی دەوڵەتێکدا تەسبیحێکی بە دەستەوەیەو دانەکانی دەژمێرێت. ئەم پراکتیکە فاکتێکی کۆمەڵایەتیەو بۆ تێگەیشتن لێی دەبێت بگەرێینەوە سەر کۆی ئەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیانەی کە لە مێژوویەکی کۆمەڵایەتی ئەو سیاسیەدا دروستبوون و ئێستا چۆنیەتی بەدەستەوەگرتنی ئەم تەسبیحە دیاریدەکەن.

دێتێرمینیسم چەمکێکە تەواو بە پێچەوانەی چەمکی ئازادیەوە کار دەکات و پێیوایە مرۆڤەکان کۆمەڵێك بوونەوەری ئازادنین و بە ئازادی بڕیارەکانیان هەڵنابژێرن و کاتێك ئەم سیاسیە کوردەی کە تەسبیح بە دەستەوە دەگرێت و دانەکانی دەژمێرێت، لەبەرئەوەیە کە مەحکومە بەو پراکتیکەو ناتوانێت بە ئاسانی لە ژێر زەبری ئەو ستراکتۆرە کۆمەڵایەتیە مێژووییە بێتە دەرەوە کە ناچاری دەکات تەسبیح بە دەستەوە بگرێت.

بێگومان ئالان تۆرین و لوك بۆلتانسکی و رایمۆن ئارۆن و ئەلفرێد شووتز و ئیڤرین گۆفمان و هارلۆد گارفیکێل و ئەنسالم شتراوس تەواو بە پێچەوانەی "دێتێرمینیسم"ەوە بیردەکەنەوەو هەریەکەو لە کارگە سۆسیۆلۆژیەکەی خۆیەوە هەوڵدەدات بۆ سەلماندنی ناواقیعیەتی ئەرگیومێنتەکانی مارکس و دوکایم و بۆردیۆ.

**2) فاکتی کۆمەڵایەتی:**

بە فەرەنسی: *Fait social*
بە ئینگلیزی: *Social fact*
بە ئەڵمانی: *Tatsache*
بە ئیسپانی: *Facto*
بە ئیتاڵی: *Fatto*

ڕەگوڕیشەی ئەم کۆنسێپتە دەگەڕێتەوە سەر زمانی لاتینی کۆن، (1160) ساڵ لەمەوبەر بەشی (*factum*) فاکتیوم دەستی پێکردەوە بە مانای (*action humaine*) و ( *action remarquable*) هاتووە.

(تێبینی: بۆ بە کوردیکردنی وشەی "فاکت" لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تایبەتم کە لە بواری سۆسیۆلۆژیادا دەخوێنن، لێرە لە فەرەنسا و ئەڵمانیا و بەریتانیادا قسەمکردووەو کاتێکی زۆرمان بە پشکنینی هەموو ئەو وشە کوردیانەدا بەسەر بردووە کە دەکرێت لە بری فاکت بەکاری بێنین. بەلاَم هیچ یەکێك لەو وشانە توانای گەیاندنی ماناکانی فاکتیان نیە و تەنانەت زۆربەی زمانە ئەورووپیەکانیش ئەسڵە لاتینیەکەیان وەرگرتووەو بە گۆڕانی بچووکەوە دایانڕشتوەتەوە. وەك لەسەرەوە دەبیینین. دەوترێت لە کوردوستاندا بە حەقیقەتی کۆمەڵایەتی تەرجەمەکراوە، ئەمە هەڵەیەکەی گەورەیەو بە هیچ شێوەیەك ئەو مانایە نادات بە دەستەوە. بۆیە ئێمە پێمان باشتربوو وشە ئینگلیزیەکە وەك خۆی بنوسینەوەو لە ڕێگای ئەم ڕونکردنەوەیەی خوارەوە خوێنەری کورد تێبگەیەنین لە ماناکانی فاکتی کۆمەڵایەتی کە لکاوە بە مێژووی سۆسیۆلۆژیاوە).

فاکتی کۆمەڵایەتی لەسەرەتاوە وەك شتێکی "بابەتی" خراوەتە نێو گەردوونی سۆسیۆلۆژیاوەو وەك بەرهەمی دامەزراندنی پەیوەندی نێوان دوو تاك یان چەند تاکێك یاخود چەند گروپێکی کۆمەڵایەتی خراوەتە سەر شانۆ. واتە لە ڕەهەندە سایکۆلۆژی و بیۆلۆژیەکان دور خراوەتەوە.

لێرەوە فاکتی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆ دەلکێت بە جیهانی "بابەتیبوون"ەوە. ئێمە کاتێك بە شتێك دەڵێین "کردەی کۆمەڵایەتی" کە بووبێت بە واقیعێکی بەرجەستەکراو نەك خەیاڵکراو یان وەهمی. بۆ نموونە ناتوانین بڵێین: کوردستان دابەشنەکراوە بەسەر ئێران و عێراق و سوریا و تورکیادا، ئەمە واقیعە نەك وەهم.

لە زانستە فیزیکیەکاندا، وشەی "فاکت" مانایەکی وردی هەیە و پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە چالاکی ئەزموونگەراییەوە هەیە کە لەسەر بابەتگەرایی خۆی بینادەکات. لەم جیهانەدا "فاکت" تێبینی دەکرێت و پاشان دەبێت بە دەرهاویشتە "داتا".

کۆنسێپتی "فاکتی کۆمەڵایەتی" ڕاستەوخۆ لکاوە بە ئیمیل دورکایمەوە. بەپێی ئەو فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە بابەتی سەنتراڵی سۆسیۆلۆژیا. لە کتێبی "*Reglees de la methode sociologique*"دا بەشێکی گرنگی تایبەتکردووە بە دیاریکردنی چوارچێوە کۆنسێپتویلەکانی فاکتی کۆمەڵایەتی، ئەو بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:

"فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە هەموو ئەو شتە کۆمەڵایەتیە دەرەکیانەی کە کارایی دادەنێن بەسەر تاکەوەو ئاڕاستەکانی ڕەفتار و گووتاری بۆ دیاری دەکەن و لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا وەك گشتێك خۆیان دەسەپێنن بەسەر تاکەکانداو لە هەمانکاتدا سەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن. سەربەخۆ لە هەموو دەرکەوتنە تاکیەکان".

لەم چوارچێوە فیکریەدا، بۆ نموونە پارتی دیموکراتی کوردوستان، تیرۆریسم، خودکوژی، حکومەتی هەرێم، پەیوەندی نێو دەوڵەتی، دەزگاکان فاکتی کۆمەڵایەتین.

ڕاستە دورکایم وەك سەرچاوەی دامەزرێنەری ئەم کۆنسێپتە دادەنرێت، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هەر لە مارسێل موسەوە تا دەگاتە لوك بۆلتانسکی و ئالان تورێن و بێرگەر و لوکمان و گارفینکێل و گۆفمان و ئەنسالم شتراوس تێگەشتنەکانی دورکایمیان خستوەتە ژێر پرسیارەوە:

ئایا فاکتی کۆمەڵایەتی بریتیە لە دیاردە کۆلێکتیڤەکان یان کۆی کردەکانی تاکێکە؟

ئایا دەکرێت لە گەردوونی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکاندا باس لە بابەتیبوون بکەین؟ ئایا بابەتیبوون تایبەت نییە بە گەردوونی زانستە فیزیکییەکانەوە؟

ئایا وەك چۆن فۆرمە بابەتیەکان، چوارچێوەکانی ڕەفتار و گوتاری تاك دیاری دەکەن، ئاواش تاکەکان چوارچێوەی فۆرمە بابەتیەکان دیاری ناکەن؟

تا چ سنورێك دەتوانین باس لە دێتێرمینیسم بکەین؟ تا کوێ کردەی کۆمەڵایەتی خاوەنی "دێتێرمینسم"ە لە بەرامبەر تاکەکاندا؟

دورکایم لەو کتێبە بەناوبانگەیدا دەڵێت: "دەبێت سۆسیۆلۆگ فاکتی کۆمەڵایەتی وەك شت تەماشا بکات و کاری لەسەر بکات". واتە وەك چۆن کۆمەڵێك یاسا تەلەفزیۆنێك، ڕادیۆیەك، پەرداخێك، مێزێك بەڕێوە دەبەن، ئاواش کۆمەڵێك یاسا کردەیەکی کۆمەڵایەتی بەڕێوە دەبات. پەنجا ساڵ دواتر سووپایەك سۆسیۆلۆگ لە دورکایم ڕاستدەبنەوە و پێیدەڵێن: فاکتە کۆمەڵایەتیەکان شتن نین، بەڵکو بیناکردنێکی کۆمەڵایەتی بەردەوامن.

3) **بیناگەرایی:**

به فەرەنسی: *constructivisme*

به ئینگلیزی: *constructionism*

به ئەڵمانی: *konstruktivismus*

به ئیسپانی: *constructivismo*

به ئیتالی: *constructtivismo*

بیناگەرایی کە دەبێت لەگەڵ بونیەویەت (ستراکتۆریالیسم)دا تێکەڵنەکرێت، بریتیە لە تیۆرێکی سۆسیۆلۆژی کە واقیعی کۆمەڵایەتی وەك پرۆسەیەك لە چەرکەی بیناکردنێکی بەردەوامدا دەبینێت. لێرەوە مۆدێلی ڕاڤەکردنی تایبەت بەم "موقارەبەیە" پێشنیار دەکات.

بیناگەرایی (کۆنستریۆکتیڤیسم) لە دەرەوەی دابەشکردنی جیهانی کۆمەڵایەتی بەسەر ئانفرا-ستراکتۆر و سوپەر - ستراکتۆردا کاردەکات. لە سۆسیۆلۆژیای مارکسیستدا ڕەهەندی ئابووری وەك ئانفرا-ستراکتۆر تەماشا دەکرێت و وەك ماشێنی بەرهەمهێنەری هەموو سووپەر - ستراکتۆرەکانی دیکە (ئاین، ئایدۆلۆژیا، ڕۆشنبیری، خێزان، هتد) دەخرێتە سەر شانۆ.

هەروەها لە دەرەوەی ئۆپۆزیسیۆنی نێوان تاك و کۆمەڵدا کاردەکات و بازدەدات بەسەر چەمکەکانی دۆرکایمدا کە پێی وابوو، بە تەنها "کۆ" بابەتی سۆسیۆلۆژیایەو تاك لەنێو "دێتێرمینیسم"ی ڕەهای کۆمەڵگەدا

چوارچێوەکانی بوونی دیاری دەکرێت.

نــۆربێر ئێلیــاس یەکێکــە لــە سەرچــاوە گرنگەکانی ئەم قوتابخانەیەو لەبری کلیك کردن لەســەر ئۆپۆزیســیۆنی نێــوان "دووانــە" دژ بەیەکــەکان، هەوڵــدەدات کــار لەســەر پێکهاتــە کۆمەڵایــەتی و بیناکردنــەوەیان بکــات. ئێلیــاس گرنگی دەدات بەو هەلومەرجانەی وا لە تاکێك دەکەن کە "ئیلتیزم"ی خۆی ڕاگەیەنێت و دەبن بــە چوارچــێوەی ڕەفتــار و گوتارەکــانی. واتــە ئەوەی جێگای باسە لای ئێلیاس ستراکتۆرەکان نین، بەڵکو ئەو شتەی کە لە زمانی فەرەنسیدا بە "پرۆسێسیوس" ناودەبرێت و بریتیە لە کۆی ئەو جوڵانەوەو بیرکردنەوەو کردەو کارکردن و ڕەوتەی کە "ئەکشن"ێکی تیادا دروستدەبێت.

بێرگـــەر و لویکمـــان لـــە تێکســـتە بەناوبانگەکەیانــدا "بینــاکردنی کۆمەڵایــەتی واقیع" بنەما گشتیەکانی بیناگەریان داڕشت و ڕوناکیــان خســتە ســەر "کۆمەڵایــەتی" وەك "بینــاکردنێکی" بــەردەوام. ئــەوان بــە درێــژی لەســـەر ڕۆڵـــی وشـــیاری لـــە بینـــاکردنی کۆمەڵایەتیدا وەستان. بێرگەر ساڵی 1967 و لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "ئاین لە نێو وشیاری مۆدێرندا" ئەم چوارچێوە کۆنسێپتیولەیەی بۆ خستینە سەر شانۆ. لەم کتێبەدا ئەو بە وردی بــاس لــە ڕۆڵــی ئیمانــدارەکان دەکــات لــە دەستنیشانکردنی چوارچێوەکانی واقیعدا. لەم "موقارەبەیــەدا" ســەرلە نــوێ فینۆمینۆلۆژیــای هیوسێرل خراوەتەوە بەر باس و لێکۆڵینەوەو شـــتێکی دیکـــەی لێدروســـتکراوە بـــەناوی فینۆمینۆلۆژیای کۆمەڵایەتی.

هەروەهـــا کارەکانی پیـــەر بۆردیۆش، بەتایبەتی چەمکی "هابیتیوس" هەوڵدانیکە بۆ دەرچوون لە تەڵەزگەی دیوالیسم. لە سیستەمی ئامادەباشیدا، واتە "هابیتیوس"، پراکتیکەکان نە سەد لەسەد ملکەچی ستراکتۆرەکان، نە سەد لــە ســەدیش ســەربەخۆن لــە ســتراکتۆرەکان. هەرچەند ئێمە پێمانوایە سۆسیۆلۆژیای پیەر بۆردیۆ زیاتر لە دێتێرمینیسمەوە نزیکترە تا بیناگـــەری. فەردانیـــەتی میتۆدۆلـــۆژی کـــە قوتابخانەیەکی بەناوبانگی سۆسیۆلۆژیایە، وەك کاردانەوەیـــەك لـــە بەرامبـــەر هۆلیســـم و دێتێرمینیسمدا، کلیکەکات لەسەر بیناکردنی دیــاردە کۆمەڵایەتیــەکان لــە ڕێگــای ڕەفتــار و گوتــاری تاکەکانــەوە. واتــە لــەم قوتابخانەیــەدا ئــەوەی ڕەفتــار و گووتــاری تاکــەکان بینادەکــات ســـتراکتۆرە کۆمەڵایەتیـــەکان نـــین، بـــەڵکو پێچــەوانەکەیەتی. لــە کاتێکــدا سۆســیۆلۆژیای ستراکتۆریالیســت و دێتێرمینیســت و هۆلیســت دەیـــەوێت چوارچـــێوەی کۆمەڵایـــەتی وەك دەرهاویشـــتەو وەك مـــۆدێلی چـــەندایەتی بناســـێنێت، سۆســـیۆلۆژیای بیناگـــەری بـــە پێچــەوانەوە دێــت و هەوڵــدەدات کلیــك بکــات لەسەر مەلەفی ئەو پرۆسانەی کە لە ڕێگایانەوە دیـــــاردە کۆمەڵایـــــەتی و کاتیگۆریـــــە کۆمەڵایەتیـــەکان بینـــادەکرێن. باشـــترین نموونــەش توویژینــەوەکانی پرۆفێســۆر لــوك بۆلتانســـکیە کـــە ئێســـتا یەکێکـــە لـــە "مەرجەعــەکانی"فیکــری فەرەنســی. بەتایبــەتی کتــێبی "چوارچــێوەکان" کــە ســاڵی 1982 بلاوبووەتەوە. بۆلتانسکی ئێستا پرۆفێسۆرە لە "قوتابخانــەی بــالا"و هــەموو ڕۆژێکــی هــەینی سیمینارێك دەبات بەڕێوە.

4) کردە

بە فەرەنسی: *Action*

بە ئینگلیزی: *Action*

بە ئەڵمانی: *Aktion*

بە ئیسپانی: *Accion*

بە ئیتالی: *Azione*

ئەم چەمکە جێگەیەکی تایبەتی هەیە لە نێو شەریکەی کارکردنی مارکس و دۆرکایم و بۆردیۆدا و وەك کلیلی فیکری ئەوان تەماشا دەکرێت. ئەوان پێیانوایە کە پراکتیکی رۆژانەمان پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە کردەوە، کردەش هەڵقولاوی زنجیرەیەك کۆنسێپتی وەك هابیتیوس و بوونیە و کێڵگە و سەرمایەیە.

بۆردیۆ دەڵێت "کردەکانمان زۆرجار لە نێو مانای پراکتیکدا خۆیان دەبیننەوە و کەمتر دەڕۆنە نێو چوارچێوەیەکی عەقلانیەوە". لە زۆربەی حاڵەتەکاندا کردەی بکەرە کۆمەلایەتیەکان گوزارشت نین لە ئینعیکاسییەتی ئامادەباشی *Reflexive de disposition*، لە ئینعکاسییەتی هابیتیوسێك کە لە نێو کێڵگەی پراکتیکدا بەدەست هاتووە. بوردیۆ دەیەوێت بڵێت کە کردە، وەك مەیدانی توێژینەوەی سۆسیۆلۆگ، نە کاردانەوەی رووتوقوتە نە عەقلانیەتی رووتوقوت.

لە رێگای بوونیەکانی پەیوەندیەوە *cognitive structure* هابیتیوس دێت و پێمان دەڵێت ئێمە دەتوانین چی بکەین و چی نەکەین، واتە هابیتیوس سەرلەبەری ژیانی ئێمە داگیردەکات و لە هەموو چرکەیەکدا ئاراستەی رەفتارەکانی ئێمە دیاریدەکات.

بوردیو پێیوایە کە بکەرەکان بەبێ ئامانج ناجوڵێنەوە، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو بکەرانە کائینی عەقلانین و بۆ هەر کردەیەك پێوانەکانیان ئامادەدەکەن و بست بە بست رەفتارەکانیان دەپێون و هەنگاوەکانیان دەژمێرن. ئەو پێیوایە کە سەرچاوەی کردەکانی بکەرە کۆمەلایەتیەکان لە هەرێمی دیکەدان نەك لە نێو عەقڵی ژماردندا، ئەو هەرێمەش بریتیە لەو پانتاییەی کە دەبێتە مەیدانی ململانێی نێوان سیستەمی ئامادەباشی بەدەستهێنراوی بکەرەکان لەلایەك و ناوەندە کۆمەلایەتیەکان لەلایەکی دیکەوە. واتە هابیتیوس.

ئەم تیوریەی بۆردیۆ تەواو دژە بە (تیوری کردەی عەقلانی) کە پێیوایە کردە لەسەر خواست و هۆشیاری ئەکتەری کۆمەلایەتی دادەمەزرێت و ئەکتەر بەوپەری وشیارییەوە کردەکانی بەرهەم دێنێت و هەموو کردەیەکی ئامانجێکی لە پشتەوەیە و هەموو هەنگاوێکی بەمەتر دەپێوێت و دەزانێت لە کوێوە دەستپێدەکات و لە کوێدا کۆتایی پێدێنێت. بۆردیۆ بە توندی دژی ئەم تیوریە دەبێتەوە و پێیوایە کردەی کۆمەلایەتی بکەرێك پێچراوە لە هەموو مێژووی ئەو بکەرە. وە کردەی کۆمەلایەتی بەپێی بەرژەوەندیەکانی ئێرە و ئێستا بەرهەم نایەت. راستە بکەر لە ئێرە و ئێستایەکدا دەجوڵێت و کردە بەرهەمدێنێت، بەلام ئەو پرۆسەی بەرهەمهێنانە مەحکومە بە مێژووی ئەو تاك و گروپە و ئەو مێژووە بۆ یەك چرکەش لێیان غافڵ نابێت. واتە راستە من لە ئێرەو ئێستادا کار دەکەم، بەلام من مێژوویەکیش بەدوامەوەیە کە کارکردنی من لە

ئێره و ئێستادا دیاری دەکات. تەواو بە پێچەوانەی ئەنتەرئەکسیۆنیستەکانی وەك گۆفمان و ئیتنۆمیتۆدۆلۆگەکانی وەك گارفینکەلەوە، کە پێیان وایە ئەکتەری کۆمەڵایەتی منداڵی ئێستا و ئێرەیەتی و ئازادە لەو مێژووەی کە ناتوانێت خواستەکانی هەنووکە پێوەند بکات.

5) **هاوڵاتیبوون**

به فەرەنسی: *citoyennete*

به ئینگلیزی: *citizenenship*

به ئەڵمانی: *staatsburgerschaft*

به ئیسپانی: *ciudadania*

به ئیتالی: *cadinanza*

دیموکراسی لەسەر بنەمای هەستی بەرپرسیارەتی هاوڵاتیان لە وڵاتێکدا دادەمەزرێت. ئەگەر هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە هەستیان بە بەرپرسیارەتی نەکرد لە بەرامبەر حکومەتەکەیاندا و پێیانوابوو کە ئەو حکومەتە نوێنەرایەتی ئەوان ناکات یان ئەو وڵاتە نیشتمانی ئەوان نیە و بەشێوەیەکی کارتۆنی دروستکراوە، لە هەلومەرجێکی ئاوادا قسەکردن لە دیمۆکراسی زۆر زەحمەتە، چونکە نە کۆنسێپتی نوێنەرایەتی کردن مانای دەبێت و نە ئازادی هەڵبژاردنی حوکمکارەکان لەلایەن حوکمکراوەکانەوە دەستەبەر دەبێت.

هاوڵاتیبوون تێرمێکی سیاسیە و ماوەیەکی پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی وەك کۆنسێپت دەردەکەوێت بۆئەوەی هەموو مافە یاساییەکان بە سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگە بدات و هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە وەك یەك تەماشابکرێت لەلایەن یاساوە. ئەمە رەگووریشەی ئەم کۆنسێپتەیە. بەڵام بێگومان بە درێژایی مێژوو گۆڕانکاریەکان ئەم کۆنسێپتەش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو ئاسۆی ماناکانی فراوانتر بوون.

سەرەتا سۆسیۆلۆگە کلاسیکەکانی وەك دۆرکایم و ڤێبەر و پارسۆنس بۆ توێژینەوە لەسەر ئەو کۆمەڵگە مۆدێرنانەی کە لەسەر پرانسیپی تاکگەرایی دروستبوون بەردەوام پەنایان بۆ کۆنسێپتی هاوڵاتیبوون بردووە، چونکە لە نێوجەرگەی تاکگەرایی کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا هاوڵاتیبوون دێت بۆئەوەی هاریکاری ئۆرگانیك "*la solidarite organique*" لە نێوان ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایانەدا دروستبکات.

تۆماس مارشال، گەورە سۆسیۆلۆگی بەریتانیا، سێ ئاستی هاوڵاتیبوون دەستنیشان دەکات: یەکەم: ئاستی مەدەنی. ئەم ئاستە لە سەدەی هەژدەوە دەستپێدەکات. وە لەم قۆناغەدا ئیتر مرۆڤ وەك تاك ماف ئەوەی هەیە بە ئازادی بیربکاتەوە و بە ئازادی قسە بکات و بە ئازادی ئیمانبێنێت و کافربێت. دووەم: ئاستی سیاسی. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ئیتر هاوڵاتیبوون کلیکدەکات لەسەر ماف دەنگدان و هاوبەشیکردنی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە ژیانی سیاسیدا. ئەمەش بێگومان لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی نەتەوەیدا "*Etat-Nation*". سێیەم: ئاستی کۆمەڵایەتی. نووسەر پێی وایە کە ئەم ئاستە تەنها لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەوە دەستپێدەکات. لێرەدا هاوڵاتیبوون کلیکدەکات لەسەر کێشە و

خزمەتگوزاریە کۆمەڵآیەتیەکان و پەروەردەو سۆسیال دەخاتە سەر لیستی ئەولەویاتەکانی.

6) **تۆتالیتاریسم**

به فەرەنسی: *Totalitarisme*

به ئینگلیزی: *Totalitarianism*

به ئەڵمانی: *Totalitarismus*

به ئیسپانی: *Totalitarismo*

به ئیتالی: *Totalitarismo*

فەرهەنگی سۆسیۆلۆژی فەرەنسی بۆ پێناسەکردنی ئەم کۆنسێپتە دەگەڕێتەوە سەر "*zbigniew brzezinski*" نووسەری بەناوبانگی کتێبی "*Ideology and politics in soviet*". ئەو بەم شێوەیە لە تۆتالیتاریزم دەدوێت: "فۆرمێکی نوێی حکومەت کە دەکرێت لە نێو پۆلێنکردنی گشتی دیکتاتۆریەتدا بیبینینەوە(...)، تۆتالیتاریزم ئەو سیستەمەیە کە لە ناوەوەیدا حاکمەکان تەواوی میکانیزمە تەکنۆلۆژیە هەرەپێشکەوتوەکان بەکاردێنن بۆ ئەنجامدانی شۆڕشێکی کۆمەڵآیەتی کە توانای ئەوەی هەبێت دەستکاری هەموو شتەکان بکات. ئەم سیستەمە مرۆڤەکان لەسەر چەند بنەمایەکی ئایدۆلۆژی دەبینێت و بەپێی دووریو نزیکیان لەو ئایدۆلۆژیایەوە هەڵیاندەسەنگێنێت و بەرزیاندەکاتەوە و دایاندەبەزێنێت".

ئەم تێرمە یەکەمجار لەلایەن مۆسۆلۆنیەوە ساڵی 1920 بە مانایەکی پۆزەتیڤانە بەکارهاتوە "*stato totalitario*". مانا سەرەتاییەکانی ئەم فیکرەیە رووبەرووبونەوەیەکی راستەوخۆ بوون لەگەڵ ژیانی تایبەتی تاکگەراییدا. واتە راکێشانی دەوڵەت بۆ نێو هەموو پانتاییەکان. بە درێژایی ساڵانی جەنگی سارد ئەم کۆنسێپتە ئاسۆکانی بەرفراوانتر دەبێت و دەبێت بەچەکی جەنگی نێوان دەوڵەتەکان.

لەگەڵ هانا ئارێنتیشدا تۆتالیتاریزم وەك چەمك رادەکێشرێتە نێو سۆسیۆلۆژیای سیاسیەوە. بەڵآم گرفتی هانا ئەوەیە کە دەیەوێت جەوهەرێك بەم کۆنسێپتە ببەخشێت، یاخود جەوهەرگەراییانە مامەڵەی لەگەڵدا بکات. لێرەوە وەسفەکانی ئەو بۆ تۆتالیتاریزم لە ئەمڕۆدا رووبەڕووی رەخنەی جددی بوونەتەوە.

ئێمە بۆ دەستنیشانکردن و ناسینەوەی رژێمی تۆتالیتاریزم دەگەڕێینەوە سەر رایمۆند ئەرۆن کە یەکێکە لە پایەکانی زانستە کۆمەڵآیەتیەکانی فەرەنسا. ئەو لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا لەسەر "دیموکراسی و تۆتالیتاریزم" پێنج رەگەزی سەرەکی ئەم رژێمە دیاری دەکات کە ئەمانەی خوارەوەن:

1- یەك حیزب مۆنۆپۆلی چالاکی سیاسی دەکات.

2- ئەو حیزبەش لەسەر ئایدۆلۆژیایەك دروستبووە و ئەو ئایدۆلۆژیایەش دەبێت بە حەقیقەتی رەسمی دەوڵەت.

3- ئەو حیزب و ئایدۆلۆژیایەش بە تەنها مۆنۆپۆلی زەبر و زەنگ و قەناعەتپێکردن دەکەن.

4- دەوڵەت دەستدەگرێت بەسەر بەشێکی زۆری چالاکیە ئابوری و پیشەییەکانداو ئەو چالاکیانە ئیتر ملکەچی حەقیقەتی رەسمی دەوڵەتن.

5- لێـرەوە هـەر هەڵەیـەکی ئـابوری یـان پیشـەیی دەبێـت بـە هەڵەیـەکی ئایـدۆلۆژی و خاوەنەکەی لەسەر سزا دەدرێت.

7) **هابیتیوس**

بە فەرەنسی: *Habitus*

بە ئینگلیزی: *Habitus*

بە ئەڵمانی: *Habitus*

بە ئیسپانی: *Habito*

بە ئیتالی: *Habittudine*

پیەر بۆردیۆ، کە دەکرێت وەك درێژە پێداری سۆسیۆلۆژیای مارکس و دۆرکایم بخرێتە سەر شانۆ، هابیتیوس وەك هابیتیوس سیستەمێك لە ئامادەباشی پێناسە دەکات. ئەم سیستەمی ئامادەباشیەش لە هەموو چرکەیەکدا ئامادەیە بـۆ پێشـوازیکردن لـە ئەزموونـەکان. کـە ئـەزموونێك دێتـە پێشـەوە، لـە قۆناغی یەکەمدا پەلیـدەگرێت و رایدەکێشـێتە ژورەوە، بوردیـۆ ئەمـە نـاو دەنێـت، ناوانـدن، واتـە راکێشـانە نـاوەوە، هێنانـە ژورەوە، لـە دەرەوە بـۆ نـاوەوە. لـەم قۆناغـەدا، هـابیتیوس لـە نـاوەوە تـەواو دەسـتکاری ئـەو ئەزموونـە دەکـات و سـەلەنوێ دایدەرێژێتـەوەو رەنگیدەکاتـەوەو جلوبـەرگی لەبەردەکاتـەوەو ئامـادەی دەکـات بـۆ قۆنـاغی دووەم کـە بریتیـە لـە فرێدانـەوەی بـۆ دەرەوە، بـەدەرەوەکردنی، دەرەوانـدی. کاتێـك ئـەم ئەزموونـە دێتـە دەرەوە و دەیخەینـە ژێـر چـاودێریەوەو هەسـت بـەوە دەکـەین کـە زۆر جیـاوازە لـەو چـرکەیەی کـە هێشـتا پلەکێشـی ناوەوە نەکراوە.

واتە ئەزموونـەکە لەلایەن هابیتیـوسـەوە مـاڵی و دەسـتەمۆکراوە. تـا ئـەو کاتـەی کـە هـابیتیوس دەتوانێـت ئەزموونـەکان ماڵیبکـات هیچ گرفتێك دروست نابێت، بەلاّم گرفت کاتێك دروسـتدەبێت کـە هـابیتیوس نـەتوانێت ئەزموونێك ماڵیبکات. لە چرکەیەکی ئاواداو لە یەکەم چرکەی بەریەککەوتنیاندا ئیتر هابیتیوس وەك لاپەرە دەدرێت. کە هابیتیوسیش درا ئیتر سیسـتەمی ئامادەباشـیش پـەکی دەکـەوێت و توانـای ناوانـدن و دەرەوانـدی ئەزموونـەکانی نامێنێت. لە هەمانکاتدا ئەزموونەکان لە هاتن ناوەستن، بەلاّم ئیتر سیستەمێکی ئامادەباشی لێرە نیە بۆئەوەی پێشوازیان لێبکات!دەرەنجام بکـەری - فـاعیلی کۆمەلاّیـەتی تووشـی نـامۆبوون و سـەرگەردانی و جۆرێـك لـە سەرلێشێوان دەبێت و ژیانی هەموو رۆژێکی بەتەواوی لیّ تێکدەچێت.

**کۆنسێپتەکانی بەشی داهاتوو:**

سـتراکتۆر، چـین، ئایـدۆلۆژیا، ململانـیّ. ئانفرا-ستراکتۆر، ژێرخان. سوپەر - ستراکتۆر. سـەرخان، دۆزینـەوە (دێڤـوالیّ)، نوێنەرایـەتیکردن (غۆیخێزانتاسـیۆن). ئەنتەراکسـیۆن. میدیاسـیۆن، هەیمەنـە، یاخیبوون (پرۆتیستاسیۆن)، یوتۆپیا، هتد.

**بیبلۆگرافیّ**

**کتێبەکانی مارکس و ئینگلس**

*Karl marx, Friedrich Engels, Sur la religion, texts choisis, traduis et annotes par G. Badia, P.*

*Bange et E. Bottigelli, Paris Editions Sociales, 1968.*

*Karl Marx, A propos de la question juive, edition bilingue avec une introduction de Francois Chatelet, traduction de Mariannea Simon, Paris, Aubier Montaigne, 1971.*

*Karl Marx, (Euvre, Paris, Gallimard, Bibliotheque de “la pleiade”: t.I: Economie 1, 1963:t. III: philosophie; t, IV: politique 1, 1994.*

### کتێب لەسەر مارکس و ئینگلس

*Ernst Bloch,Thomas Munzer, theologien de la revolution, Paris, “10/18”, 1964 (1921.(*

*Michele Bertrand, le statut de la religion chez Marx et Engels, Paris, Edition sociales, 1979.*

*Jean – Yves Calvez, La pensee de Karl Marx, Paris Seil, 1956 (7e ed. Revue et corrigee.(*

*Henri Desroche, Marxisme et religion, Paris, PUF, 1962.*

*Henri Desroche, Socialisme et sociologie religieuse, Paris, Ed. Cujas, 1965.*

*Nguyen Ngoc Vu, Ideologie et religion dapres karl Marxs et F. Engels, Pris, Aubier Montaigne, 1975.*

*Charles Wackenheim, La faillite de la religion dapres karl Marx, Paris, PUF, 1963.*

### پەراوێزەکان:

11–ژان پـۆل ولیـەم، "ئۆپۆزیسـیۆنی ئـانفرا–سـتراکتۆر و سـوپەر – سـتراکتۆرەکان: رەخنەیـەک" گۆڤاری جیهانی سۆسیۆلۆژیا، *LXI* ژولای – دیسەمبەر، 1976، لا 309–327.

12–ژان– پـۆل ولیـەم، "ئـاینی سـوپەر – سـتراکتۆرالی سەرچـاوە کولتوریـەکان، تێگەشـتن لـە کێڵگـەی ئـاینیی لـە نێـو کۆمەڵگـە سـەرمایەدارەکانی پۆست – کۆلۆنیال" سۆسیال کۆمپاس، *XXIV*، *1977*، لا 323–338.

13–میشـێل دوسـێرتۆ، نووسـینی مێـژوو، پـاریس، گەیمار، 1975، لا 153.

14–کەلڤینیسم: بریتیە لە مەزهەبی ئەو پیاوەی کە نـاوی کـەلڤین بـوو (1509–1564). ئـەم پیـاوە ئاینیـە دامەزرێنەری پرۆتستانتیسمە لە فەرەنسادا.

15–ئردریـک ئیـنگلس، "ماتریالیسـمی مێـژوویی"، وەرگـیراوە لـە: کـارل مـارکس، فردریـک ئیـنگلس، توێژینـەوەی فەلسـەفی، چـاپخانەی سۆسـیال، پـاریس، 1968، لا 125.

16–ئێرنسـت بلـۆش، تۆمـاس مـۆنزەر: تیۆلـۆگی شـۆرش، چـاپخانەی گـەلیمار، پـاریس، 1975، لا 79–80.

17–میشـێل بێرترانـد، پێگـەی ئـاین لای مـارکس و ئینگلس، پاریس، چاپخانەی سۆسیال، 1979، لا 184.

# دەق لە سیاقدا[1]

د. عبدالكريم سروش
لە ئینگلیزییەوە: د. هادى محمد

1)زانستی سروشت بریتییە لە کۆششی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە سروشت، زانستی ئایینیش بریتیە لە کۆششی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە ئاین. هەموو تێگەیشتنێك لەسەر پێشگریمانەکان *suppositions* پشت دەبەستێت واتە شوێنکەوتەی ئەو پێش گریمانانەیە کە لە زەینی کەسەکەدا بوونی هەیە و ئەم تێگەیشتنەش پێویستی بە چەمکاندن *categorization* هەیە واتە شتێکی لاوەکی یاخود جوزئی دەبێتە بەشێك لە دەربڕین و چەمکە گشتییەکان. تێگەیشتن لە ئاین دەبێتە بەشێك لەمانەو بەدەر نابێت لەمانە. بەلاّم تێگەیشتن لە ئایین پێویستی بە پێش گریمانەو پرنسیپی پێشینەیی تایبەتی هەیە کە مەرجی پێویستن بۆ تێگەیشتن و تەفسیرکردنی ئاین.

ئاشکرایە دیدگای کانتی لەمڕۆدا زیاتر ناسراوەو پێی ئاشناین، بەلاّم سەدەیەك لەمەوپێش نەك تەنها دیدگایەکی گومڕاو لە ئاین دەرچوو بوو لە بارەی ئایینەوە بەڵکو دیدگایەکی گوماناویش بوو لەبارەی زانستە سروشتییەکانەوە. پۆزەتڤیزمی میل و بێکۆن لەسەر ئەو بیرۆکەیە دروست بووە کە ڕاستییە ڕووت و بێگیانەکان *Facts Brute* بوونیان هەبووەو تەنها پێویستییان بە چاوێکی کراوە هەبووە لە ڕێگەی سەرنجدانەوە *observation* وێنەیان بگرێت، واتە کاتێك ڕووبەڕوی ڕاستییە دەرەکییەکان دەبینەوە، بە زەینێکی بەتاڵو بێ هیچ پێش گریمانەیەك ڕووبەڕویان دەبینەوە. بەلاّم ئەو گۆڕان و گەشەسەندنانەی کە لە فەلسەفەی زانستدا ڕوویاندا ناڕاستی ئەو بیرۆکەیان بە ڕوونی نیشاندا و دەریخست کە ئەم ڕاستییە ڕووت و بێگیانانە لە هیچ جێگایەك نەڕەوان جگە لە خاکە بێپیتەکانی ووڕێنەکەرەکان و خەیاڵپلاوەکان. تەنانەت لە توێژینەوەیەکی ئیستقرائی سادەدا کە تێیدا زنجیرەیەکی ڕێکوپێکی ڕووداوە یەك لە دوای

یەکـەکان لـەژێر لێکۆڵینـەوە و پشـکنیندان، کەسێك هەرگیز نە دەتوانێت دڵنیابێت لەبارەی پێڕسـتی تـەواوی هۆکـارە کاریگـەر و پەیوەندیـدارەکان، وە نـە دەتوانێـت دڵنیـا بێـت لـەبارەی ڕووە ڕاسـتەکانی ئـەو ڕووداوانـەی کـە گشتگیر دەکرێن *generalisation*. لە هەموو ئەم بارانەدا، کەسەکە پێویستە پرچەك بێت بە پێش گریمانـە و وێنـاکردنی دیمـەنی توێژینەوەکـە بۆئەوەی بزانێت لە کوێوە دەست پێدەکات و لـە کوێش کۆتایی پێدێنێت، پێویستە چ شتگەلێك ڕەچاو بکـات و بـە چ ئاڕاسـتەیەکدا بـڕوات و چ شـتگەلێکیش ڕەچـاو نـەکات وەك شـتێکی بـێ بایـەخ یـاخود ناپەیوەندیـدارە ئـەم وێناکردنانـە شـتێکی موقـەدەس نـین، دەتوانرێـت ڕەخنـە بکـرێن و بگـۆڕدرێن و پوختـە بکـرێن و یـاخود دەشێت سەرلەنوێ پێناسە بکرێنەوە، بەڵام دوو شـت بـە ڕەهـایی تایبـەتن بەوانـەوە و بەڵگەنەویستن:

یەکـەم: بـوون و ئامـادەیی ڕەهـای ئـەم پێشـگریمانە و وێناکردنانـە لـە بـواری توێژینەوەدا بۆ مەبەستی تێگەیشتن.

دووەم: بـاڵاتربوون و سـەربەخۆیی ئـەم پێشگریمانە و وێناکردنانە لە بەرامبەر جیهانی ئەزموونـدا، واتـە دەکەونـە دەرەوەی خـودی ئەزموونکردنەکەوە.

ئێسـتا لـە هـەمووی گـرنگتر بریتییـە لـە کاریگـەری ئـەم پێشـگریمانە و وێناکردنانـە لەسـەر سـەرجەمی سـیاقی *contex* بەرهـەمی کۆتـایی توێژینەوەکـە. پـێش گریمانـەکان وەکـو کـارای یاریـدەدەری کیمیـایی نـین کـە ڕۆڵ و خزمـەتیان تـەنها ئاسانکردن و خێراکردنـی یـەك کـارلێکی کیمیـایی هێـواش بێـت بـەڵام ئـەم کارایانـە کـار ناکەنـە سـەر دەرەنجـامی کارلێکـە کیمیاییـەکان، پێشـگریمانەکان وەکـو ماناکـانی یـاخود ڕێسـاکانی هاوسـەرگیرین و ئـەو پەیوەندییە دیاری دەکەن کە چ کەسێك لەگەڵ چ کەسـێکی دیکـەدا بچـێتە پەیوەنـدی هاوسـەرگیرییەوە، وە ئـەم کـارەش پەیوەنـدی هەیـە بـە کـۆی پێکهاتـەی ئـەو خێزانـەی کـە لـە ئـەنجامی ئـەم پەیمانـەوە دروسـت دەبێـت (بـە گونجـان لەگـەڵ ئـەو توانـا هەبووانـەی هـەر سەردەمێك) و شێوەی پێدەبەخشێت. جیاوازی سـەرەکی نێـوان فەلسـەفەی پۆزەتیڤسـت *Positivist* و پـاش-پۆزەتیڤسـت *Post-positivist* بریتـییە لـە نیشاندانی ئەو ڕاستییەی (لەلایـەن فەیلەسـوفە پـاش-پۆزەتیڤسـتەکانەوە) کـە "سـەرنجدان" بـە تـەنها ڕۆڵ نابینێـت بـەڵکو پێویسـتی بـە پێشینەسـازی و ڕووپۆشـکردنی تیۆریانـە هەیـە، *Theoryladen*، بـە دەربڕینێکـی تـر، پێویسـتە "سـەرنجدان" لەلایەکـەوە بـە تیۆریاکان پێشینەسازی بۆ بکرێت و لەلایەکی دیکەشەوە بە هەمان ئەو تیۆریایانە ڕووپۆشی بکرێـت. شـایانی گرنگـی پێدانـە، ئـامرازە زانسـتییەکان لێووردبوونـەوە و ئەنـدازەگیری ووردیان بۆ دابینکردوین، وەکو مایکرۆسکۆب و ئامێرەکـانی لەرینـەوەی موگناتیسـی نـاوکی، ئەمانـە هـیچ نـین جگـە لـە گریمانـە تیۆرییـە ئاڵۆزەکـان کـە بـە شـێوەیەکی وا ڕێکخـراون و بابـەتی کـراون ڕێگامـان پێبـدات کـە پرسـیاری تایبـەتی ئاڕاسـتەی سروشـت بکـەین و وەڵامـەکانیش هـەر لـە سروشـتەوە بەدەست بهێنین.

دەرکـــەوتووە کـــە پێشینەســـازی و ڕووپۆشـــکردنی تیۆریانـــەی ســـەرنجدانەکان ڕاستییەکی مێژووی زانستە، هەروەکو چۆنیش پێویســـتییەکی گومـــان هەڵنـــەگری میتـــۆدی زانستیشە واتە لۆژیکی تێگەیشتنی سروشتە. ئـەم تێڕوانینـە گـرنگ و تەوەرییـە کـە هـەموو جەســتەی زانسـتی تـەنیوە توانیویـەتی کایـە جیاوازەکـــانی وەکـــو لۆژیـــك و مێـــژوو و کۆمەڵناسی زانست بەیەکەوە گرێبدات، هەموو ئەمانــەی بەیەکــەوە گرێــداوە و جەســتەیەکی یـــەکگرتووی لـــێ دروســـت کـــردوون واتـــە فەلسـەفەی زانسـتی پـاش پۆزەتیڤسـتی نـوێ دروست بوو.

لە هەمان ڕوانگە و کت و مت لەبەر هەمان ئەو هۆکارانە، دەتوانین بڵێین دەق *Text* بە تەنها ڕۆڵ نابینێت، مانای خۆی لەسەر شانی خۆی هەڵناگرێت، بەڵکو پێویستە بخرێتە سیاقێکەوە *Context*، دەق ڕووپـــۆش و پێشینەســـازی بـــە تیۆریا بۆ دەکرێت، ڕاڤەکەی (تەفسیرەکەی) لە گۆڕاندایـــە و وەکـــو ڕووبـــار لەبـــەری دەڕوات، لێرەشدا پێشگریمانەکان، وەکو هەر جێگەیەکی دیکەی بواری تێگەیشتن، بە هەمان هێز ڕۆڵی خـۆی دەبینێـت. دەقـە ئایینیـیـەکانیش لەمـە بەدەرنین. لەبەرئەوە ڕاڤەکانیان شایانی کرانەوە و داخـرانن بـە گـوێرەی پێشـگریمانەکانیان و/ یاخود بە گوێرەی ئەو پرسیارانەی لەبارەی ئەو دەقانـەوە کـراون. ئـەم پێشـگریمانانە دەشـێت ســـەر بـــە سروشـــتی جیـــاواز بـــن، هـــەر لـــە پێشـــگریمانەی فەلســـەفی و مێـــژوویی و دینناسییەوە بۆ پێشگریمانە تایبەتی ترەکانی وەکـــو پێشـــگریمانە زمانـــەوانی و کۆمەڵناسـییەکان. ئەمانـە بەشـێکن لـە "ڕوحـی سەردەم". ئەم پێشگریمانانە بەپێی پێویست و عادەتەن لە ڕێگەی خوێندنی ڕەسمییەوە ناچنە زەینـەوە (لـە ڕاسـتیدا بـەم شـێوەیە دەسـت ناکـەون)، خـەڵکیش بـەبێ گرنگـی پێـدان و بـە ساکاری بەکاریان دەهێنن.

ئێســـتا لەبەرئـــەوەی پێشـــگریمانەکان وابەسـتەی سـەردەمی خۆیـانن، لـە ڕاسـتیدا دەشـێت بگـۆڕێن و گۆڕانکاریـان تێـدا بکرێـت، لەبەرئـەوەی مەعریفـەی ئایینی یـاخود زانسـتی ئـایین بەرهـەمی تێگەیشـتن و لێوردبوونـەوەی مرۆڤە بەردەوام لەگۆڕاندایە و لەبەر ڕۆیشتووە، وە لەبەرئـــەوەی کـــە تـــەنها لـــە ڕێگـــەی ئـــەو پێشـگریمانانەوە کەسێك دەتوانێت گوێبیستی بانگی سروش (وەحی *Revelation*) بێت، کەواتە خودی ئایین بێدەنگە.... وە لەبەرئەوەی ڕاڤەی دەق لە جەوهەردا کۆمەڵیەیە و پشت دەبەستێت لەســـەر کۆمەڵـــەی پســـپۆڕان، وەکـــو هـــەموو چالاکییە مەعریفییـەکانی دیکـەش، مەعریفـەی ئایینی دەشێت شوناسێکی جولاوی سەربەخۆ بێـت لـە تـاك تـاکی ڕاڤـەکاران (موفەسـیران)، مەعریفـەی ئـایینی بیرۆکـەی ڕاسـت و هەڵـە و دڵنیـاو گومانـاوی لـە خـۆ دەگرێـت.. لـە دیدگایـــەکی پەرەســـەندووییەوە، بیرۆکـــە و بۆچـوونە هەڵـەکان هێنـدەی بیرۆکـە و بۆچـوونە ڕاسـتەکان گـرنگن، مەعریفـەی ئـاینیش لقێکـی مەعریفەیەو نە کەم و نە زیاتر.

*دەرەنجامی ئارگیومێنتە کورتەکەی پێشوو دەشـێت بـە کـورتی بـەم شـێوەی خـوارەوە ڕیـز بکرێت:

1-ئایین یاخود سروش بێدەنگە

2-زانستی ئایین ڕێژەییە واتە پێشگریمانەکانیش ڕێژەیین.

3-زانستی ئایین وابەستەی سەردەمە چونکە پێشگریمانەکانی وابەستەی سەردەمن.

4-خودی ئایینی بە سروش نێردراو دەشێت ڕاست بێت و خاڵی بێت لە ناکۆکی و لێکدژییەکان، بەلاّم زانستی ئایین مەرج نییە بەو شێوەیە بێت.

5-ئایین دەشێت کامڵ بێت یاخود گشتگیر بێت بەلاّم زانستی ئایین وانیە.

6-ئایین خوداییە، بەلاّم راڤەی ئایین سەد دەرسەد مرۆییە..

ئەمە چیرۆکی ئایینە. هەموو ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەمیشە ئایین بە کۆمەڵێك زانیاری و دەستکەوتی هەنووکەیی سەردەم دەورە دراوە، هەمیشە لە تەکیاندا دەست و پەنجە نەرم دەکات.. تێگەیشتن لە ئایین بە جێگیری دەمێنێتەوە، هەرکاتێکیش گۆڕانکاری لەو توخمانەدا ڕوویدا، ئەوا گۆڕانکاریش بە هەمان شێوە لە تێگەیشتنی ئایینیدا ڕوودەدات. لەبەرئەوە نابێت پێمان وا بێت بە هۆی پیلان گێڕان یان گومڕابوونی عەقڵ یان ئەنجامدانی کاری نائەخلاقی یان بەهۆی راڤەی گاڵتە ئامێزەوەیە کە زانستی ئاین دەگۆڕێت، بەڵکو ئەم گۆڕانە دەرەنجامێکی سروشتی پەرەسەندنی تێگەیشتنی مرۆڤە لە بوار و سیاقە نائایینییەکاندا کە وا لە ئایین دەکەن بە شێوەی جیاواز لێکبدرێتەوە. هەروەکو لە سەرەوەش باسکرا، فاکتەرە دەرەکییەکان نەك تەنها لە گۆڕانی تێگەیشتنی ئایین بەرپرسیارن بەڵکو هەروەها بەرپرسیارن لە جێگیری تەفسیری ئایینی بە درێژایی سەردەمەکان جیهانبینی مرۆڤی سووننەتی (واتە دیدگاکانی لەبارەی سروشت و مرۆڤ و خوداو مێژوو زمان و کۆمەڵگە و بەختەوەری و یەقین و عەقڵ و مەعریفە و هاوشێوەکانیەوە) ڕەنگی داوەتەوە لە تێگەیشتنی لەبارەی ئایینەوە بە هەمان شێوەو هەمان ئاستی جیهانبینی مرۆڤی نوێ کە کاریگەری خۆی لەسەر زانستی ئاین دروست کردووە و بێگومان هەر راڤەیەك هێندەی ئەوی دیکەیان سروشتی و ڕاستە بەو کاریگەرییەی دروستی دەکات.

2)ئەم بانگەشەیە واتە "تیۆریای چوونەوەیەك و کشانی تیۆریانەی شەریعەت"[(2)] گەرچی قورس و گران دێتە پێشچاو بەلاّم تاڕادەیەك تیۆریایەکی گشتی و قبوڵکراوی کایەی مەعریفەناسی پێشینەو شتێکی نامۆ نییە لەلای زانایانی هێرمۆنتیکا و فەیلەسوفەکانی زانست. بەلاّم ئەم تیۆریایە دوو کەموکوڕی جدی هەیە:

یەکەم: دەشێت ئەم تیۆریایە ئەوەندە قەناعەتپێکەر و ڕۆشن نەبێت لەلای ئەو لێکۆڵەرە پڕمێژوویی ترانەی کە دەشێت زیاتر داوای زانیاری مێژوویی و داوەرییەکی پاشین بکەن بۆ پشتگیری کردنی ئەم تیۆریایە.

دووەم: لەوانەیە ئەم تیۆریایە یاخود ئەم بانگەشەیە تەواو هەڵە و گومڕاش بێتە پێشچاو لەبارەی ئایینەوە چونکە باوەڕدارە ڕاستەقینەکان پێیان وایە سروشتە وەحییەکەی ئایین گەرەنتی جێگیربوون و ڕاستبوونییەتی بە درێژایی مێژوو.

ڕێژەیی بوون *Relativity* و گۆڕان *Charge* بڕیتین لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمە مرۆڤکردەکان کە جێبەجێ کردنیان بەسەر سروشتی خوداییدا تەواو جێبەجێکردنێکی هەڵەیە، واش دێتە پێشچاو ئەم بانگەشەیە (تیۆریایە) سەیری ئایین دەکات لەبەر ڕۆشنایی ئەو پرنسیپە نائاینییانەی کە ڕاست و دروستیان جێی گومانن و دەبێتە هۆی لاوازکردنی تەواوی پەیامی ئایین کە پەیامە سەرەکییەکەی بریتیە لە پێشکەشکردنی سەرچاوەیەکی مەعصومی یەقین و ئاگایی بە مرۆڤێك کە شایانی گوناهکردنە.

هەردوو ئەم مەسەلەیە هێندە قوڵن کە ناتوانین لێرەدا ئەمسەرو سەریان تەیبکەین، باش وایە لێرەدا بە چەند خاڵێك لێیان بدوێم:

1-2: سەرەتا دەربارەی بانگەشەی مێژوونووسەکان ڕونکردنەوەیەك دەدەم. پێکدادانی نێوان زانست و ئایین لە ئەوروپا (لە دوای سەدەی شانزەهەمە) نمونەیەکی زۆر بەرچاوە. بەڵام بە بۆچوونی بیریارانی ڕواڵەت بین، پێکدادانی نێوان زانست و ئایین بە تیاچوون و کۆتاییهاتنی ئایین بە ئەنجام گەیشتووە و زانست بە تەواوی هەڵەبوونی ئایینی ئاشکرا کرد و بۆ هەمیشە چییەتی (ماهیەتی) بەرەو دوا گەڕانەوەی ئایینی نیشانداوە (ئاشکرایە ئەم بۆچوونە جۆرێك لە تێڕوانینی پۆزەتڤیستییە چونکە ئەم تێڕوانینە مانا بۆ بینەرێکی زەین خاڵی واتە خاڵی لە پێشگریمانەو وێناکردن بە ئاشکراو ڕوون دەبینێت). بەڵام لە دیدی بیریارە جدیترەکانەوە (دینی یاخود نادینی) و لە دیدێکی مەعریفەناسییەوە، ئەم ڕاستییە (پێکدادانی زانست و ئایین) هەڵێکی بێ وێنەی ڕەخساند لە خودی خۆیدا کە چییەتی هەریەکە لەم ڕکەبەرە دەورانسازەی (زانست و ئاین)ی ئاشکراتر کرد. ئەم ڕاستییە لانی کەم نیشانیدا کە ڕوحانیەکان (واتە ئەو کەسانەی کە بە جدی لە ئاستی تێگەیشتنی سروشتدا بوون) لە خۆبوردوانە و بێ مەبەستانە سوودیان لە جیهانبینی سەدەکانی ناوەڕاست و پێش سەدەکانی ناوەڕاستیش وەرگرتووە بۆ بە شوێنداچوونی تەفسیرێکی "ڕاستی" کتێبی پیرۆز و نەشیاندەتوانی کارێکی دیکە جگە لەوە بکەن. ڕوحانییەکان بە سود وەرگرتن لەم پێکدادانە بۆیان دەرکەوت (لە واقیعیشدا دوای ئەمە تەواو بۆیان دەرکەوت) کە سیستەمی تازە لە پێش گریمانە بوونی هەیە و دەتوانرێت لە ژێر ڕۆشنایی ئەم سیستەمە تازەدا بەشێوەیەکی سازگارتر ئایین لەگەڵ عەقڵی زاڵی سەردەمدا لێکبدرێتەوە و شایانی لێکتێگەیشتن بێت. بەم شێوەیە، پرۆسەیەکی ڕاڤەی نوێ دەستی پێکرد و بەهەمان جۆر هەروەکو ئێستا دەیزانین ئەو کارەی ئەوان کردیان هیچ نەبوو جگە لەوەی لە ژێر ڕۆشنایی بنەما دەردینیەکاندا بگەن بە نوێبوونەوەی تێگەیشتنی دینی. مەسەلەکە بە هیچ شێوەیەك ئەوە نەبووە کە بۆ نمونە ئەوان وا تێبگەن کە تەنها چەند وشەیەك یان چەمکێك لە یۆنانی یاخود سریانییەوە بە هەڵە وەرگێردراوە. لێکۆڵینەوە دەربارەی زمانی ئایین، چاوەڕوانییەکانی مرۆڤ لە ئایین و هاوشێوەکانی ڕۆڵەی ڕاستەوخۆی ئەو هەوڵ و کۆششانە بوون لە پێناو دروستکردنی

دیدگایەکی نوێ بۆ تێگەیشتن کە ئەو کاتە ڕێگای خۆی گرتبۆوە بەر. هەرکام لەم بابەتانە بەش بە حاڵی خۆیان بە باشی نیشانیاندا کە تەفسیری دەق تا چ ئاستێك بە پێشگریمانە و بیروباوەڕی ناوەکی ئیمانداران وابەستەیە. تا ئێرە دەبێت ڕۆشن بێت کە بۆ ڕاڤەکار (موفەسیر) کافی نییە تەنها ڕاڤەی سازگار لە کۆی دەقەکە بدات بەدەستەوە، بەڵکو دەبێت ڕاڤەکە بە جۆرێك پێشکەش بکات لەگەڵ عەقڵانیەتی باڵای سەردەمدا هیچ جۆرە پێکدادان و هاودژبونێکی تێدا نەبێت. ئەگەر کەسێك لە ڕاستی ئەم بانگەشەیە گومانی هەیەو بەڵکو ڕاستبوونیشی بۆ ئەوان بێزارکەرە، پێویستە سەرنجبدات لە ڕاستیدا تەواوی بیریاران بە درێژایی سەردەمەکان بەم جۆرە مامەڵەیان کردووە، بۆ نموونە لە ئێران سەدرەدین شیرازی و پەیڕەوانی ئەو شانازی دەکەن بەوەی کە توانیویانە لە نێوان شەریعەت و عیرفان و فەلسەفەدا، بە دەربڕینێکی کورتتر، لە نێوان عەقڵ و وەحیدا (سروشدا) ئاشتی بەرپا بکەن.

ئەم کارە چۆن دەتوانرێت ئەنجام بدرێ جگە لە گرتنەبەری ڕێگەی ڕاڤەکردنێکی نوێی شەریعەت بە هاوکاری بنەماکانی فەلسەفە؟ واتە لەم ڕێگەیەوە شەریعەت بچێتە ژێر چەمکە فەلسەفیەکانەوە. دەشێت کەسانێك وا بیر بکەنەوە کە جەوهەری بنەڕەتی هەوڵەکانی صدرالدین (واتە بەرپاکردنی ئاشتی نێوان عەقڵو سروش) بریتییە لە سەلماندنی عەقڵانییانەی بنەما عەقیدەییەکانی ئایین. بەڵام ئەگەر لەم گۆشەیەوە سەیری مەسەلەکە بکەین، ئەوا لە واقیعدا پێچەوانەی ئەمە دەبینین. بۆئەوەی گوزارەیەکی ئایینی لە ڕووی عەقڵییەوە شیاوی سەلماندن و باوەڕ پێکردن بێت، پێویستە لە هەنگاوی یەکەمدا ئەو گوزارەیە خۆی مەعقول بێت، واتە پێویستە لەژێر ڕۆشنایی مەقولە و چەمکە فەلسەفییەکاندا پێناسە کرابێت بۆ ئەوەی عەقڵ بتوانێت دەست بۆ سەلماندنی بەرێت. (واتە پێش ئەوەی فەلسەفییانە دین بسەلمێنین، پێویستە تێگەیشتنێکی فەیلەسوفانەمان بۆ دین هەبێت). بۆ نمونە ئەگەر مەسەلەی "زیندوبوونەوەی جەستەییانەی مرۆڤ پاش مردن" لەبەرچاو بگرین، صدرالدین بە ڕاشکاوانە دەڵێت فەیلەسوفی ڕاستەقینە نابێت بە ئیمکانێکی سادە ڕازیبێت لەبارەی زیندوبونەوەوە، واتە ئیمانێکی سادە بەس نییە، بەڵکو دەبێت تێگەیشتنی عەقڵانییانەی بۆ زیندووبونەوە هەبێت، بۆ نمونە دەبێت پێشتر پێناسەیەکی ئەرستۆیی بۆ جەستە کردبێت، واتە جەستە لە پێکهاتەیەك لە "صورت" و "مادە"[3] بزانێت و ئەم بنەما سەدراییە ئەوە بەڕاست دەزانێت کە "صورت" توخمی بنەڕەتی شوناسی شتەکانە نەك "مادەی" شتەکان، پاش ئەمە فەیلەسوف دەتوانێت بەشێوەی عەقڵانی و مێتافیزیکی "زیندوبوونەوەی جەستە" بسەلمێنێت و دەلیلی بۆ بهێنێتەوە (واتە بڵێت جەستەکان بە صورت زیندودەبنەوە نەك بە مادە)، بە دەربڕینێکی تر، تێگەیشتنی فەلسەفی دەق دەکەوێتە پێش فەلسەفییانە بڕیاردان لەبارەی ئەو دەقەوە.

سەرەڕای ئەمەش، ئاشتبوونەوەی خوازراوی نێوان ئایین و فەلسەفە ناتوانرێت مسۆگەر بکرێت ئەگەر کەموکورتی یەکێکیان بەوی دیکەیان پڕنەکرێتەوە واتە دین لە چوارچێوەی مەقولە فەلسەفییەکاندا شێوە بگرێت (ئەگەر ووردتر بڵێین: لێکدانەوەیەکی فەلسەڤی کراوی دەقی دینی)، ئەو کاتە دەتوانرێت لەگەڵ فەلسەفەدا ئاشت بکرێتەوە، تێگەیشتنێکی عیرفانییانەی ئایینیش دەبێتە پێشەکی بۆ داوەریکردنی عیرفانییانەی ئایین، وە هەروەها بۆ شتەکانی دیکەش..

ئیسلامی عیرفانی و ئیسلامی فەلسەڤی دوو جۆری وێناکراوی ئیسلامن، باشتر گفتوگۆکراون و پوختەکراون وەك لە جۆرەکانی دیکە، ئەگینا لە واقعدا جۆری بێ پایانی ئیسلام هەیە، هەموو جۆرەکان ئەو سیفەتە هاوبەشە پێکدەهێنن کە دەبێتە هۆی دروستبوونی هاوسەنگییەك لەگەڵ سیستەمی فکری نائایینی باوەڕدارانـدا، واتە خاڵی هاوبەشیان ئەوەیە لە هاوسەنگی دان لەگەڵ فیکرە دەردینییەکەدا. بەلاّم، مشتومڕکردن لەبارەی ڕاستبوون و هەڵەبوونی ئەو تەفسیرە (ڕاڤە) عیرفانی و فەلسەفییانەی دەق بۆتە هۆی تەواو لەناوبردنی ئەم مەسەلەیە (باس لە باشی و خراپی ئەم جۆرە ئیسلامناسییانە باسێکە لە دەرەوەی بابەتەکە چونکە ئەگەر لێرەدا سەرنج بە باسکردنی ڕاستبوون و هەڵەبوونی ئەم راڤە عیرفانی و فەلسەفییانە بدەین لە ڕاستیدا بابەتە بنەڕەتییەکە یاخود جەوهەرییەکە لەناودەچێت). ئەم جۆرانەی ئیسلام بەشێکن و ساتێکن لە مێژووی ئایین، زانست تێکەڵەیەکە لە ئایدیا ڕاست و هەڵەکان (ئەمە سەرەڕای ئەو ڕاستییەش کە هەر زانایەك هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ڕونکردنەوەی ڕاستییە ئاڵۆزەکان و دەرخستنی ئایدیا ڕاستەکان بەلاّم خودی زانست دەکەوێتە دەرەوەی عەقیدە و بیرو بۆچونەکانی ئەم یان ئەو زانا تایبەتە کە بەم کارە هەڵستاوە بەڵکو زانست لەگەڵ ئەوەی دەشێت ڕاستی چەسپیوی تێدا بێت، دەشێت هەڵە و بە هەڵە تێگەیشتن و پێشگریمانەی گوماناوی و بەڵگەی شیاوی هەڵوەشاندنەوەی تێدابێت). ئەگەر تەنها ڕووی باشی ئەم چیرۆکە یاخود دیوی پێکراوی مێژووی زانست واتە ئەو دیوەی زانست کە ڕاستی هێناوە ببینێت ئەوا مێژوو دەشێوێنێت. لە مێژوودا، شکستەکان هێندەی سەرکەوتنەکان گرنگن، وە هەردووکیان لە تەمەنی پەرەسەندوویی (بەرەو پێش چوونی) زانستدا هەمان بەهاو ڕۆڵیان هەیە. دیسانەوە هەمان خاڵ دووبارە دەکەمەوە کە زانستی ئایین لەمە بەدەر نییە.

با نمونەیەکی دیکە بهێنینەوە ئەویش "تەفسیر بە رأی"یە، واتە "ڕاڤە بە بۆچوون"ە، "ڕاڤە بە بۆچوون" واتە ڕاڤەی قورئان لەسەر بناغەی مەیل و ڕاوبۆچوونی ڕاڤەکار. (بۆچوون یاخود رأی" لە "رؤية"ەوە هاتووە کە بە مانای "بینین یاخود گۆشە نیگا" دێت).

موسڵمانان زۆر بە ئاگاوە لەگەڵ ئەم جۆرە ڕاڤەدا مامەڵەیان کردووە و لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە کە هەر کەسێك بەگوێرەی بۆچوونی خۆی ڕاڤەی قورئان بکات، لە قیامەتدا بە ئاگری دۆزەخ دەسوتێت.

بـەڵام گفتوگـۆی ڕاڤـەکاران (موفەسیران) لـە بارەی ماناو ڕاستێتی ووردی "ڕاڤە بە بۆچوون" هـیچ کاتێـك بـە دەرەنجامێـك نەگەیشـتووە. هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لەم کارە دوور کەوتونەتەوە، واتە "ڕاڤە بە بۆچوون" یان نەکردووە لە هەمان کاتیشدا هەموویان یەکتری بەوە تاوانبار دەکەن کە دووچاری ئەم گوناهـە بوون کە قورئانیان بـەگوێرەی بۆچوونی خۆیـان ڕاڤـەکردووە و لـە ڕاستیشـدا هـەر بـەو جۆرەیـە واتـە بـە گـوێرەی بۆچوونەکانی خۆیـان ڕاڤـەیان ئەنجامداوە، بەڵام هیچ کەس لە ڕاستیدا ڕێگـەی دەربـازبوونی لەمـە نیشـان نـەداوە، وە دژواری مەسـەلەکە لـەم خاڵەدایـە. لـە ڕۆژگـاری ئێمـەدا، بــەڕێز طباطبــائی کــە خــاوەنی تەفســیری "المیزان"ە، ئەم گوناهـەی درایـە پاڵ، سـەرەڕای ئــەوەش لــە پێشــەکی تەفســیرەکەیدا لــە تێکـەڵکردن لـە نێـوان "تـەتبیق" و "تەفسیر"دا حەزەری کردبوو.

ئامۆژگـاری دڵسـۆزانەی هەنـدێك لـە تـازە فێرکــەران (مرۆڤــە ســاویلکەکان) ئەوەیــە کــە ڕاڤەکار پێویستە زەینی خۆی لە تـەواوی بیرو بۆچـوون و ئەندێشـەکان پـاك بکاتـەوە پـێش ئـەوەی بچـێتە خزمـەتی دەقێـك، جگـە لـەوەی دەبێت کۆمـەڵێك چەمك و ڕێسا ڕێزمانییـەکانی زمــان بزانێــت بۆئــەوەی ببێتــە ڕاڤــەکارێکی نمونەیی، ئەم ئامۆژگارییە مەحاڵە. کارکردن بەم ئامۆژگارییــە مەحاڵــە چـونکە مێــژووی دیــن نیشانی داوە کە تا ئێستا هیچ کەس نـەیتوانیوە بەم ئامۆژگارییە کار بکات، گرنگتر لـەوەش، ئـەم ئامۆژگارییـە پێویسـت نییـە چـونکە کـارکردن بەمـە کـاری ڕاڤـەکردن بـە تـەواوی پـەك دەخـات. لانـی کـەم کەسـی ڕاڤـەکار دەبێـت هەڵوێسـتی خـۆی یـەکلایی بکاتـەوە لـە بەرامبـەر ئـەوەدا کـە ئایا خودا بـە مـەجاز قسـەی کردووە یـاخود نـا. بێگومــان ئــەم هەڵوێســتگرتنە ناتوانرێــت لــە خودی دەقی دینییەوە دەربهێنرێت چونکە ئەمـە دووبـارە بوونەوەیـەکی زنجیرەیـی نادروستە کـە لـە زانسـتی لۆژیکـدا قبـوڵ نییـە. لەسـەر ئـەم بنەمایە، بڕیـاردان لەسـەر بەمـەجاز قسـە کردنـی خــودا یــاخود بــە پێچــەوانەوە، هــەردووکیان دەبێت پێشتر بەر لـە دەست پێکردنـی ڕاڤـەکردن *Interpretation* یەکلایی کرابێتەوە.

لەسەر ئەم بنەمایە، ئەم هۆشداری و ئاگاییە کە "ڕاڤەی قورئان دەبێت نمونـەیی و دوور بێت لە بیر و بۆچوونی ڕاڤەکار" چۆن لێکبدەینـەوە؟ مەگەر هەموو ڕاڤەکان ڕەنگڕێژ نـەبوون بە پێش مەرجی تیۆرییایەکی دیاریکراو؟ ئەگەر بەم جۆرە بێت، ئایـا باشتر نییە کە ئـەم ئاگـایی دانـە بـەو مانایە وەربگرین (سوود وەرگرتن لە بۆچوون و تیۆریا دەرەدینییەکان کـارێکی حەتمییـە، بـەڵام) کـە نابێـت ڕاڤـەی دیـاریکراوی کەسـێك لەسـەر تیۆریایـەکی بـێ بەڵگـە و ناپوخـت بینـا بکـەین؟ بـەڵێ وایـە و هـەموو مەسـەلەکە بـەم جۆرەیـە. لەسەر ئەم بنەمایە، هەموو شتێك دووبارە بەنـدە لەسەر بابەت و بیرو بۆچوونە دەرەدینییەکان.

طباطبـائی لـە تەفسیرەکەی خۆیدا لـەبارەی فەیلەسـوفەکان و کەلامناسـەکان و سـۆفیەکان و نوێگەرەکان بە ناونیشانی چوار گرووپی جیاواز نـاوی بـردوون کـە خولیـای دەرهێنـانی مانـای ووردی قورئانیــان لەســەردا نــەبووە بــەڵکو هەوڵیانــداوە ڕای خۆیــان بەســەر قورئانــدا بسـەپێنن و لەبەرئـەوە دەستیان داوەتـە "تأویل

کـردن" تـا ئایەتـەکانی قورئـان لەگـەڵ بـیر و بۆچـــوونەکانی خۆیانـــدا هاوتـــا بێنـــەوە. "تأویـل"یـش نمونەیـەکی بـاڵای "ڕاڤـە بـە بۆچـوون"ە. طباطبـائی بـە تایبـەتی دەربـارەی نوێگـەرەکان دەستنیشـانی ئـەوەی کـردووە کـە ئـەمان بابەتـەکانی هاوشـێوەی "عـەرش" و "کورسـی" و "لـوح" و "قەلـەم" و... بـە جۆرێك تأویل کردووە کە مانای شتی مادی و دەرەکی بگەیەنن[4].

هەروەها دەشڵێت، تەواوی ئەم ڕەوتانە یەك کەم و کورتی جدی هاوبەشیان هەیە: هەموویان هەوڵیانـداوە بـیرو بۆچـوونی زانسـتی یـاخود فەلســەفی دەرەدیــنی بــەزۆر بەســەر مانــای ئایەتەکاندا بسەپێنن، لەم ڕێگایەشەوە بەشێك لـە مانـای حـەقیقی و نامـەجازی دەربڕینـەکان بگۆڕنـە سـەر مانایـەکی مـەجازی و تأویلیانـە ئایەتـــەکان بگۆڕنـــە ســـەر مانایـــەکی دوور و ناڕاستەوخۆ[5]..

ڕەوتی طباطبائی بە دەربڕینی خۆی بریتیە لـە بـەراوردکردنی بەشـێك لـە دەق بـە بەشـێکی دیکـــەی تـــاوەکو لێـــرەوە لـــە ڕێگـــەی ڕۆڵـــی هێرمۆنتیکـاوە، مانـا بەرهـەم بێـت و بناسـرێت (وەکـو ئـەوەی هـیچ پێشـگریمانەیەك لـە کـاری ئـەودا نـەبێت). بـەڵام هـەر لـە هـەمان پێشـەکیدا، ئـەو خاڵـە ڕوون دەکاتـەوە کـە زمـانی قورئـان نابێـت زیـاد لـە پێویسـت لـە مانا مـادی و ڕووە دەرەکییەکـــەی ووشـــەکاندا کورتبکرێتـــەوە، چونکە نە مادی بوون و نە پێکهاتـەی ئێسـتای شـتەکان لـە مانـای ووشـەکانەوە وەرنـەگیراوە، ووشـــەکان یـــاخود دەربڕینـــەکان بەرلـــەوەی دەلالـــەت بـــن لەســـەر مانـــا دەرەکـــی و مـــادی

شـــتەکان، دەلالـــەتن لەســـەر ئـــەو ســـوود و بەکارهێنانەی ئەو شتانە هەیانە (مێز واتە ئەو شتەی کـاری مێـز ئەنجامـدەدات، نـەك مێـز بـەو شـێوەیەی کـە هەیـە، واتـە شـێوەکەی بڕیـار لـە ناوەکـەی نـادات بـەڵکو سـوودەکەی بڕیـاری لێدەدات.. بۆ شتەکانی دیکەش بەو شێوەیە..) بۆ نمونـە ئەگـەر ووشـەی "تـەرازوو" وەربگرین، لـە مانـای ئـەم ووشـەیەدا، هـەبوونی "تـای تـەرازوو" مەبەسـت نییـە، تـەرازووی دیجیتـاڵی بەهـەمان شـێوە هـەر تـەرازووە بـەبێ ئـەوەی تای هـەبێت، ئەگـەری ئـەوە هەیـە نـەوەکانی داهـاتوو ئاشنابن بە جۆرێکی دیکەی تـەرازوو کـە مرۆڤی ئـەمڕۆ بـە خـەونیش نـەبینێت، بەهـەرحاڵ گـرنگ نییـە کـە ئـەم تـەرازووە لـە چـی دروسـت بـووەو چۆن کار دەکات (ئەوەندە بەسە کە کاری پێوانە کردن ئەنجام بدات تا پێی بووترێت تـەرازوو). بـە بۆچـوونی طباطبـائی سـەرنجدان بـەم مانایـە زەمینەی ئەوە فەراهەم دەکات تا بتوانین مانـای ووشـەیی هاوشـێوەی "المیـزان" واتـە تـەرازوو، عرش، لوح.. هتد. لە قورئاندا تێبگەین و هەڵەی فـەرموودە نـاس و کەلامناسـە روکەشـگەراکان دووبـارە نەکەینـەوە کـە مانـای ووشـەکانیان لـە ڕووە مـادی و دەرەکییەکـەی شـتەکاندا کـورت کردۆتـەوە، بـەڵام ئـەم بۆچـوونەش لـە غـەزالی و (بە دوای ئەویشدا لـە مـەولانای ڕۆمـی و فـەیزی کاشـانی)یـەوە وەرگـیراوە. غـەزالی لـە کتـێبی "مشکاة الانوار"دا جەغد لەسەر ئەوە دەکاتـەوە کە بۆ نمونە ووشەی "نور" لە ڕاستیدا بۆ نـوری نامـادی بـەکارهاتووە نـەك نـورێکی مـادی و دەرەکـی، ئـەم بەکارهێنانـەی مانـای دووەم بـەکارهێنانێکی مەجازییـە. لێـرەدا دووپـاتی

دەکەمەوە هەڵەبوون و راستبوونی ئەم بیرو بۆچوونانە بە تەواوی لە دەرەوەی باسەکەی منە. لە دیدێکی مەعریفەناسییەوە، خاڵی گرنگ ئەمەیە کە ئەم جۆرە پێشگریمانە گەورەو کاریگەرانە بەردەوام لە مەیدانی ڕاڤەکردندا لەکاردا بوون و تێگەیشتنی ئاینی شوێنکەوتەی ئەم پێشگریمانانە بووە. هەروەها شایەتی یەکێك لە بەرچاوترین ڕاڤەکاران واتە طباطبائی دەربارەی مێژووی راڤەکردن (لە راستیدا دەربارەی هەموو مێژووی ئاینیش) زۆر گرنگە، لەسەر شایەتی ئەو، ڕای ناپوخت و نازانایانە هەروەها مەیل و ئارەزووی عارفان و فەیلەسوفان و کەلامناسەکان و نوێگەرەکان و فەرمودەناسەکان بە یەکسانی تەواوی مەیدانی تێگەیشتن لە دینیان گرتۆتەوەو بەلادانی تەفسیرەکان بە ئەنجام گەیشتووە. دەتوانین هەمان مانا بە دەربڕین و ئاوازێکی ناسکتر بەم شێوازە دەربڕین: زانستی دین بە دەست ڕاڤەکارانی جۆراوجۆرەوە بە درێژایی مێژووی دین بە بەردەوامی بەرهەم دێت و دووبارە پێکدێتەوە، دینی موسڵمانایش شتێك نییە جگە لە مێژووی مەعریفەی دینی.

کەواتە بەم دەرەنجامە دەگەین: کە راڤەکاران بە درێژایی مێژوو ڕاستگۆیانە هەوڵیانداوە تا ڕاڤەکردنی قورئان لە بیرو بۆچوونە دەرەدینییەکان بپارێزن، بەڵام ئەم هەوڵانە بەم دەرەنجامە گەیشتوون: (کە ئەم کارە مەحاڵە) و ئامادەبوونی ئەم بۆچوونە و ئەندێشانە لە پرۆسەی ڕاڤەکردندا لە ڕووی کردەیی و مەعریفەناسیشەوە ناکرێت خۆی لێ لابدەین. بە دەربڕینێکی دیکە، ئەم نەتوانینی خۆلێلادانە لە ئاستی کردەدا، دەرەنجامی نەتوانینی خۆ لێ لادانە لە ئاستی مەعریفەناسیدا.

نمونەیەکی دیکە کە دەکرێت بۆ ئەم کارەی ئێمە سوودمەندبێت، ئەمەیە کە ئەو ڕاڤەکارە هاوچەرخەی ئاماژەم پێکرد واتە طباطبائی لە هەمان کاتیشدا فەیلەسوفێکی مێتافزیکی پلەیەکە. زۆر کۆششی کرد بۆ ئەوەی نیشانی بدات کە ئەسڵی "هۆکار و دەرەنجام" یاخود علییەت جێگای ڕەزامەندی و پشتگیری قورئانە، واتە قورئان پشتگیری دەکات نەك ڕەدی دەکاتەوە.

بەڵام مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، شاعیر و عارفی گەورەی ئێرانی سەدەی حەوتەمی کۆچی، بە تەواوی ڕای پێچەوانەی ئەم ڕایەی طباطبائی هەبووە، واتە بە بۆچوونی ئەو تەواوی قورئان وانەی "نەفی هۆکار و دەرەنجام"مان فێردەکات:

پێغەمبەران هاتن بۆ نەهێشتنی هۆکارەکان
موعجیزەکانی خۆیان خستەبەردەم ئەستێرەکان
تەواوی قورئان خەریکی نەهێشتنی سەبەبە
گەورەیی بۆ تەسلیم بوون و تیاچوون بۆ ئەبولەهەبە
هەروەها لە سەرەتای قورئانەوە تا کۆتایی کەلام
ڕەدی سەبەب و هۆکارەو و السلام[6]

نمونەیەکی سەرنجڕاکێشی دیکە، ڕەخنەکانی طباطبائی یە لە بۆچوونەکانی مەجلیسی، مەجلیسی یەکێکە لە فەرموودەناسە گەورەکانی سەدەی دەو یانزدە واتە سەردەمی سەفەوییەکان، مەجلیسی کۆکەرەوەی "بحار الأنوار"ە لە 110 بەرگدا. مەجلیسی دژی فەلسەفە بووەو لەبەرئەوەش بەکارهێنانی چەمکەکانی وەکو "ڕوح" و "نەفس"ی بۆ مانای

ئامادی ڕەدکردۆتەوە. طباطبائی دەرگای باس و گفتوگـۆ لەسـەر مەجلیسـی دەکاتـەوە، نـەك لـەبارەی مانـا ڕاسـتەقینەکانی ئـەم ووشـانەوە، بـەڵکو دەربـارەی ئـەو گریمانـە گرنگـەی کـە طباطبـائی دەرگـای بـاس و گفتوگـۆ لەسـەر مەجلیسـی دەکاتـەوە، نـەك لـەبارەی مانـا ڕاستەقینەکانی ئەم ووشانەوە، بەڵکو دەربارەی ئەو گریمانە گرنگەی کە طباطبائی دەیداتە پاڵ مەجلیسی واتە ئەو بۆچوونەی کە زمانی دین سـەد دەرسـەد گوتارێکـە بـۆ عـەوام. بـەلاّم بـە بۆچـوونی طباطبـائی مەسـەلەکە بـەم شـێوەیە نییـە، بەشـێك لـە دەربڕینـەکانی پێغەمبـەر و ئەهلی بەیت گوتارێکە بۆ خەڵکانی تایبەتیش، لەسـەر ئـەم بنەمایـە، کەسـەکە پێویسـتە بـە چاوێکی پڕ مەعریفەوە سەیری ئەم دەربڕینانە بکات. بە گومانی طباطبائی ، پشت نەبەستنی مەجلیسـی بـە فەلسـەفە و فەیلەسـوفان بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەو لـە هەنـدێك لـە قوڵترین و بـالاّترین دەقـە ئیسـلامییەکان مانـای ڕوکـەش و نادروست دەربهێنێت..

ئـەم بابەتـە لـە مەسـەلەی "متشـابهات"دا ڕۆشـنتر دەردەکـەوێت. هـەروەکو لـە ئایـەتی 5 سـورەی (ال عمـران)دا هـاتووە، ئایەتـەکانی قورئـان بـە دوو پـۆلی گـەورە پۆلبەنـدی کـراون: "محکمـات" و "متشـابهات"، محکمـات تایبەتـە بـەو ئایەتانـەی کـە ماناکانیـان ڕۆشـن و بەڵگەنەویسـتە، متشـابهات تایبەتـە بـەو ئایەتانـەی کـە ماناکانیـان لێـڵ و ناڕۆشـنە. هـیچ ئایەتێك بە ئەندازەی ئەم ئایەتە نەبۆتە جێگـەی گفتوگۆ و دروست بوونی ڕای جیاواز لەسەری. بـە شـێوەیەکی گشـتی، گفتوگـۆی ڕاڤـەکاران لـە

دەوری دوو خاڵی بنەڕەتی دەسوڕێنەوە: یەکەم: بریتیـە لـەوەی کـە مانـای ووردی (دەقیقـی) ئـەم چەمکانە چییە؟

دووەم: بریتیە لەوەی کە ئامانج و نهێنی لە "ناڕۆشـن"بـوونی ئـەم ئایەتانـە چـین کـە بـۆ پێغەمبەر هاتوون.

دەربارەی خاڵی یەکەم: هەندێك وا بەڵگەیان بـۆ ئـەم بابەتـە هێناوەتـەوە کـە تـەنها پیتـە پچڕپچـڕەکان (بـۆ نمونـە یـس، طـە) کـە لـە سـەرەتای هەنـدێك لـە سـوورەتەکاندا هـاتوون متشـابهن و باقیـاتی ئایەتـەکانی دیکـە سـەر بـە بەشی محکماتن. هەندێك پێیان وایە هەموو ئەو ئایەتانەی کە باس لە ئاخیرەت و سیفەتەکانی خـوای گـەورە دەکـەن سـەر بـە متشـابهن، هەنـدێکی دیکـەش پێیـان وایـە تـەنها ئـەو ئایەتانـەی پەیوەسـتن بـە ڕێسـاو سـروتە کردەییەکانەوە سەر بە محکماتن. هەروەها ئەو ئایەتانـەی کـە منسـوخن (نەسـخکراون) بـە متشـابهات زانـراون. بـە کـورتی لـەم بابەتـەدا دەتوانرێـت چـەندین ڕاوبۆچـوونی جیـاواز دەست بکەوێت..

بەلاّم دەربارەی خاڵی دووەم: واتە بۆچی ئەم جـۆرە ئایەتـە ناڕۆشـنانە لـە قورئانـدا بوونیـان هەیـە، لەگـەڵ چـەندین گریمانـەی سەرسوڕهێنەردا ڕووبەڕوودەبینـەوە، ئەمانـەش چەند نمونەیەکن لەو گریمانانە:

1-متشابهات دابەزیوە بۆ ئـەوەی ئیمانـداران لـە کـافران جیابکاتـەوە، ئیمـان تـەنها لـە شـێوەیەکی پەرستشـییانەدا دەتوانێـت بـوونی ببێت، ئیمانداری ڕاستەقینە تەواوی ئایەتەکانی قورئانی قبوڵە لەگەڵ ئەوەی بەشێك لەم ئایەتانە

مانای رۆشن نابەخشن بەڵام کافران پشت بە عەقڵی خۆیان دەبەستن و مانای ناڕۆشن و بێ بەڵگەیان پێ قبوڵناکرێت..

2-متشابهات ئامرازێکن بۆ وورووژاندن و پەروەردەکردنی عەقڵ، عەقڵێک لەلای پەروەردگار زۆر عەزیز و خۆشەویستە، ئەمەیە نهێنی ئەو ئایەتانەو ئەو پێویستییەی ئیمانداران هەیانە بەو ئایەتانە.

3-متشابهات دڵە نەخۆشەکان بەجۆرێك بەرەو قورئان ڕادەکێشێت تاوەکو بتوانن مەبەستە شەیتانی و خراپەکانیان لە ڕێگەی ئەو ئایەتانەوە بهێننە دی، واتە لەبەرئەوەی متشابهن، هەر ڕاڤەیەك بیانهەوێت دەیسەپێنن بەسەر ئایەتەکاندا، بەڵام هەندێك جار ئەم کارە دەتوانێت ئەوان بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنموێنی بکات. لەمەش زیاتر ئەوان بە خوێندنەوەی هەموو قورئان (ئایەتە محکم و متشابهەکان) دڵیان ڕۆشن دەبێتەوە.

4-گوتاری دینی و سروش "وەحی" بۆ هەموو مرۆڤەکانە (بە زانا و خەڵکی عەوامیشەوە) لەبەرئەوە دەبێت بەشێك لە بیرۆکە زۆر باڵاکان دابەزنە خوارەوە و لە چوارچێوەی زمانێکی زۆر سادەدا دەربڕێن تا مرۆڤەکان توانای دەرککردنیان هەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە حەقیقەت و گوزارەکان لە چوارچێوەی بنەڕەتی خۆیان دەربچن و شێوەی خۆیان لە دەست بدەن. متشابهات ئەو ئایەتانەن کە لەواندا زمان، بە هۆی گەورەیی میوان و بچوکی میوانخانەوە (بە گوتەی مەولانای ڕۆمی)، لە ژێر فشارێکی زۆردایە.. بەم شێوەیە دەبینین، هیچ کام لەم دیدگایانەی باسکران، لە ڕاستیدا پێویستییەکانی ڕاڤەکردنی دەقیان لەبەرچاو نەگرتووەو لەبەرئەوە هەموویان ئەم خاڵە گرنگەیان پشتگوێ خستووە کە هەبوونی متشابهات لە قورئاندا خواستی سروشتی تێگەیشتن لە دەقە و لە زەمینە و چوار چێوەی ڕاڤەکردنەوە سەرچاوەی گرتووە (واتە دەقێك ڕاڤە نەکرابێت، محکم و متشابیهیشی نابێت و لە چوار چێوەی ڕاڤەکردندایە کە ئەم دوو چمکە لەدایك دەبن). بوونی ئەم ئایەتانەش لە قورئاندا هیچ پەیوەندییەکی بە تاقیکردنەوەی کافران و جگە لەوانەوە نییە (کارێك نییە بە مەبەستەوە کرابێت). هەر لەم ڕووەوەیە کە بوونی متشابهات بە ڕەهایی تایبەت نییە بە قورئانەوە، تەواوی دەقەکان بە تایبەتی دەقە ئاسمانییەکان، لە هەناوی خۆیاندا محکمات و متشابهاتیشیان هەڵگرتووە. بوونی متشابهات هەم هۆکار و هەم دەرەنجامی کشان و چونەوەیەکی مەعریفەی ئاینییە. کاتێك بە ووردی سەرنجبدەینە پرۆسەی تێگەیشتنی دەق (کە هەمیشە شوێنکەوتەی پێشگریمانەیەك لە پێشگریمانەکانە) مانا و بەڵگەی بوونی متشابهات لە قورئاندا تێدەگەین. زۆر جێگەی سەرنجە کە قورئان هیچ سەرەداوێکمان ناداتێ کە تێبگەین چۆن دەکرێت متشابهات ئاشکراکەین و لە تەواوی ئایەتەکانی دیکەی جیابکەینەوە. تەواوی مێژووی ئیسلامی بە ئاشکرا دەریدەخات لە ڕاستیدا تەواوی ئایەتەکانی قورئان لە باوەشی متشابهبوونەوە هاتوونەتە دەرەوە. هەمان ئەم شتەش پشتگیریکەری ئەو بانگەشەیەیە کە بوونی متشابهات سەرچاوەی گرتووە لە ماهیەتی

ڕاڤــــەکردن و هـــــەروەها جـــــۆری ئـــــەو پێشـــگریمانانەی کـــە ڕاڤـــەکار لـــە پێشـــتردا قبوڵی کردوون.

نمونەیـەکی دیکـە، لەوانـەش پێشـگریمانە نازمانییـەکان کـە دەتـوانین بیهێنینـەوە: جـۆری چــاوەڕوانییەکانی مرۆڤــە لــە دیــن: مــرۆڤ چاوەڕوانی ئەوەیە کە کام لە چاوەڕوانییەکانی دیــن. بــۆی بهێنێتــەدی؟ ئــەم پرســیارەش پێشینەیەکی لە مێژی هەیە. لە ڕاستیدا ڕیشەی ئـەم پرسـیارە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو پرسـیارە کەلامییـە گـرنگ و بـیرو ورووژێنـەرەی کـە ئایـا بەڵگـەی پێویسـتی مرۆڤایـەتی بـە پێغەمبـەران چـییە؟ ڕۆشـنە کـە ئـەم پرسـیارە پرسـیارێکی دەرەدینیـە و وەڵامـی مرۆڤـە کـە بـەم پرسـیارە کاریگـــەری ســـەد دەرســـەد لەســـەر شـــێوەی ڕاڤەکردنی ئەم بۆ دەق دادەنێت..

بەشـێك لـە کەلامناسـەکان باوەڕیـان وایـە کـە مــرۆڤ (چ خــۆی وەکــو تــاك یــاخود لــە نــاو کۆمەڵگەدا) ناتوانێت بەبێ ڕێنـوێنی پێغەمبـەران بـە ژیـانێکی بەختەوەرانـە بگـات. لەسـەر ئـەم بنەمایـە، کەلامناســەکان لــە دیــن چــاوەڕوانی ئــەوەیان هەیــە کــە بــە مرۆڤــەکان: شــێوازی پاکژکردنـــەوەی ڕوح (تزکیـــە) و پەرستشــــی پەروەردگاریان فێربکەن و هـەم ڕێگـا و شـێوازی دروســــتی هاوســــەرگیری و خۆشــــۆرین و پـــــاکڕاگرتن و خـــــواردن و مامەڵـــــەکردن و بـەکرێگرتنی خـانوو و قـەرزدان و لێپرسـینەوەی تاوانباران و لەمانەش زیاتر فەرمانڕەوایی کـردن بەسـەر وڵاتـدا فێربکـەن. ئـەم چـاوەڕوانییانە وا لەکەســـــەکە دەکـــــات کــــــە بــــــەووردی و وەسوەســـەیەکی زۆرەوە ســـەرنجی دەق بـــدات

نـەوەکو بچـوکترین خاڵێـك کـە پەیوەنـدی بـە چاوەڕوانییەکانی ئەوەوە هەیە پشتگوێ بخرێت و لەبەرچــاو نــەگیرێت. ئــەم کەســە تــەواوی ئاماژەکان بەجدی وەردەگرێت، لە هەناوی ئەم ئاماژانەشدا بینایـەکی گـەورە بەرهـەم دەهێنێت، ئـەم تێگەیشـتنە لــە دەق ئـەمڕۆ دیدگایــەکی باڵادەستە لە جیهانی ئیسلامدا.

بــەڵام هەنــدێکی دیکــە لــە کەلامناســەکان بـەجۆرێکی جیـاوازتر بیردەکەنـەوە، لــە دیـدی ئەوانـــەوە، نـــاوەرۆکی ســـروش (وەحـــی) *Revelation* دەبێـــت بـــە دوو بەشـــەوە: بابەتـــە بنەڕەتییـــەکان (ثوابـــت *Essentials*) و بابەتـــە لاوەکییـــەکان (عرضـیات *Accidentals*)، بابەتـە لاوەکییـــەکان بـــریتین لــــە پێویســـتییەکانی بارودۆخی کلتوری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی لە ســـەردەمی دابـــەزینی پـــەیامی وەحیـــدا. بـــە دەربڕینێکـــی گشـــتگیر: بابەتـــە یـــاخود شـــتە لاوەکییـــەکان دەبێـــت لــــە دەرەوەی بازنــــەی چــاوەڕوانیە ڕاسـتەقینەکانی ئێمــە لــە ئـاین ڕەچـاوبکرێن، بـۆ نمونـە زۆر فـەرمودە هـەن دەگەڕێنەوە بۆ پێغەمبەر کە باس لە چارەسەری هەندێك نەخۆشی دەکەن، بەڵام هیچ کـەس ئەم شتانە وەکو شتە یاخود بابەتە بنەڕەتییـەکانی ئیســـلام ســـەیریان ناکـــات چـــونکە زانســـتی پزیشـکی لـەو بابەتانـە نییـە وا لـە خـەڵك بکـات پێویستیان بە پێغەمبـەران بێـت. خـەڵکی خۆیـان دەتوانن ڕاستییەکانی پەیوەست بە نەخۆشی و شێوازی چارەسەرکردنیان بدۆزنـەوە لـە ڕێگـەی هەوڵـدان (ئـەزمونکردن) و هەڵـەوە ( *Trial and Errors*). ئەگەر وا بێ، باشە لە بارەی فەلسـەفەو ئـابوری و سیاســەت و هاوشـێوەکانیەوە چــی

بڵـێین؟ ئایـا ئـەم جـۆرە بابەتانـە لـە دەرەوەی بازنـــەی پـــەیامی ڕەســـەن و ڕاســـتەقینەی پێغەمبەرانـــە؟ لـــە ئێســـتادا دەربـــارەی ئـــەم پرسـیارانە لێکۆڵینـەوەو گفتوگـۆی گـەرم لـەناو بیریـار و ڕۆشـنبیرانی موسـڵماندا هەیـە. واتـە کـەمتر دەربـارەی ئـەم پرسـە دەرە – دەقییـە texuality–extra باسکراوە کـە چاوەڕوانیەکانی ئێمـە لـە دیـن چییە؟ ئـەم پرسـە ناتوانرێـت بـە گەڕانـەوەی ڕاسـتەوخۆ بـۆ کیتـاب و سـووننەت یـاخود بـۆ ڕاسـتییە مێژووییـەکان چارەسـەر بکرێـت، بـە پێچـەوانەوە، کیتـاب و سـووننەت پێویسـتە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم چاوەڕوانیانەدا ڕاڤە بکرێن.

بـۆ وەڵامـی ئـەم پرسـیارانەی سـەرەوە، پێویسـتمان بـە خوێندنـەوەو لێکۆڵینەوەیـەکی باشـی فەلسـەفە و سیاسـەت و کۆمەڵناسـی و مێژوو هەیە، هەمان ئەم بابەتانەشن کە ڕەنگ و بـۆی سـەردەم بـەم چاوەڕوانییانەو مەعریفـەی دیـنی دەبەخشـن. هـەروەها بـەم شـێوەیە تێدەگەین کـە بۆچی ئیجتیهادی ڕاستەقینە لـە بوارەکـانی فقهـدا ڕوونـادات ئەگـەر پێشـتر ئیجتیهادی ڕاستەقینە لـە بنەما بنەڕەتییەکانـدا نـەکرابێت. ئەمـەش ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات کـە بۆچـی لـە سـەدەکانی دواتـردا، فقهـی ئـاینی لـە بەشـەکانی زانسـتی دینیـدا ئەوەنـدە سسـت و ناچـالاك بـووە، لەبەرئـەوەی فقـە زانسـتێکی بەکاربـەرە، ئـەم سسـت بوونـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سست بوونی بوارەکانی دیکە کە بەرهـەم هێنن وەکـو ئـابوری و فەلسـەفە و سیاسـەت و ئیلاهیاتناسی و مێژوو، ئەمانە بریتین لە دەلیلە Reasons پەیوەندیـدارەکانی ئـەو سسـت بوونـە، بێگومـان هۆکاریش بوونی هەیە بەڵام باسێکی دیکەیـە. ئێسـتا باشـتر دەتوانرێـت چـەمك و پێگـەی نوێبوونـەوە revivalism و ڕۆشـنبیری intellectualism ئایینی لێی بڕوانین و تێبگەین.

بە گشـتی نوێبوونـەوە یـاخود ژیاندنـەوە لـە دوو شـــێوازدا دەردەکـــەوێت: پـــۆزەتیڤ و نێگـەتیڤ. نوێبونـەوەی نێگـەتێڤ بریتیـە لـە پاککردنـــەوە و پوخـــت کردنـــی تێگەیشـــتنی واقعیانـەی ئـاین لـە پێکهاتـە نامۆکـان و مـاف بـدرێت بـە ڕەهەنـدە زیـاتر پشـتگوێخراوەکانی ئایین، بێگومان پاڵەوانی ئەم مەیدانە غەزالییە. بـــە پێچـــەوانەوە، نوێبونـــەوەی پـــۆزەتیڤ هەســـتیارترە بـــە شـــێوەیەکی ســـەرەکی پەیوەندیدارە بـەو هۆکـار و بنـەما نائاینییانـەی کە پێویستن بۆ لێکدانەوەیـەکی سـەردەمیانەی دەق، زەقترین نمونەی ئەم ئاڕاستەیە بریتیـە لـە ئیقبـال لاهـوری، گـرنگترین بۆشـاییەك لـە ڕۆژگاری خۆیدا کاری لەسەر دەکرد بریتیبوو لە زاڵبـــوونی فکـــری یۆنـــانی بەســـەر کلتـــوری ئیسلامیدا. بێگومـان هـەردووکیان (پـۆزەتیڤ و نێگەتیڤ) خزمەتی هـەمان مەبەستیان کردووە، ئـەویش بریتییـە لـە زینـدو ڕاگـرتنی پـەیامی ئـایین، بـەڵام جیاوازییەکـەیان ئەوەیـە، لـە نوێبونـەوەی نێگەتیڤدا: دیدگایـەکی لـۆژیکی – مـەعریفی بۆ دین دیدگایـەکی پلەیـەك بـووە، لـە پۆزەتیڤدا: دیدگایەکی لـۆژیکی – مـەعریفی پلـە دوو بووە.

لێـرەوە، بـە لەبەرچـاوگرتنی ئـەو باسـەی سـەرەوە، کۆتـایم هێنـا بـە باسـەکەم دەربـارەی پرسیاری یەکەم. بەڵام پێش بەجێهێشتنی ئەم مەســەلەیە حەزدەکــەم جــەخت بکەمــەوە کــە

ڕیفۆرمی ئایینی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سەرکەوتوو نابێت ئەگەر ئاگاداری ئەو پێشکەوتنە نوێیە بەردەوامانە نەبین کە لە هەموو کایە جیاوازەکانی فکردا ڕوودەدات. دروشمگەلێکی وەکو: "گەڕانەوە بۆ ڕیشەکان" یاخود "زیندوکردنەوەی سەرچاوە پشتگوێ خراوەکان" یاخود "دۆزینەوەی ڕابەرێکی کارامەی چاونەترس" زۆر و وێڵکەرن. ڕیفۆرم *Reform* ڕوونادات بێ گۆڕانکاری لە پێشگریمانە سوونەتییەکاندا. هەروەها گۆڕانکاری ڕوونادات ئەگەر ئێمە بە تەواوی و لێهاتووییەوە ئاشنانەبین بە ئایین و بیرۆکە تازە گەشەکردووەکانی دەرەوەی بازنەی سروش (وەحی). ڕاستییە دۆزراوەکان لە ناوەوە و دەرەوەی دیندا، زووتر یاخود درەنگتر، دەگەنە بارێکی هاوسەنگ لەگەڵ یەکتردا. بۆئەوەی ئەو مەنگ بوونەی ناو ئایین بشڵەقێنین، پێویستە سەرچاوە دەرەدینییەکان بجوڵێنین و چالاك کەین. ئەو تێگەیشتنە دواکەوتوەی موسڵمانان لەبارەی سەرچاوە پیرۆزەکانیانەوە بریتیە لە دەرەنجامێکی ئەو دابەزینەی کە لە کەشی گشتی کلتوری و کۆمەڵایەتی و شارستانیەتی موسڵماناندا ڕوویداوە نەك بە پێچەوانەوە.

2–2: ئێستا لەبارەی باسی دووەمەوە قسە دەکەین: ئەویش گوایا پیرۆزی دەق و پەیامی نەمری دەق ببێتە قوربانی لەبەردەم وەهمەکانی سەردەمدا و لەدەستدانی یەقینی ئیمانی. پێم باشە بە دیالۆگێکی کورت دەست پێبکەم کە لە نێوان خۆم و هاوڕێیەکەمدا لەم ماوەی پێشوودا ڕووی دا. زۆر بەجدی ئەم پرسیارەی لێکردم: "بۆچوونی تۆ لەبارەی بەئیسلامکردنی زانستەوە چییە؟ پاشانیش بە شێوەیەکی گاڵتە ئامێزانە درێژەی پێدا. "لەوانەیە تۆ فەزڵی بە زانستکردنی ئیسلام بدەیت بەسەر فەزڵی بەئیسلامکردنی زانستدا؟ وەڵامدایەوە: "هیچ کام لەم دووانە، من بە مرۆیی کردنی *Humanization* ئایینم بەلاوە پەسەندە" ئەمە وەڵامی من بوو، لە ڕاستیشدا ئەوە ئەو بنەما بنەڕەتییەیە کە سەرجەم بونیادی "کشان و چونەوەیەکی تیۆریانەی شەریعەتی" لەسەر بنیات نراوە.

بێگومان ناشێت ئاینی بەوەحی نێردراو دیاردەیەکی مرۆیی بێت. بەڵام زانستی ئاین تەواو بەرهەمێکی مرۆییەو پێکهاتەیەکی مرۆیی هەیە. ئاین بە مرۆیی دەکرێت لەو ڕوانگەوەی کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری سیفاتە باڵاو نزمەکانی مرۆڤەوە، واتە مرۆڤ ڕەنگی سیفاتەکانی خۆی بە مەعریفەی دینی دەبەخشێت، نمونەی ئەم سیفاتانەش: عەقلانیەت و کینە و خۆویستی و حەقیقەت ویستی و بێ ئاگایی و چاوچنۆکی و لایەنداری و لەخۆ ڕازیبوون و گوێ پێنەدان و دەمارگیری و ماڵویستی و هاوشێوەکانیان، هەموویان کاریگەریان هەیە لەسەر زانستی ئایین و کاردەکەنە سەری لە شێوەی جۆراوجۆردا. ڕاستە سروش شتێکی خودایە، بەڵام ئایا ڕاڤەکردنی سروش شتێکی خودایە؟ گومانی تێدانییە، ڕاڤە دەشێت گوماناوی، هەڵەخواز، گۆڕان خواز بێت، شایانی گوناه بێت، لایەنداربێت، تاك لایەن بێت، لارو لەوێر بێت، قیناوی بێت، وابەستەی کلتور بێت، ناتەواو بێت، بەڵام ئەمە خودی نێرەری سروش

وایکـردووه کـەوا بێـت. ئێمـە مـرۆڤین شـایانی گوناهکردنین و ئەوە بەشی ئێمەیە لە حەقیقەت. هـیچ زانسـتێکی مرۆیـی نییـە مقـدس بێـت، زانستی ئاینیش لەمە بەدەرنییە. بـەڵام بێگومـان خـودی سـروش جیـاوازە. لەبەرئـەوە پێویسـتە جوداکردنەوەی سروش لە راڤەکردن (وەحـی لـە تەفسیر) بـەردەوام ڕەچـاوبکرێت. هـەمووماند لـە ئۆقیانووسـی تەفسـیرەکاندا نقـوم بـووین و هەرکاتێك کەسێك هەوڵبدات تەفسیرێکی ڕاستی دەق پێشـکەش بکـات، زۆر خـۆی سـەرقاڵ دەکـات و قوڵدەبێتـەوە لـەو ئۆقیانووسـەدا. کەشـف کردنـی نیـەتی ڕاسـتەقینەی نێـرەری سروش ئـەو ئامانجەیە کە هـەمووماندا بەیەکەوە بەرەو لای دەجووڵێین بەڵام لە کۆتاییدا لەوانەیە بگەینـە ئـەوەی کـە نیـەتی ڕاستەقینەی سـروش نێـر هـیچ نـەبوو جگـە لـە هـەوڵێکی کـۆیی مرۆڤایـەتی خـۆی. لێـرەدا کـردار و ئامـانجی کردار دەبن بەیەك..

ئەمەش مانای ئەوە نییە کە مقدس (پیرۆزی) لـە پـیرۆزی بخـەین یـاخود ئـایین سـێکولاریزە بکـەین، ئـەوە نمونەیـەکی سـادەو لـە هـەمان کاتیشدا نمونەیەکی ئاڵۆزی بە سروشت کردنی بابـەتێکی سـەروو سروشـتییە *Supernatural* یـاخود ئەگـەر پێت باشـە، ئـەوە دەرکەوتەیـەکی سـەروو سروشـتییە وەکـو شـتێکی سروشـتی. دیدگای سێکولار دیدگایەکی کوێرە لە بەرامبەر سـەروو سروشـتدا، بـەڵام ئێمـە لێـرەدا لـە تەفسیر و تێـڕوانینی مـرۆڤ دەڕوانـین هـەروەکو ئـەوەی جـارێکی تـر وەحـی دابـەزیبێت لـە ئاسمانی دەقەوە بۆ زەمینی ڕاڤەکردن لە ڕێگەی فریشتەی عەقڵی سەردەمەوە، ئەمە دوای ئەوەی

کە وەحی هات و دابەزی بۆ پێغەمبەر لـە یەکەم جاردا. بە دەربڕینێکی تـر، ئێمە سـەیری وەحی دەکەین لە پەنجەرەی تەفسیرەوە هـەروەکو چۆن زانایـەکی ئیمانـدار سـەیری سروشـت دەکـات وەکـو دروسـتکراوێکی خـوای گـەورە. گەرچـی ئێمە لـە بارەی گەشەکردنێکی تەواوکارییانەوە *Progress* دڵنیـانین، بـەڵام پەرەسـەندن *evolution* بە دڵنیایی جێگای متمانەیە و ڕوویداوە.

ئێستا لە دیدێکی مەعریفەناسییەوە، ئیمان *Faith* وەکو ملکەچییەکی تـەواو سـەیر دەکرێت لەلای ئیماندار بۆ ئەوەی ووشـەی خـودا بەجدی بگرێـت و بـە دڵسـۆزی و بـە بـەردەوامی ڕاڤـەی بکـات بۆئـەوەی ڕێبەرییـەکی گشـتی لـە ژیانیـدا بەدەست بهێنێـت (پـێش مـردن و پـاش مـردن). ئیمان ئەو شتەیە کە باوەڕدارێك لـە بێ باوەڕێك جیادەکاتەوە. ئیمـان هەمیشە شـتێکی کەسـی و تایبەتییـە، دەشـێت زیـاد و کـەم بکـات، بـەڵام مەعریفـە جیـاوازە لـە ئیمـان، مەعریفـە کـۆیی و گشتییە و شایانی هەڵەیە..

ڕوانینێکـی بـاڵاتر بـۆ ڕەوتـی مێـژوویی مەعریفـە پێماندەڵێت کـە سـەرەڕای عەقیـدەی جـێگیری تـاك تـاکی ئیمانـداران لـە تەفسیرکردنیاندا بـۆ وەحـی، وە بـەبێ گوێدانـە خواسـت و ئیمانـە تاکـە کەسییەکان، کـاروانی مەعریفـە ئـاخنراوە بـە هـەموو جۆرەکـانی ئـاڵۆزی و دژیەکییـەکان بـەڵام ڕێچـکەی خـۆی بڕیـوەو بـەرەو پـێش چـووەو لەسـەر مشـتومڕەکان و کێبـەرکێکان و هاوکارییـەکانی ئەندامـەکانی ژیـاوە. چـارەنووسمان هـیچ نییـە جگـە لـە ئومێدخواسـتن، ئەمـەش ئەوەیـە کـە مەولانای ڕۆمی بە ئێمەی دەڵێت:

بازرگانی ترسنۆك و سروشت شووشەییە
لە خواستیدا، نە قازانج دەکات و نە زەرەر
نا، زەرەر دەکات چونکە بێ بەش و نەگریسە
کەسێك نوری دەست دەکەوێت کە نور ویستە
هەموو کاروبارەکان لەسەر ئومێد بەندن
بەنرخترینیان کاروبارەکانی ئایینن
بەبێ ئومێد فەرماننەدراوە بە لەدەرگادان
خودا خۆی زانایە بە سەرەنجامی کارەکان(7)

کاتێك لەم مانایە تێگەیشتین، ڕێگای دیموکراسی دینی و یەکیەتی باڵای دینەکان کە لەسەر فرەگەری *pluralism* ئاینی پشت دەبەستێت ڕێگای بۆ خۆش دەکرێت. ئەمەش بریتییە لە دوو میوەی ئەو درەختە بەردارە.

خوای گەورە دەفەرموێت: "ئایا نەتانبینیوەو نەتانزانیوە کە خوای گەورە چۆن نمونە دەهێنێتەوە بە گوفتاری چاکە کە وەکو درەختێکی چاك و پاك وایە کە ڕەگەکانی لە زەویدا داکوتاوەو لقەکانیشی لە ئاسماندا بڵاوبونەتەوە، ئەو درەختە هەمووکات و دەمێك بەروبومی چاك دەگرێت بە فرمانی خوای گەورە.."(8).

## پەراوێزەکان

1-ئەم وتارە بە ناونیشانی "*text in context*" لە زانکۆی مك گیل، لە بەشی لێکۆڵینەوە ئیسلامییەکان لە ساڵی 1995 دا پێشکەشکراوە. ئەم ووتارە ساڵی 1996 وەرگێڕدراوە بۆ زمانی ئەڵمانی لە گۆڤاری *Die Zeit* و بۆ زمانی فەرەنسی ساڵی 1996 لە گۆڤاری *Courier* بڵاوکراوەتەوە. ساڵی 1997 لەلایەن د. ئەحمەد نەڕاقییەوە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی فارسی و لە گۆڤاری کیاندا، ژمارە 38 بڵاوکراوەتەوە.

2-چونەوەیەك و کشانی تیۆریانەی شەریعەت: یەکێکە لە تیۆریا گەورە و گرنگەکانی د. عبدالکریم سروش، بگرە شاکاری هەرە گەورەی د. سروشە لەبارەی مەعریفەی ئایینیەوە لە چوارچێوەی کتێبێکدا چاپ کراوە (وەرگێڕی کوردی)

3-صورت یاخود شێوە، مادە یاخود جەوهەر: دوو زاراوەن لە یۆنانی کۆندا بەکارهاتوون بۆ وەسف کردنی پێکهاتەی جەستە، مادە بریتییە لە جەوهەری یاخود ڕوحی هەر صورەتێك (شێوەیەك)، واتە ئەو پێکهاتە جەوهەرییەیە کە لە پێکهاتەی هەر مەوجودێکدایە بەڵام لە شێوەی جیاوازدا دەردەکەوێتەوە، سەدرەدین شیرازی یاخود مەلاسەدرا پێی وایە دوای مردن، ئەوە "صورەتە" زیندوو دەبێتەوە، واتە صورت توخمی بنەڕەتی شوناسی شتەکانە (وەرگێڕی کوردی).

4-پێشەکی تەفسیری المیزان لا 7.

5-هەمان سەرچاوە.

6-مەسنەوی مەعنەوی، دەفتەری سێهەم، بەیتەکانی 2517، 2520 و 2525.

7-مەسنەوی مەعنەوی، دەفتەری سێهەم، بەیتەکانی 3089-3092.

8-سورەتی ابراهیم ئایەتی 24-25.

## سەرچاوە

www.drsoroush.com

# ئایینو سیاسەت لە کایەی ئیسلامیدا*

هاشم سالّح

لە عەرەبیەوە: شوان ئەحمەد

(ئـاییـنو سیاسـەت لـە کایـەی ئیسـلامیدا) کتێبێکـی گرنگـی توێـژەری تونسـی "محەمـەد شەریف فرجانی"یەو باس لە کێشەیەك دەکات کـە لـە ئێسـتادا دنیـای بـە خۆیـەوە خـەریك کـردووە، ئـەویش کێشـەی پەیوەنـدی نێـوان ئـایینو سیاسـەتە لـە ئیسـلامدا. لـەم کتێبـەدا نوسـەر کۆ لەوەناکاتـەوە پرسیارگەلێکی تونـدو دژوار بورژێنێـت، وەك ئـەوەی ئایـا ئیسـلام ئایینێکی شەڕانگێزە، وەکی ئەوەی میدیاکانی خۆرئـاوا لـە دوای 11 سـێپتەمبەرەوە باسـی لێدەکـەن؟ ئایـا بەڕاسـت ئیسـلام لـە تـەواوی ئایینـەکانی دی جیـاوازترە، وەك ئـەوەی "بێرنـارد لـویس"و زۆرێـك لـە توێـژەرانو خۆرهەلاّتناسـانو رۆژنامەنوسـانی خۆرئـاوا باسی لێدەکەن؟ ئایا بەڕاست ئیسلام رێگە بە جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت نادات، وەکی ئـەوەی مەسـیحیەت لـە سـەرەتادا کـردی؟ بـە مانەیـەکی دی: ئایـا ئیسـلام لـە جەوهـەردا ئایینێکـە دژی عەلمانییـەتو ئازادیـە، بـەلاّم مەسیحیەت ئایینێکە ئەو کێشەیەی نییەو رێگە بـە عەلمانییـەت دەدات؟ وردتـر بلـێین: ئایـا ئیسـلام ئـایینی دواکـەوتوییو نـەفامیو دەمارگیرییـەو مەسـیحیەتیش ئـایینی پێشکەوتنو شارستانیەتو لێکبوردنە؟ ئەمانـە ئـەو پرسـیارانەن کـە "د. محەمـەد شـەریف فرجـانی" لـەم کتێبـەدا دەیانکـاتو زۆر بوێرانەش وەلاّمیان دەداتەوە.

ئـەو لـەم مەسـەلەیەدا بەگـژ دوو بـەرەدا دەچێتەوە: بەرەی خۆرهەلاّتناسە تەقلیدیـەکان لـە پـێش هەمووشـیانەوە "بێرنـارد لـویس". لەگـەلّ بـەرەی فێندەمێنتالیسـتە ئیسـلامیەکان. ئەم دوو ئاقارە ئەگەرچی دوژمن بەیەکن، بەلاّم لـە هەنـدێ شـتدا کـە تایبەتـە بەئیسـلام یەکدەگرنەوەو بە هەردووکیان ئەو بڕیارە باوو پێشوەختانە تۆخدەکەنەوە، کە لە خۆرهەلاّتو خۆرئـاوادا سـەبارەت بـە ئیسـلام لـە ئارادایـە. یەکەم شتیش کە لە سەری کۆکن ئەو تێزەیە کە دەلّێت: (ئیسلام ئـایینو سیاسـەتەو ئـەم وەکـی

مەسیحیەت ئەو دووکایە لە یەکدی جیاناکاتەوە). ئەم مەسەلەیە ئیخوان موسلمین تەئکیدی لێدەکەنەوەو تەئکیدکردنەوەکەشیان هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەوەدا نییە کە "بێرنارد لویس" دەیڵێت. تەنها جیاوازییەکیان ئەوەیە "بێرنارد لویس" ئەمە بە نیشانەی دواکەوتویی شارستانی دادەنێت، لە کاتێکدا ئیخوانەکان بە نیشانەی بالأدەستی بوونی ئیسلامی دەزانن بە سەر تەواوی ئایینەکانی دیکەدا !..

سەرجەم بەشەکانی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ هەڵوەشاندنەوەو بەرپەرچدانەوەی ئەم تێزەیە. گرنگی کتێبەکەش لە مەدایە ووروژاندنی ئەو مەسەلەیەش تەواو لە کاتی خۆیدایەتی. راستیەکەی ئەم تێزەیە لە خۆرهەلأتو خۆرئاوادا ئەوەندە بۆتە باو، خەریکە دەبێتە حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر. لە بۆچونی کۆی ئەو کەسانەدا، ئیسلام ئایینێکی تۆتالیتاری گشتگیرەو هەرگیز رێ بەوەنادات کایەی ئایین لە کایەی سیاسەت جیابکرێتەوە. تەنانەت خۆرهەلأتناسێکی مارکسیستو پێشکەوتوخوازی وەك "مەکسیم رۆدنسۆن"، کەوتە ژێر کاریگەری تێزەکەی "بێرنارد لویس" سەبارەت بە ئیسلامو ئەویش پێیوایە ئیسلام جیاواز لە ئاییینەکانی دیکەی وەك یەهودیو مەسیحی، رێگە بە جیاکردنەوە ئایین لە سیاسەت نادات و ناهێڵێت کێشە تیولۆژیەکان لە کێشە سیاسەیەکان دابڕێت.

ئەم بۆچونانە هەرچی دەرگایە لە سەرمانی دادەخەنو بواری دەرچونمان نادەنێ. کەواتە چی بکەین؟ بە بۆچونی نوسەر بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتە پێویستە سەیری مێژوو بکەین، مێژووی ئیسلامی لە خۆرهەلأتو مێژووی مەسیحی لە خۆرئاوا. ئەوکات بۆمان دەردەکەوێت کە مەسیحیەت لەناو ئەو کۆمەڵگایانەی تیایاندا دەسەلأتداربووە ، هەمان ئەو شتانەی کردووە کە ئیسلام کردویەتی. واتە عەلمانییەتی قبوڵ نەبووەو رازی نەبووە بەوەی کڵێسا لە دەوڵەت جیابکرێتەوە، تەنها دوای زنجیرەیەك شەڕوشۆڕی فیکریو سیاسیو سەربازی زۆر نەبێت. کەواتە ئەم مەسەلەیە هەر ئیسلام ناگرێتەوەو تایبەت نییە بەو. بۆیە لێرەدا تێزەکانی "بێرنارد لویس"و ئیخوان موسلمین، خۆ بەخۆ هەرەس دێننو راستگۆیی خۆیان لە دەست دەدەن!

هۆکاری دواکەوتویی ئێستای کۆمەڵگە ئیسلامیەکانیش ناگەڕێتەوە بۆ ئایین، بەڵکو پەیوەندی بەخراپ تێگەیشتنی ئایینەوە هەیە، بەتایبەت ئەو تێگەیشتنە تۆتالیتاریە-دۆگماتیستەی بالأدەستە. با بەوردی سەرنجی مێژوو بدەینو ببینین. راستە ئینجیل دەڵێت: (ئەوەی هی قەیسەرە بیدە بە قەیسەرو ئەوەی هی یەزدانە بیدەرە یەزدان)، بەلأم ئەمە رێی لە مەسیحیەت نەگرت کاتێك هەلی بۆ رەخسا، دەسەلأتی سیاسی بگرێتە دەست، بە تایبەت کاتێك ئیمپراتۆری رۆمانی "قەستەنتینی گەورە" لە ساڵی 330 ز، باوەڕی پێهێناو کردیە ئایینی رەسمی ئیمپراتۆریاکەی. لە دوای خۆیشیو لە سەردەمی سەرجەم پاشاو ئیمپراتۆرەکاندا هەروەك ئایینی دەوڵەت مایەوە، تەواو وەکی ئیسلام لە سەردەمی خەلیفەو سوڵتانەکاندا، هەر لە سەردەمی

ئەمەوییەکانەوە تا رۆژگاری عوسمانییەکانو بگرە تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان.

مەسیحیەت بەزەبری هێز دەستبەرداری دەسەڵاتی سیاسی بووە، بە تایبەت دوای بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی کە پیاوانی ئایینی لەسەر تەخت لابرد. دەتوانین بڵێین تەنانەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسیو هاتنە ئارای سستمی نوێی کۆماری عەلمانی، لەسەر دارو پەردوی سستمی کۆنی پاشایەتی-کاتۆلیکی، مەسیحیەت هەر لە هەوڵی ئەوەدابوو بەر بەبزاوتی پێشکەوتنو گەشەسەندن بگرێتو ئەو پرۆسەیە پەك بخات. تەنها ئەوکاتە ملکەچی واقیع بوو کە هەستی کرد بەرخوردکردنی بێمانایەو گەر بەردەوام بێتو دژایەتی بزاوتی مێژوو پێشکەوتن بکات، ئەوا هەموو پێگەو دەسکەوتەکانی دەدۆڕێنێت. کەچی دوای هەموو ئەمانە دەڵێن: (مەسیحیەت ئایینی عەلمانییە، یاخود تاکە ئایینێکە کە بوار دەدات بە دەرچوون لە سیستمی تیۆکراتی سەدەکانی ناوەڕاست).

ئەم قسانە سەرلەبەر پێچەوانەی مێژوونو روداوە مێژووییەکان بە درۆیان دەخاتەوە. خۆشبەختانە "محەمەد شەریف فرجانی" لە ناو توێژەرو خۆرهەڵاتناسانی خۆرئاوادا، کەسانێکی هەیە کە لایەنگیری لێدەکەنو لەگەڵ بۆچوونەکانیدا هاوڕان.. لەراستیدا تەواوی خۆرهەڵاتناسان لایەنگری "بێرنارد لویس" نینو بە ئەقڵیەتی ئەو بیرناکەنەوە. لەناو ئەوانەدا دەتوانین ناوی "ئۆلیڤێ کارێ" بێنین کە مامۆستایە لە زانکۆی پاریس. "کارێ" ساڵی 1993 کتێبێکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی (ئیسلامی عەلمانی یاخود گەڕانەوە کەلەپوری مەزنی ئیسلام)و تیایدا بە ئاشکرا خۆی لەو تێزە باوە جیادەکاتەوە کە دەڵێت: (مەسیحیەت هەر لەسەرەتایەوە ئایینێك بووە پەیوەندی بە سیاسەتەوە نەبووە، بەڵکو ئایینێك بووە بەشێوەیەکی ئاشکرا کایەی رۆحی لە کایەی دنیایی جیاکردۆتەوە، بەم پێیەش توانیویەتی زەمینە لەبەردەم هاتنە ئارای عەلمانییەت خۆش بکاتو بوار لەبەردەم ئازادی تاکەکەسی لە کۆمەڵگە ئەوروپییە هاوچەرخەکاندا بڕەخسێنێت. بەڵام هەرچی ئیسلامە ئەوا بە پێچەوانەوە، ئایینێکی تیۆکراتی- دواکەوتووەو تەنها بوار بە دروستبونی سیستمە تۆتالیتاریەکان دەداتو هەرگیز دیموکراسی ناتوانێت لە سایەیدا بژی).

ئەم توێژەرە فەرەنساییە دەڵێت: (ئیسلام وەك ئایین سیانزە ساڵ دوای دەرکەوتنی- واتە دوای گەیشتنی پێغەمبەر بۆ مەدینە- بەسیاسیکرا، پاشان دوای سێ سەدە لە سیاسەت جیابووەوە، تابەم دواییانەو لەسەر دەستی ئیخوان موسلمینو ئەو بزاوتە جیهادیانەی دوای ئەوان هاتن تێکەڵ بە سیاسەت کرایەوە. بەڵام رەوتی مێژوویی ئاینی مەسیحی جیاوازتربوو. بۆ نمونە مەسیحیەت سێ سەدە دوای پەیدابوونی تێکەڵ سیاسەت کراو دوای ئەوەش چەندین سەدە بەم حاڵە مایەوە، بەرلەوەی جارێکی ترو دوای سەرهەڵدانی سەردەمی رێنیسانسو رۆشنگەریو مۆدێرنە، لە سیاسەت جیابێتەوە).

لێرەوە "ئۆلیڤێ کارێ" دەگاتە ئەوەی بڵێت: (هەردوو ئەم ئایینە وەکی یەك تێکەڵ بە

سیاسەت بوون و ناکرێت لەم رووەوە جیاوازی لە نێوانیاندا بکەین. مەسەلەی ئەوەش کە مەسیحیەت ئایینێکی عەلمانییەو سیاسی نییەو هەر لە سەرەتاکانیەوە وابووە، ئەفسانەیەو لەبەردەم بەڵگە مێژووییەکاندا خۆی ناگرێت. هەرکاتێك هەلومەرجی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا گەشەی کردو بەرەوپێش چوو، ئەوا وەکی کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان دەبێتە عەلمانی. کەواتە کێشەکە پەیوەندی بە کات و بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی و بڵاوبونەوەی خوێندن و پەروەردەیەکی رۆشنگەرانەوە هەیە، نەك شتێکی تر).

توێژەرێکی دیکەی فەرەنسایی کە ناوی "ئیمانوێل تود"ە و خۆرهەڵاتناس نییە، پشتگیری ئەم تێزە ژیرانە دەکات و پێیوایە: (هەموو موسڵمانێك بن لادن و زەرقاوی نییە. ئەوانیش وەك ئێمە لە قۆناغێکی ئینتیقالیدا دەژین. لە سەدەکانی رابردوودا ئێمەی ئەوروپایی بە دەست دادگاکانی پشکنین و شەڕی نێوان ئاینزاکانی ئایینی مەسیحیەوە گیرۆدە بووین، پاشان دوای ئەوەی کێشە سەرەکیەکانمان چارەسەرکرد، گەیشتینە ئەو دۆخە ئارام و سەقامگیرەی ئەمڕۆ. موسڵمانانیش دەتوانن ئەم قۆناغە ببڕن و بگەنە ئەمان). پاشان "فرجانی" دێتە سەرباسی مەسەلەیەکی دیکە دەربارەی ئەوەی: ئایا ئیسلام هەر لە سەرەتایەوەو لە ناوەڕۆکدا ئایینێکی توندوتیژەو شەڕانگێزە؟ ئایا لەم رووەوە جیاوازی لەگەڵ یەهودیەت و مەسیحیەت و سەرجەم ئایینەکانی دیکەی جیهاندا هەیە؟ بەواتایەکی دی قورئان لەوکارە توندوتیژیانە بەرپرسیارە کە گروهە توندڕەوەکان لە جیهانی ئیسلامی و ناوچەکانی دیکەی جیهاندا ئەنجامی دەدەن؟

نوسەری ئەم کتێبە پێیوایە، قورئان وەکی تێکرای تێکستە ئایینیەکانی دی هەڵوێستێکی دوو لایەنەی لە مەسەلەی توندوتیژی هەیە. واتە هەندێ ئایەتی رێگە بە توندوتیژی دەدات و ئایەتگەلێکی دیکەش داوای ئاشتی و دورکەوتنەوە لە توندوتیژی دەکەن، ئەمەش پەیوەندی بەو هەلومەرجە مێژووییەوە هەبووە کە پێغەمبەرو موسڵمانانی سەرەتا تێیدا ژیاون. ئەو هەلومەرجەش پڕی گێرمەو کێشەبووەو بە نەیاران و دوژمنان گەمارۆدرابوو، بەڵام سەرەنجام لە قورئاندا رۆحی ئاشتی خوازانە بەسەر رۆحی توندوتیژی و دژایەتیکردنی ئەوانی دیدا زاڵ دەبێت. لە قورئاندا ئایەتگەلێك هەن دنەی توندوتیژی دەدەن و باس لە دەمارگیری دەکەن، بەڵام ئایەتگەلێکی دیکەش هەن کە ئاشتی خوازانەن و داوای بەخشیش و لێبوردن دەکەن. ئاخۆ دەبێت کار بەکامیان بکەین و کامیان وەربگرین؟

وەکی وتمان ئەوەی لە قورئاندا زاڵە، رۆحی لێکبوردن و ئاشتی خوازانەیە. رۆحی گشتی قورئانیش، باس لە بەزەیی و لێکبوردن و گەردن ئازادی دەکات. نابێت هەرگیز ئەم رەهەندە فەرامۆش بکەین، وەك ئەوەی لە ئێستادا بزاوتە ئسوڵیە توندڕەوەکان دەیکەن. چونکە کارێکی وا خیانەتە بە قورئان و لادانە لە ناوەڕۆکی پەیامەکەی. قورئان هەرگیز ئامانجی ئەو توندوتیژییە کوێرانەیە نەبووە، وەك ئەوەی

ئێستا "زەرقاوی" لە عێراقدا ئەنجامی دەدات، نەخێر ئەمە نە رۆحی قورئانەو نە گوزارشتە لە جەوهەرو پەیامەکەی.

لەلایەکی ترەوە نوسەری ئەم کتێبە، رەخنە لە بۆچونەکانی "بێرنارد لویس" دەگرێت و پێیوایە بۆچونەکانی سەبارەت بە ئیسلام، کۆمەك بە بۆچونی فێندەمێنتالیستە توندڕەوەکان دەکات. "لویس" دەڵێت: (ئیسلام لە بنەڕەتدا ئایینی توندوتیژییەو لەسەر جیهادو شەڕکردن دروست بووە. ئەم ئایینە دنیا دابەش دەکات بەسەر- دار الاسلام-و- دار الحرب- داو، پێیوایە دەبێت جیهاد بەردەوام بێت تا ئەوکاتەی تەواوی مرۆڤایەتی دێنەژێر سایەی ئیسلام و باوەڕدێنن). "محەمەد شەریف فرجانی" وەڵامی دەداتەوەو دەڵێت: (ئەم قسانە دورن لە راستیەوە، ئەگەرچی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ئەدەبیاتی فێندەمێنتالیستەکان و ئیخوان موسلمیندا باسدەکرێت. بۆ نمونە زاراوەی- دارالاسلام- و- دار الحرب-، لە قورئاندا نییەو باسی نەکراوە. سەرەڕای ئەوە وشەی ئاشتی چل و نۆجار لە قورئاندا هاتووەو ئەو ئایەتانەشی داوای لێکبوردن و خۆشەویستی دەکەن، بە دەیان جار هاتووە. ئایا ئێمە چی لەمانە بکەین؟ بڵێین وەکو بن لادن و زەرقاوی و زەواهیری، راست و چەپێکیان بەسەردا بهێنین و بیانسڕینەوە؟ ئایا ئێمە مافی شتێکی لەو جۆرەمان هەیە، لە کاتێکدا راست و رەوان لە قورئاندا هاتووە؟ گەر ئەوە بکەین، مانای وانییە کە لە قورئان لادەدەین و ناپاکی لەگەڵ پەیامەکەیدا دەکەین؟).

پاشان پرسیارێکی دیکە دەکات و دەڵێت: (تەورات هەندێ بەشی پڕی توندوتیژییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس ناڵێت ئایینی جولەکە لە جەوهەردا ئایینی توندوتیژییە. تەنانەت ئینجیلیش کە بە بەزەیی و لێکبوردن بەناوبانگە، لە هەندێ پەرەگرافیدا توندوتیژی پێوەدیارە: وائەزانن من هاتووم تەنها ئاشتی بێنمە سەرزەوی؟ پێتان ئەڵێم: نەخێر، لەگەڵ خۆم دووبەرەکی و جیابوونەوەم هێناوە. هەر لە ئێستاوە، گەر لە ماڵێکدا پێنج کەسی تیابێت، سیانیان لە دوانیان، یان دوانیان لە سیانیان جیائەبنەوە. باوك لە کوڕو کوڕ لە باوك، دایك لە کچ، کچ لە دایك، خەسو لە بوك، بوك لە خەسوو جیائەبنەوە). هەرچەندە ئەو بڕگانەی باس لە توندوتیژی دەکەن لە ئینجیلدا، بە پێچەوانەی تەورات و قورئانەوە زۆر کەمن، بەڵام ئەم رێی لەوە نەگرتووە کە مەسیحیەکان بە درێژایی مێژوی کۆن، بەناوی ئایینەکەیانەوە تاوانی زۆر گەورە ئەنجامبدەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مەرج نییە ئینسان هەمیشە پابەندی تێکستە ئایینیەکان بێت و رێنومایییەکانی لەبەرچاو بگرێت.

ئینسانەکان پەیێی هەلومەرج و گۆڕانە مێژوییەکان، هەندێجار تێکستە ئایینیەکان بە ئاراستەی ئاشتی و برایەتی و هەندێ جاریش بە ئاراستەی شەڕو توندتیژیدا تەفسیردەکەن (بڕوانە دادگاکانی پشکنین لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، هەروەها شەڕە مەزهەبیەکانی نێوان کاتۆلیك و پرۆتستانتەکان). دەتوانین هەمان شتیش دەرهەق بە ئایینەکانی دیکەی وەك: (بودیزم و هیندۆیزم)یش بڵێین. ئەم ئایینانەش

له پێناو شەڕکردن و یەکخستنەوەی هندستاندا بەکارهێنراون. بە کورتیەکەی هەموو ئایینەکان شتی جوانیان تێدایەو داوای خۆشەویستی و برایەتی دەکەن، بەڵام هاوکات ئەوەندەشیان بۆکرابێت لە پێناو بڵاوبوونەوەیدا، پەنایان بۆ هێزو توندوتیژی بردووە. واتە لەلایەك کۆمەڵێك پرانسیپی ئایدیال و نمونەیمان هەیەو لەلایەکی دیکەش پراکتیزەکردنی عەمەلیمان لەناو واقیعدا هەیەو ئەم دوانەش زۆر لێکدی جیاوازن!.

ئەمە مانای وایە دەبێت لەناو مێژودا سەیری ئایین بکەین، نەك وەك شتێکی بان-مێژوویی لێیبڕوانین، وەکی ئەوەی ئیماندارە تەقلیدیەکان دەیکەن، چونکە ئەوانە هەمیشە وێنەیەکی ئایدیالیانەی ئایین بۆ خۆیان دروستدەکەن کە زۆر لە واقیعەوە دوورە. هەمیشە جیاوازیەکی زۆر لە نێوان ئایین وەك سروشتێکی رۆحی باڵاو کۆمەڵە پرانسیپێکی ئەخلاقی نمونەیی، لەگەڵ ئایین وەك ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی و دەسەڵاتخوازدا هەیە کە ئامانجی پەلکێشانی زیاترو زۆرترە، لە رێی ملکەچپێکردن و بێئیرادەکردنی ئەوانی دییەوە. هەموو ئایینەکان لە ساتێك لە ساتەکاندا گۆڕان و بوون بە ئایدۆلۆژیایەکی دەسەڵاتخوازو دیسپۆتیزمی. مەبەستیشمان لەوەی کە دەڵێین دەبێت ئایین لەناو مێژودا بخوێنینەوە نەك لە دەرەوەی مێژوودا، ئەمەیە.

نوسەری ئەم کتێبە دوای ئەوەی لە باس و خواسی پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت دەبێتەوە لە سەرەتاکانی ئیسلامدا، دەبینین لە دوابەشەکانی کتێبەکەیدا باس لە هەمان بابەت دەکات، بەڵام لە سەردەمی نوێدا. لێرەوە دێتە سەر باسکردنی جیهانبینی ئیخوان موسلمین و سەرجەم ئەو بزاوتە ئسوڵیانەی لە ئامێزی ئیخواندا گەورەبوون و لێی جیابوونەوە.. واتە "محەمەد شەریف فرجانی" لە دوابەشەکانی کتێبەکەیدا دەستدەکات بە تاوتوێکردنی جیهانبینی ئەم گروپانە دەرهەق بە پەیوەندی ئایین بە سیاسەتەوە، لەگەڵ نیشاندانی خاڵە جیاوازو لێکچووەکانی لە سەرەتاکانی پەیدابوونی ئیسلامدا. بەڵام نوسەر بەرلەوەی بچێتە ناوەڕۆکی باسەکەیەوە، دەبینین زۆر بە دورو درێژی دێتە سەر باسی لێکچون لە نێوان ئیسلامی سیاسی و مەسیحیەتی سیاسی. ئەمەش بۆ ئەوە دەکات تا ئیسلام لەو تایبەتمەندیە بەرتەسکە قوتاربکات کە هەندێك خۆرهەڵاتناس لەوێدا گیری دەدەن، ئەویش بۆ ئەوەی تۆمەتی دەمارگیری و توندڕەوی بدەنە پاڵ. "فرجانی" پێیوایە ئیسلامی سیاسی دەقاودەق وەکی مەسیحیەتی سیاسی، دروستبونی پەرچەکردارێك بوو لە بەرامبەر مۆدێرنەی زانستی و فەلسەفیدا. کەواتە لەم رووەوە ئیسلام هیچ تایبەتمەندیەکی نییەو لە ئایینەکانی دیکەش جیاوازترنییە. بۆیە نابێت ئیسلام بکەینە ئاینێکی تۆقێنەر، وەکی ئەوەی میدیاکانی خۆرئاوا دەیکەن.

ئەو دابڕانە مەزنەی سەردەمی مۆدێرن لەگەڵ سستمی جیهانی کۆندا دروستیکرد، ئیماندارە تەقلیدیەکانی هەموو ئایینەکانی شپرزەکردو ناچاری کردن پەرچەکردارێکی توندی لە بەرامبەردا بنوێنن. ئەو دابڕانەی مۆدێرنە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئەوروپادا دروستیکرد،

ئەوەی دا بەگوێی خەڵکدا کە ئیتر لە مەودوا خۆیان بڕیار لە سەر ژیانی خۆیان دەدەن، نەك هێزێك لە دەرەوەی خۆیان ئەو بڕیارەیان بۆ بدات. هەروەها پێیوتن: (سستمی سیاسی ڕەوایەتی خۆی لە ئیرادەی گەلەوە بەدەست دێنێت، نەك لە ڕێی فتوای پیاوانی ئایینەوە). بەمجۆرە مەشروعیەت لە ئاسمانەوە دابەزیە سەر زەوی، لەگەڵیشیدا سستمی تیۆکراتی لە ئەوروپا هەرەسی هێناو سستمی دیموکراسی مۆدێرن جێی گرتەوە.

ئەم دابڕنە فەلسەفی‌و سیاسیە، لە سەرەتادا خەڵکی ئەوروپای توشی شۆککردو پەرچەکرداری لای فێندەمێنتالیزمی مەسیحی دروستکرد. دواتر هەمان شتیش لە جیهانی ئسلامیدا رویدا، کاتێك بیروباوەڕی ڕۆشنگەری‌و شۆڕشی فەرەنسی پێگەیی. ئەو ریفۆرم‌و چاکسازیانەی هەندێك ویستیان لە ژێرناوی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکاندا، لە ئیمپراتۆریای عوسمانیدا ئەنجامی بدەن، رو بەڕوی بەرگرییەکی سەختی تەقلیدیەکان بووەوە. سەروەختێکیش "کەمال ئەتاتورك" لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کۆتایی بە خەلافەتی ئیسلامی هێنا، لەلایەن گەورە زانایانی ئایینی وەك "مستەفا سەبری توکادی" دوایین موفتی دەوڵەتی عوسمانی‌و "شێخ ڕەشید ڕەزا" لە لوبنان‌و... هتد، زۆر بە توندی بەرپەرچدرایەوە. لەم سەرو بەندەدا "مستەفا سەبری توکادی" کتێبێکی بەناوی: (النکیر علی النعمة من الدین والخلافة والأمة)ی بە چاپ گەیاندو "شێخ ڕەشید ڕەزا"یش بەناو نیشانی (الخلافة أو ألامامة العظمی)وە کتێبێکی بڵاوکردەوە. هەرچی کتێبە پێشەنگەکەی "شێخ عەلی عەبدولرەزاق"یشە (الأسلام و أصول الحکم) کە تیایدا پشتگیری لە نەهێشتنی خەلافەت دەکات، رو بەڕوی هێرش‌و پەلامارێکی توندبووەوەو ئەو پەرچەکردارەی لە جیهانی ئیسلامیدا دروستیکرد، هیچی لەو پەرچەکردارە کەمترنەبوو کە لە بڕیارەکەی "ئەتاتورك" کەوتەوە، سەبارەت بە کۆتایهێنان بە خەلافەتی ئیسلامی.

لەلایەکی ترەوە "فرجانی" دەڵێت: (ئەو پیاوەی بەمانا تۆتالیتاریەکەی چەمکی فێندەمێنتالیزمی فۆرمەلەکرد، بێگومان شێخ حەسەن بەننای دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیخوان موسلمینە لە میسر لە ساڵی 1928دا. پرۆژەی ئایدیولۆژی‌و سیاسی ئەم پیاوە، هێندەی ئەو پرۆژەیەی تاڵیبان ترسناکە کە دەیانویست لە ئەفغانستاندا جێبەجێی بکەن. لە بەرئەوە ناکرێت پرۆژەکەی حەسەن بەننا، بە درێژە پێدەری پرۆژە ریفۆرم خوازەکەی جەمالەدینی ئەفغانی‌و محەمەد عەبدە بدەینە قەڵەم) ئەگەرچی یەکێك لە نەوەکانی "حەسەن بەننا" کە ناوی "تاریق ڕەمەزان"ەو لە سویسرا لەدایك بووەو هەر لەوێش دەژی، پێیوایە پرۆژەکەی "بەننا" تەواوکەری ئەو دوو ریفۆرمیستە ناسراوەی جیهانی ئیسلامیە.

نەخێر ئەمە ڕاست نییە، چونکە ئەوە "حەسەن بەننا" بوو داوای لە شا "فاروق" کرد ڕێگا لە کارو چالاکی سیاسی حیزبەکان بگرێت لە میسردا، بە بیانوی ئەوەی فرەیی دەبێتە مایەی تەفرەقەو هەر وەکی خۆشی دەڵێت: (ئەمە لە ئیسلامدا قبوڵ نییە). هاوکات "بەننا"

داوای جێبەجێکردنی پرانسیپەکانی ئیسلامی دەکرد لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا. لەلایەکی دیکەوە داوای لە حکومەتی میسر کرد، نەهێڵێت لە خوێندنگاکاندا کوڕان و کچان تێکەڵ بەیەکتر بکرێن و کاتی کارکردنیش لە دامو دەزگاکانی دەوڵەتدا وا ڕێکبخرێت کە لەگەڵ ساتەوەختی نوێژکردندا بگونجێت. هەروەها داوای بوونی سانسۆرێکی توندوتۆڵ و تۆکمەی کرد، تا ڕێ لەو کتێب و ڕۆمانانە بگرێت کە گومان لە دڵ و دەرونی خوێنەراندا دروست دەکەن و بەلا ڕێیاندا دەبەن. داواشیکرد ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەش قەدەغەبکرێن کە ئەخلاقی کۆمەڵگە خراپدەکەن. لەگەڵ ئەمانەشدا داوای سانسۆرکردنی سینەماو رادیۆو گۆرانی و هەموو شتێکی کرد، پێشنیاری ئەوەشی خستە بەردەم حکومەت کە سەرلەنوێ پۆلیسی ئاداب بگێڕێتەوە ناو کۆمەڵگە، بە مەبەستی چاودێریکردنی یەك بەیەکی هاوڵاتیان و سزادانی هەرکەسێك کە فەرزەکانی ئیسلام وەك خۆیان جێبەجێ نەکات. بەکورتیەکەی "بەننا" دەیویست، دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی بەسەر کۆمەڵگەدا فەرزبکات و هەناسەی لێبڕێت!!

لەبەر هەموو ئەم شتانە، هەرگیز ناکرێت "حەسەن بەننا" بهێنرێتە ریزی ئەو گەورە ریفۆرمیستە ئیسلامیانەی، لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەرکەوتن و لە هەوڵی ئەوەدابوون هاوسەنگیەك لە نێوان چاکسازی دەستوری (بە شێوازە ئەوروپاییەکەی) لەگەڵ مەرجەعیەتی ئیسلامیدا دروست بکەن. نمونەی ئەوانەشی لە هەوڵی ئەوەدابوون، ئەمانەبوون: "جەمالەدینی ئەفغانی، محەمەد عەبدە، عەبدولڕەحمان کەواکبی، خەیرەدین تونسی، سەید ئەحمەد خان یاخود ئەمیر عەلی لە هندستان و... هتد). ئەمانە هەموویان دژی ئەو بۆچونە تۆتالیتاری و تیرۆرستیە بوون بۆ ئیسلام. تەنانەت کەسێکی وەك "محەمەد عەبدە"، پرانسیپی حکومەتی ئایینی لە بنەڕەتەوە رەتدەکردەوە و پێی قبوڵ نەبوو. بەڵام "حەسەن بەننا" بەناوی دەوڵەتی تیۆکراتیەوە، مۆدێرنەو دیموکراسی و فرە حیزبی رەتدەکردەوە و بە کوفرێکی گەورەی دەدایە قەڵەم.

دواتر "ئەبو ئەعلای مەودودی" بوو بە میراتگری "بەننا" و ئەمیش دەیوت: (حوکمڕانی بۆ یەزدانەو بۆ گەل نییە.. دیموکراسی خۆرئاواش کوفرەو نابێت جیهانی ئیسلامی بە هیچ شێوەیەك کاری پێبکات، گەرنا ئەوا رۆح و بەهاو رەسەنایەتی خۆی لە دەست دەدات... مەشروعیەت و رەوایەتی ناشێت سەرچاوەکەی گەل یاخود مرۆڤ بێت، بەڵکو ئەوە شتێکی ئیلاهیەو لە پیاوانی ئایینیدا بەرجەستە دەبێت. بەم پێیە هیچ حکومەتێك لە ولاتانی ئیسلامیدا شەرعی نابێت، ئەگەر سەرلەبەر حکومەتێکی تیۆکراتی نەبێت.. شتگەلێکی وەکو دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئیرادەی گەل و دەنگدان و... هتد، بیدعەی خۆرئاوای کافرو شارستانیەتە مادیە پوچەکەیەتی کە بەرەو نەمان و داڕوخان دەچێت). شایەنی باسە سەدەیەك زیاترە فێندەمێنتالستە ئیسلامیەکان پێشبینی کۆتایی شارستانیەتی خۆرئاوای گەندەڵ دەکەن، بەڵام بێئەوەی پێشبینیەکەیان بێتەدی و خۆرئاواش هەرەس بێنێ).

دوای "حەسەن بەننا"و "ئەبو ئەعلای مەودودی"، "سەید قوتب" بە دوایاندا دێت و ئەمیش بە نوسینە ئاگرینیەکانی و بەو رەوانبێژیە ئەدەبیە بەرزەی هەیبوو، گەنجانی جیهانی ئیسلامی جۆشدەدات و دەیانخاتە سەر کەڵکەڵەی جیهاد. دوای هەموو ئەمانەش "خومەینی" دێت، ئەم پیاوە ئەگەرچی شیعەیە، بەڵام هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەواندا نییە. بەڵگەش بۆ ئەمە لێدوانەکانی "راشد غەنوشی" رابەری بزوتنەوەی رابونی وڵاتی تونسە، لە سەروەختی سەرکەوتنی شۆڕشی ئێرانیدا کە دەڵێت: (لە سەرئەنجامدا کاری خومەینی و حەسەن بەنناو مەودودی یەك شتە). بە بۆچونی ئەو، ئەوانە سەرکردەی بزاوتی ئیسلامی هاوچەرخن و دەبێت گوێڕایەڵیان بین و لە دوایانەوە بڕۆین. دەکرا "غەنوشی" ناوی: "عەلی بلحاج و عەباس مەدەنی" لە جەزائیرو "حەسەن تورابی" لە سودان و ناوی خۆشی لە تونس و سەرجەم سەرانی بزاوتە ئسولیەکانی لە جیهانی ئیسلامیدا لەگەڵ ناوی "خومەینی و بەنناو مەودودی"دا بهێنایە، چونکە دروشمی هەر هەموویان ئەوەیە: (چارەسەر ئیسلامە)، بەڵام کام ئیسلام؟ تۆ بڵێی ئەو بۆچونە دیسپۆتیزمی و تاریکخوازەی ئەوان دەربارەی ئیسلام هەیانە، ببێتە چارەسەرکەری کێشەی کۆمەڵگەکانمان لە کۆتاییەکانی سەدەی بیست و بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکدا؟! یان تۆبڵێی رەتکردنەوەی دیموکراسی و سەرجەم مۆدێرنەی فەلسەفی و سیاسی، بەناوی وەهمی دەوڵەتی ئیسلامیەوە، ببێتە مایەی ئەوەی کۆمەڵگاکانمان لەو تەڵەزگەو قەیرانە کوشندانەی ئەمڕۆ قوتاریان بێت؟ ئایا ئێمە ئەوەمان بەسە کە وەکی توتی بڵێین: (ئیسلام چارەسەرە)، بۆ ئەوەی تێکڕای کێشەکانمان چارەسەربێت؟ لە راستیدا کاتێك بەوردی دیقەت لە شتەکان دەگرین، دەبینین ئیسلام وەکی ئەوەی ئەوان لێیتێگەیشتوون، کێشەیە نەك چارەسەربێت!.

پاشان نوسەر لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت: (پێدەچێت شکستی ئەم بزاوتە ئسوڵیانە، لەوەی بتوانن لە رێی توندوتیژی و غافڵکوژی و تەقینەوەی تیرۆریستەوە دەسەڵات بگرنە دەست، هانی ئەوەی دابن هەڵوێستی خۆیان لە دیموکراسی بگۆڕن. هەربۆیە لە ئێستادا هەندێك لە سەرکردەی ئەو گروپانە دیموکراسی بە کوفرو بیدعەیەکی خۆرئاوایی نازانن. بەڵام داخۆ ئەم هەڵوێستەیان قەناعەتێکی راستەقینەیە، یاخود تەنها تاکتیکێکی سیاسیەو هەلومەرجێکی دیاریکراو بەسەریدا سەپاندون؟ زۆرێك بۆچونی دووەمیان پێ راسترەو پێیان وایە ئەم کارەیان تەنها تاکتیکێکی سیاسیە). هەرچۆنێك بێت هەڵوێستێکی وا ئیجابیەو چاکترە لەو هەڵوێستەی رابردوو کە سەرلەبەر دژی مۆدێرنە بوو. بەڵگەشمان بۆ راستی ئەم قسانە ئەو گۆڕانەیە کە بەسەر پارتی دادو گەشەپێداندا هات و تەنها هەر بەناو حیزبێکی ئسوڵیە، گەرنا لە هیچ یەکێك لەو یاسا عەلمانیانە پاشەکشەی نەکردووە کە دامەزرێنەری تورکیای نوێ "مستەفا کەمال ئەتاتورك" دایڕشتن.

شایەنی باسە لیبرالیەکانی تورکیا دوای سەرکەوتنی ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنە

گشتیەکانی ساڵی 2002دا ترسیان لێنیشت، گەر ئەم حیزبە بگاتە دەسەڵات لە یاساکانی سستمی عەلمانیەتی تورکیا لابدات، بەڵام پارتی دادو گەشەپێدان بە میانڕەوی خۆیو هەوڵە ئاشکراکانی بۆ تەماهیکردن لەگەڵ جیهانی مۆدێرندا، هەمووانی توشی سەرسامی کرد. ڕەنگە خواستو ئارەزووی سەرانی ئەم پارتە بۆ چونە ناو یەکیەتی ئەوروپا، هۆکاری ئەو نەرمی نواندنو ئاقڵیەبێت. بەهەرحاڵ ئەم حیزبە خۆی وەها دەناسێنێت کە حیزبێکی موحافیزکار یاخود دیموکرات ئیسلامیە، لە شێوەی ئەو پارتە دیموکرات مەسیحیانەی لە ئەڵەمانیاو چەند وڵاتێکی دیکەی ئەوروپیدا هەن. پارتی (العدل والأحسان)یش لە وڵاتی مەراکیش کە لەم هەڵبژاردنانەی دوایدا ڕێژەی دەنگدەرانی زیادی کرد، هەمان شت دەڵێتو وەکی ئەو ڕەفتاردەکات. لەو دوای ئەو پەلامارە تیرۆرستیانەی لە ساڵی 2002دا کرایە سەر شاری (الدار البیضاء)، یەکێك لە سەرکردەکانی حیزبی (العدل والأحسان) ڕایگەیاند کە ئەوان پارتێکی فێندەمێنتالیست نین، بەڵکو پارتێکی دیموکراسینو مەرجەعیەتێکی ئیسلامیانەیان هەیە. پاشان دەپرسن: (بۆچی دەبێت لە ئەوروپادا حیزبی دیموکرات مەسیحی هەبێت، کەچی ئێمە مافی ئەوەمان نەبێت هێزی دیموکرات ئیسلامیمان هەبێت؟). بەڵام ئیسلامیەکانی لای ئێمە بێئاگان لەوەی ئەو پارتە دیموکرات مەسیحیانەی ئەوروپا، تەواو دیموکراسیو عەلمانینو لە مەسەیحیەتیش تەنها هەر ناوەکەیان هەڵگرتووەو یاخود تەنها کار بە هەندێ بەهای ڕوحیو میتافیزیکیو مۆراڵی ئایینی مەسیحی دەکەن. ئەگینا لە ژیانی ڕۆژانەو لە ڕوبەڕبوونەوەی کێشە سیاسیەکاندا، نە پابەندی ڕێنومایەکانی پاپا دەبن، نە هی پیاوانی ئایینی. بەلاّم ئاخۆ هەلومەرجی ئێستای کۆمەڵگەکانی ئێمە، بواری ئەوەدەدات کە حیزبی دیموکرات ئیسلامی کامڵی لە وێنەی دادو گەشەپێدانی تورکیای تێدا دروست بێت؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئێمە ناتوانین داوای ئەوە لە کۆمەڵگاکانمان بکەین، ئەزمونی هەموو ئەو قۆناغە مێژوییە نوێیەی خۆرئاوا بکات کە چەندین سەدەی لە خۆرئاوادا خایاند!. ئەڵبەتە ئەمە کارێکی مەحاڵەو ناکرێت. بۆیە دەبێت کاتی پێویستیان بدەینێ تا هەلومەرج لەباربێت.

ئێمە دەستخۆشی لە هەموو هەنگاوێکی هێزە ئسوڵیەکان دەکەین بەرەو دیموکراسی، ئەگەرچی بەشێوەیەکی ڕوکەشانەش بێت. چونکە ڕەنگە ئەمە هەنگاوی یەکەم بێت بەرەو ڕێگای ڕاست. ئێمە نابێت "عەلی بەلحاج"و "ڕەجەب تەیب ئەردۆگان" لەیەك ئاستدا دابنێینو تەرێزیان لێبکەینو پێیان بڵێین: (هەموویان فێندەمێنتالیستن!). ئەمە نابێتو ڕاست نییە، چونکە تا ئێستاش "عەلی بەلحاج" سەلەفیەکی داخراوەو دیموکراسیەت بە کوفر دەزانێت. بە پێچەوانەی "ئەردۆگان"و تەنانەت "غەنوشی"یشەوە کە ساڵی 1989 بە ئاشکرا ڕایگەیاند: (لابردنی یاسای فرەژنی، لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامیدا ناکۆك نییە). هەروەها باسی لەوەش کرد کە هەندێك لەو چاکسازیانەی کاتی خۆی "حەبیب بۆرقیبە" بە مەبەستی باشترکردنی ڕەوشی ژنان کردی،

لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ناکۆك نییە. وەکی ئاشکراشە تەواوی سەرانی بزاوتە ئسوڵیەکان، قسەکانیان بە پێچەوانەی ئەمەوەیەو فرەژنی وەك حوکمێکی قورئانی سەیردەکەن کە قابیلی دەسکاریکردن نییە.

لە راستیدا هەموو بزاوتێکی ئسوڵی پەیوەستە بە هەلومەرجی ئەو کۆمەڵگەو دەوڵەتەی لە چوارچێوەیدا دەژی. هەربۆیە سەیرنییە پێشکەوتوترین بزاوتی ئسوڵی، ئەو بزاوتانەن کە لە تونس و تورکیادان. چونکە یەکەمیان تارمایی "حەبیب بۆرقێبە"و دووەمیشیان تارمایی "کەمال ئەتاتورك"ی بەسەرەوەیە. ئەوانیش هەردوکیان عەلمانی و رۆشنگەربوون و دەرچووی ئەکادیمیاکانی خۆرئاوان، بەتایبەتیش ئەکادیمیای فەرەنسی.

## پەراوێز:

*(*)m-cferjani, lepolitique etle reliyieuxdans le champ islamiq ue, pars, fayard, 2005.*

## سەرچاوە:


د. هاشم صالح: معضلة الاصولية الاسلامية- دار الطليعة، بيروت- الطبعة الاولى، 2006.

# له تیوره‌وه تا ره‌خنه له مۆدێرنی سیاسی

مۆریس بارییه
له فارسیه‌وه: ڕێبین هه‌ردی

ده‌وڵه‌تی مۆدێرن که ده‌رئه‌نجامی شۆڕشی فه‌ڕه‌نسی بوو، نمونه‌یه‌کی پیشاندا که له‌سه‌ده‌ی نۆزده‌دا هه‌نگاو به هه‌نگاو و به روبه‌ڕوبونه‌وه‌ی چه‌ندان گرفتی جیاواز، له ئه‌وروپادا بڵاوبوۆوه. هاوکات له‌گه‌ڵ ئه‌م رووداوه‌دا فۆرمه‌ڵه‌بوون و خه‌سڵه‌تی ده‌وڵه‌تی مۆدێرنیش بووه بابه‌تی بیرکردنه‌وه و شیکردنه‌وه‌ی جۆراوجۆر. به‌ڵام شێوه‌ی تێڕوانینی بیریارانی سیاسی بۆ مۆدێرنه‌ی سیاسی جیاواز و له پشتیوانیکردنی براوه تا ره‌خنه‌کردنی میتۆدیانه‌ی ده‌گرته‌وه. له‌وانه بنجامین کۆنستان به وردبینیه‌وه په‌ره‌ی به تیوره‌ی ده‌وڵه‌تی مۆدێرن دا و و بیروڕایه‌کی ئیجابی به‌رامبه‌ری هه‌بوو، گه‌رچی تۆکڤیل به واقعبینیه‌وه نوێبوون و ره‌هه‌ندی قابیلی نه‌گه‌ڕانه‌وه‌ی ده‌وڵه‌تی مۆدێرنی ده‌سه‌لماند، به‌ڵام مه‌ترسیه‌کانیشی ده‌دی و هه‌ڵویستی به‌رامبه‌ری که‌م تا زۆر پارێزگارانه بوو، مارکس به‌شێوه‌یه‌کی قوڵ و روون ده‌وڵه‌تی مۆدێرنی شیکرده‌وه و ئه‌م شیکردنه‌وه‌یه به‌ره‌و ره‌خنه‌یه‌کی رادیکالی له ده‌وڵه‌تی مۆدێرن و مۆدێرنه‌ی سیاسی برد.

### 1- کۆنستانت تیوره دارێژه‌ری مۆدێرنه‌ی سیاسی

بنجامین کۆنستانس له کۆنفرانسی به‌ناوبانگی ساڵی 1819دا، ئازادیه دێرینه‌کانی له‌به‌رامبه‌ر ئازادیه مۆدێرنه‌کاندا دانا و به‌مشێوه‌یه جیاوازی ده‌وڵه‌تشاری دێرینی له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی مۆدێرندا ئاشکرا کرد. ئازادی یه‌که‌م هه‌مان ئازادی گشتیه له ده‌وڵه‌تشاری دێریندا و ئازادی دوهه‌میش ئازادی تاکه‌کسیه له ده‌وڵه‌تی مۆدێرندا. له‌و رووه‌وه که کۆنستانت پیٚ له‌سه‌ر ئازادی مۆدێرن داده‌گرێت و جه‌خت له گرنگی براوه‌ی ده‌کات، ده‌کریٚ به تیوره دارێژه‌ری سه‌ره‌کی مۆدێرنه‌ی سیاسی و پشتیوانی بیٚ چه‌نده‌چونی ده‌وڵه‌تی مۆدێرن بزانرێت.

کۆنستانت سەرەتا بە وردبینییەوە رونی دەکاتەوە کە ئازادی لای گەلانی دێرین لەسەر چی دامەزراوە و ئازادی گەلانی مۆدێرن لەسەر چی بونیادنراوە. هەروەها دەریدەخات چ جیاوازیەك لەنێوان ئەم دوو ئازادیەدا هەیە: لای گەلانی دێرین –بۆنمونە لە سپارت و رۆمدا– "ئازادی گشتی" هەبوو کە بریتی بوو لە "بەکارهێنانی" دەسەڵاتداریێتی "بە شێوەیەکی گشتی و راستەوخۆ". بۆ نمونە بڕیاردان لەبارەی جەنگ و ئاشتیەوە، بەستنی رێکەوتنامەی یەککگرتن، دەنگدان بۆ یاساکان، راگەیاندنی داوەریەکان، چاودێری کاری ماژیسترەکان...بەڵام بەهۆی "ملکەچی کاملی تاکەکەس بۆ دەسەڵاتی گشت"، ئازادی تاکەکەسی لای ئەوان بوونی نەبوو: "هەموو کرداری تاکەکان لەژێر چاودێریکی سەختگیرانەدابوو و جێگەیەکی بۆ سەربەخۆی تاکەکەسی چ لە زەمینەی بیروڕا و چ لەبواری پیشە و کار و بەتایبەتی لەبواری دینیدا، نەدەهێشتەوە". چ لە شتە بچوك یان گەورەکانداو چ ئەو کاتەی باسی مەسەلە شەخسی یان خێزانیەکان دەکرا، گروپ بەسەر تاکەکەسدا باڵادەست و تاکەکان خاوەن هیچ سەربەخۆییەك نەبوون و دەبوو مل بۆ دەسەڵاتی گروپ بدەن: "دەسەڵاتی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی دەستی لەهەموو شوێنێکدا وەردەدا و رێگری لەبەردەم ئیرادەی تاکەکاندا دادەنا". تاکەکەس وەك هاوڵاتی واتە وەك "بەشێك لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی" بەشداری لە دەسەڵاتداریێتیدا دەکرد. بەڵام وەك کەسێکی تایبەت "پەیڕەوی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی" بوو و هیچ ماف و ئازادیەکی نەبوو و لەئەنجامدا دەیانتوانی لە هەرچیەك کە هەیەتی بێبەشی بکەن. "بەمشێوەیە تاکەکەس کە لە دیدی دێرینەکانەوە لەبواری بابەتە گشتیەکاندا کەم تا زۆر بەشێوەیەکی گشتی خاوەن دەسەڵاتداریێتی بوو، لەبواری پەیوەندیە تایبەتیەکاندا، لە کۆیلەیەك زیاتر نەبوو". بە دەربڕینێکی دی تاکەکەس تەنها وەك هاوڵاتی بوونی هەبوو، بەڵام وەك بونێکی تایبەت یان کەسێکی تایبەت بوونی نەبوو. تاکەکەس خۆی لەگەڵ دەوڵەتشاردا بە هاوشوناس دادەنا و چارەنوسی بەشێوەیەکی تەنگاو تەنگ بە چارەنوسیەوە بەسترابوو: "لای نەتەوە دێرینەکان نەك تەنها کاریگەریەکان، بەڵکو بەرژەوەندی و چارەنوسی خۆشی لە چارەنوسی وڵاتەوە دەبینی.

بەپێچەوانەوە لای نەتەوە مۆدێرنەکان – بۆ نمونە لە ئینگلتەرای مەزن، فەرەنسا و ویلایەتە یەککگرتوەکان– تاکەکەس خاوەنی ئازادی تایبەتی خۆی و خاوەن مافگەلێکی جیاوازە کە پەیوەندی بە کەسێتی خۆی، ژیان وچالاکیەوە هەیە. باس باسی بەتایبەتی ئاسایشی شەخسی، ئازادی دەربڕین، مافی موڵکایەتی، ئازادی کۆبونەوە و مافی پێشکەشکردنی داواکاریە. ئەم نەتەوانە خاوەنی حکومەتی هەڵبژێراون و گەرچی تاکەکان دەسەڵاتداریێتی خۆیان بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەکارناهێنن، بەڵام لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا سەربەخۆن. لەئەنجامدا نەك هەر بە هاوڵاتی دەژمێرێن، بەڵکو بونێکی تایبەتیشان وەك کەسانی تایبەت هەیە. ئەگەر ئازادی دێرینەکان "لە

بەشداریکردنی چالاك و هەمیشەیی لە دەسەڵاتی گشتیدا" کورتدەبۆوە، ئەوا ئازادی مۆدێرنەکان لەسەر بناغەی "بەهرەمەندبونی ئارام لە سەربەخۆی شەخسی" دامەزراوە. لەکاتێکدا بواری گشتی لە دەوڵەتشاری دێریندا بواری تایبەتی قوت دابوو، ئەوا لە دەوڵەتی مۆدێرندا ژیانی تایبەتی لە ژیانی گشتی جیابۆتەوە و بە سەربەخۆی گەیشتووە و هەروەها سەروکارمان لەگەڵ جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگادا هەیە.

بەڵام دەبێت تەماشای جیاوازی دەوڵەتشاری دێرین و دەوڵەتی مۆدێرن بە سەرنجدان لە سێبەرە روناکەکان بکەین. چونکە جیاوازیەکان تەنها رەهەندێکی زەمەنییان نیە و دەکرێت ئاماژە بۆ هەندێك ئاوارتن بکەین. یەکەم هەندێکجار ئازادی مۆدێرن —یان لایەنیکەم هەندێك بەشی– لە هەندێك دەوڵەتشاری دێریندا کە جێگەیەکیان بۆ تاکەکەس دادەنا، بوونی هەبووە. کۆنستانت نمونەی ئەسینا دەهێنێتەوە کە بەهۆی گرنگی بازرگانیەوە، ئازادیەکی تاکەکسی بەربڵاوی بە هاوڵاتیانی بەخشیبوو، لە ئەنجامدا پێدەچوو لە دەوڵەتی مۆدێرنەوە نزیك بێت: "لەناو هەموو دەوڵەتشارە دێرینەکاندا، ئەسینا تاکە دەوڵەتێك بوو کە زۆرترین لێکچونی لەگەڵ دەوڵەتی مۆدێرندا هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئەسیناش گەلێك نیشانەی نەتەوە دێرینەکانی بەناوچەوانەوە بوو، و بە ئازادی دێرینەکاندا دەناسرایەوە (خەڵکی یاسایان دادەنا، ماژێستراکانیان کۆنترۆڵ دەکرد و ژەنراڵەکانیان دادگایی دەکرد). بەتایبەتی بوونی دورخستەوە کە بریتی بوو لە دورخستنەوەی هاوڵاتی لە وڵات، بە روونی دەریدەخست کە: تاکەکەس "هیشتا لە ئەسینادا" زیاد لە هەر وڵاتێکی ئەوروپی "لەژێر کۆنترۆڵی چوارچێوەی کۆمەڵایەتیدا ژیانی بردۆتە سەر. بەڵێ دورخستنەوە لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە "کۆمەڵگا سەبارەت بە ئەندامەکانی خۆی خاوەن هەموو جۆرە دەسەڵاتێکە و تەنانەت دەتوانێت لە شار دەریان بکات". لەدیدی کۆنستانتەوە کوشتنی سوقرات مانایەکی هاوشێوەی ئەمەی هەبوو: سوقراتیان لەبەرئەوەی کە چەند خودایی لەرزاندووە، واتە ئازادی خۆی لە بواری دینیدا بەکارهێناوە، سەرزەنشت دەکرد. بەمشێوەیە ئەسینا سەرەڕای لێکچوونی لەگەڵ دەوڵەتی مۆدێرندا، بەشێوەیەکی سەرەکی دەوڵەتێکی پێشمۆدێرن بوو کە ئازادی فەردی قەبوڵنەدەکرد.

دووهەم هەرچەندە سەردەمی دێرین لەبنەڕەتدا مۆدێرنەی سیاسی نەدەناسی، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە سەردەمی مۆدێرن هەندێك جێ پێی دوڵەتی دێرین هەڵگرێت. کۆنستانت لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لەسەردەمی شۆڕشی فەڕەنسیدا هەندێك لە سیاسەتمەداران بەتایبەتی یاکۆبینەکان، ئەم دوو ئازادیەیان تێکەڵدەکرد و بڕوای وایە کە ئەم تێکەڵکردنە دەرئەنجامی خراپی لێکەوتەوە: :تێکەڵبوونی ئەم دوو شێوەیەی ئازادی لە قۆناغە زۆر بەناوبانگەکانی شۆڕشدا، بووە هۆی بریندارییەکی زۆر". لەراستیدا یاکۆبینەکان لە "ژان ژاك رۆسۆ و مابلیّ"وە واتە ئیلهامیان لە دوو فەیلەسوفەوە وەرگرتبوو کە خۆیان ئەم

دوو شـــــێوە ئازادیـــــەیان بـــێ بینینـــــی جیاوازیـەکانیان تێکـەڵکردبوو: "ئـەو مرۆڤانـەی لـە تۆفانی روداوەکاندا لەسەر لوتکەی شۆڕش راوەسـتابوون، بـە هـۆی پـەروەردەی خۆیانـەوە، خـاوەن تێڕوانینێکـی دێـرین و نادروست بـوون کـە ئـەو دو فەیلەسـوفەی ناومـان هێنـان، بـە نرخیـان کردبـوون. بەمشـێوەیە رۆسـۆ "بـواری دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتداریێتی گشتی تایبـەت بـە سـەدەکانی پێشـووی، بـۆ سـەردەمی ئێمە" گواستەوە و ئـەم "هەڵـە گەورەیـە"ش بوو بـە سەرچـاوەی شـێوە تازەکـانی دیسـپۆتیزم. مـــابلیێ تەنانـــەت لەمـــەش زیـــاتر رەخنـــەی لێـــدەگیرێت. چـــونکە پێشـــنیای ئـــازادی دەوڵەتشاری دێرینی بە زیانی ئازادی مۆدێرنی تاکەکەسـی دەکـرد: لـە دیـدی مـابلێوە دەبـێ "هاوڵاتیـان بەتـەواوی لـە ژێـر کۆنترۆڵـدا بـن بـۆ ئـەوەی نەتـەوە دەسـەڵاتداریێتی هـەبێت و تـاك کۆیلــە بێــت بۆئــەوەی گشــت ئــازاد بێــت". لەراســـــتیدا مـــــابلیێ رێـــــك وەك رۆســـــۆ "دەسـەڵاتداریێتی چوارچـێوەی کۆمەڵایـەتی بـە ئازادی" دادەنا و دەیوست بواری کارکردنی ئەم دەســـەڵاتداریێتیە لـــە سەرتاســـەری ژیـــانی تاکەکەسـدا –نـەك هـەر بەسـەر کردارەکانیـدا، بـەڵکو بەسـەر بیرکردنەوەشـیدا_ باڵادەسـت بکات. چونکە بێزار بوو لە ئازادی تاکەکەسی.

بەمشـێوەیە بیرۆکـەکانی مـابلیێ و رۆسـۆ کاریان کردە سەر رابەرانی شۆڕشی فەڕەنسی، واتـە کاریـان کـردە سـەر کەسانێك کـە ئامـانجی خۆیان لە دەوڵەتشاری دێریندا دەدۆزیەوە. ئەم رابەرانـە دەسـەڵاتی گشـتیان خسـتبووە سـەرو مافــە تاکەکەســیەکان و لەراســتیدا ئــازادی سیاسـی رژێمـە کۆماریـەکانی دێرینیـان لـە ئـازادی تاکەکەسـی دەوڵـەتی مۆدێرنیـان، بـە بەرزتر دەژمارد.

ئـــەمجۆرە تێڕوانینانـــە ئـــەو زیانانـــە روندەکاتـــەوە کـــە شۆڕشـــی فەڕەنســـی بەرهـــەمیهێنا. بـــەڵام لەگـــەڵ هـــەموو ئـــەم هەوڵانەشـدا شۆڕشـی فەڕەنسـی نـەیتوانی دەوڵـەتێکی دێـرین لـە سـەردەمی مۆدێرنـدا، بـەرپابکات. بـەڵێ ئـەم هـەنگاوە نـاکۆك ئـامێز و ئەستەم بـوو. چـونکە "دەسـەڵاتی کۆمەڵایـەتی، سـەربەخۆیی تاکەکەسـی لـە هـەموو بوارەکانـدا برینـــدار دەکـــرد". لەراســـتیدا ســـەربەخۆیی تاکەکـــەس بـــە"یەکـــەم پێداویســـتی لـــە پێداویسـتەکانی مـۆدێرن" دەژمێرێـت و نابێـت بکرێتــە قوربــانی ئــازادی گشــتی دێرینــەکان. لێـرەوە ئـەوەی لـە دەوڵەتشـاری دێرینـدا لەگـەڵ ئـــــازادی تاکەکەســـــیدا نـــــەدەگونجا –وەك دورخســـــتنەوە و سانســـــۆر– لەســـــەردەمی مۆدێرندا بە هیچ شێوەیەك قبوڵکراو نیە. جگە لەمەش دەبێ رێز لە ئازادی تاکەکەسی لە بواری پەروەردە و دیندا بگیرێت.

لەراسـتیدا دووجـۆر ئـازادی کـە کۆنسـتانت لەیـەکی جیـا دەکاتـەوە، پەیوەنـدی بـە دوو شـێوەی دەوڵـەت و دو جـۆری رێکخسـتنەوە هەیە. لە دیدی دێرینەکانەوە ئازادی بریتی بوو لــــە بـــەکارهێنانی مافـــە سیاســـیەکان و خۆتـــەرخانکردن بـــۆ شـــار. هـــاوڵاتی دێـــرین پشـــکوتنی خـــۆی لـــە ژیـــانی دەوڵەتشـــاردا دەدۆزیـــەوە و بـــوونی خـــودی خـــۆی لەگـــەڵ هەوڵدانـە سیاسیەکانیدا، بـە یـەك شـت دادەنـا. لێـــرەوە دەوڵـــەتی دێـــرین وەك هەمەکیـــەك

دەردەکەوت کە هاوڵاتیان بە بەشەکانی دەژمێرران. لەو روەشەوە کە هاوڵاتیان خاوەن مافی تاکەکەسی نەبوون، کەوابوو بوارێکی جیاواز لە بواری گشتیش بوونی نەبوو. لەراستیدا دەوڵەتشاری دێرین بونەوەرێکی تۆتاڵ و دابەشنەبوو بوو. بەڵام بە پێچەوانەوە لە دیدی مۆدێرنەکاندا ئازادی تاکەکەسی لە ئازادی سیاسی گرنگتر بوو. دیارە ئازادی سیاسیش لە جێگەی خۆیدا پارێزراوە. تاکەکەس دەبێت بەر لە بەکارهێنانی ئازادیە سیاسیەکانی، بە دوای بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیەوە بێت و هەر ئەمەش پێویستی بە رێکخستنێکی جیاوازی دەوڵەتە. بواری تایبەتی روی لە جیابونەوە لە بواری گشتیە و کۆمەڵگای مەدەنی سەربەخۆیی لە دەوڵەت وەردەگرێت. جگە لەمەش سیستەمی نوێنەرایەتی رێگە دەدات تا بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی بە چەندان کەس بسپێرێت و بەمشێوەیە باری گرانی ئەم ئەرکە لەسەر شانی هەمووان لاچێت. لەئەنجامدا خەڵکی تواناى ئەوەیان بۆ دەرەخسێت، خۆیان بۆ کارە تایبەتیەکانیان تەرخانبکەن. بنیامین کۆنستانس بە دڵنیاییەوە پشتیوانی لەم پرۆسەیە دەکات کە بە جیاکردنەوەی کۆمەڵگا لە دەوڵەت، پێدەنێتە ناو مۆدێرنەی سیاسیەوە.

هەرچەندە کۆنستانس پێ لەسەر ئازادیە تاکەکەسیە مۆدێرنەکان دادەگرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەك ئازادی سیاسی دێرینەکان، رەد ناکاتەوە. چونکە ئازادی سیاسی بۆ ئازادی تاکە کەسی بە پێویست دەزانێت: "ئازادی تاکەکەسی (...) بەئازادی راستەقینەی مۆدێرن دەژمێرێت و ئازادی سیاسیش بە زامنکەری. رێك لەبەرئەمەش ئازادی سیاسی شتێکی ناچارانەیە. بەمپێیە کۆنستانس دەیەوێت هەردوو ئازادیەکە رابگرێت و پەرەی پێبدات، چونکە بە شێوەیەکی تەنگاوتەنگ بەیەکەوە بەستراون: "نابێت زەمانەتی (ئازادی سیاسی) لاواز بکرێت، بەڵکو دەبێ پەرە بە بەهرەمەندبوون لەم ئازادیە بدرێت".

هەروەها دەڵێت"بەهیچ شێوەیەك نامەوێت چاو لە ئازادی سیاسی بپۆشم، بەڵکو ئازادی مەدەنیم هاوکات لەگەڵ شێوەکانی تری ئازادی سیاسیدا دەوێت". پاشان لەم پێشەکیەوە ئەم دەرئەنجامە وەردەگرێت"بەڵێ ناتوانین لە هیچ یەك لەم دوو ئازادیەی باسمانکرد، وازبهێنین و بە پێچەوانەوە دەبێت (...) وەك دەرمخست فێری تێکەڵکردنی هەردوکیان بین". لە ئەنجامدا مۆدێرنەی سیاسی نەك لەسەر بناغەی لاوازکردنی دەوڵەت، بەڵکو لەسەر بناغەی سنورداركردن دامێنی دەوڵەت دامەزراوە: "ئازادی لە سنورداربوونی (حکومەت) لە چوارچێوە رەواکەیدا قازانج دەکات، بەڵام لە لاوازکردنی حکومەت لەم سنورەدا نەك هەر قازانج ناکات، بەڵکو زۆر زەرەر دەکات. بەڵێ حکومەت دەبێ بەردەوام لە سنوری رەوای خۆیدا بەراستی دەسەڵات بێت". بەمشێوەیە لەبەرئەوەی ئازادی سیاسی بە زامنکەری ئازادی تاکەکەسی دەژمێرێت، کەوابوو لە نێوان دەسەڵاتی سیاسی و ئازادی تاکەکەسیدا نەگونجان نیە.

## 2_ گومانەکانی تۆکڤیل سەبارەت بە دەوڵەتی مۆدێرن

تۆکڤیل بە پێچەوانەی کۆنستانسەوە شەیدای مۆدێرنەی سیاسیی نەبوو و مۆدێرنەی سیاسی لەگەڵ پرسیارەکانی ئەودا نەدەهاتەوە. تەنانەت پێش ئەمەش دەکرێ بگوترێت سەبارەت بە مۆدێرنەی سیاسی پارێزگار و خاوەن سەرنج و ئارەزووی هەندێك بەهای دەوڵەتی پێشمۆدێرنی دەکرد کە لەژێر تیشکی گۆڕانکاریەکاندا بەناجۆر دەهاتە پێشچاو. گەرچی تۆکڤیل ئەو گۆڕانکاریانەی دەوڵەتی دەسەلماند کە شۆڕشی فەرەنسی و بزوتنەوەی دیموکراسی بەدەستیهێنابوو و جگە لەمەش نەیدەتوانی هیچ کارێکی دی بکات، بەڵام هەرئەم گۆڕانکاریانە مەترسی جدی لای تۆکڤیل دەبزواند.

تۆکڤیل سەرەتا پەنجە دەخاتە سەر جیاوازی دەوڵەتی پێشمۆدێرن و دەوڵەتی مۆدێرن. دیارە مەبەستی تۆکڤیل لە دەوڵەتی پێشمۆدێرن، لەبنەڕەتدا رژێمی بەر لە شۆڕشی فەرەنسیە کە دەوڵەت تیایدا لە چینەکان پێکهاتووە و خاوەن چوارچێوەی کۆمەڵایەتی ناوەندی بوو. بەپێچەوانەوە دەوڵەتی مۆدێرن بە لابردنی ئەم چینانە و چوارچێوە ناوەندیەکان دەناسرێتەوە کە دوو دەرئەنجامی لێدەکەوێتەوە: یەکەمیان دروستبوونی دەوڵەتێکی چڕبۆوە کە بە تواندنەوەی دەسەڵاتەکانی دی، دەبێت بە دەسەڵاتێکی تەواو و دوهەمیش پەیدابوونی هاوڵاتیان یا تاکەکان کە لەبەرئەوەی چیدی سەر بە هیچ گروپێکی تایبەتی نین، گۆشەگیر و لەمڕووەوە لاواز و قابیلی زیان پێگەیاندنن.

گەرچی تۆکڤیل بە وردبینیەوە ئەم گۆڕانە شیدەکاتەوە، بەڵام زۆر نیگەرانە بەرامبەر دەرئەنجامەکانی. چونکە بڕوای وایە رەوتێکی لەم چەشنە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی بەرچاوی دەوڵەت و حکومەت و بە زیانی کۆمەڵگا و تاکەکەس کۆتایی دێت. بەبڕوای ئەو حکومەت (میراتی درێوی هەموو ئیمتازەکانی بۆ ماوەتەوە کە لە بنەماڵەکان، پلەکان یان تاکەکان وەرگیراوەتەوە و هەنوکە لەبری دەسەڵاتی هەندێکجار سەرکوتکەر و هەندێکجار پارێزگاری هەندێك لەهاوڵاتیان، لاوازی گشتی دانیشتووە". بەمشێوەیە شۆڕشی فەرەنسی دەوڵەتی بەرەو تواندنەوەی هەموو ئەو دەسەڵاتانەی لە کۆمەڵگادا هەبوون، لەناوخۆیدا رێنمایکرد و "دەسەڵاتێکی ناوەندی پتەوی" دروستکرد "کە هەموو پارچە دەسەڵاتەکانی پێشتر لە نێوان ئاپورەی دەسەڵاتە پلە دوەکان، چینەکان، پلەکان، بنەماڵە و تاکەکاندا بڵاو و لەسەرتاسەری چوارچێوەی کۆمەڵایەتیدا پەرشوبڵاو بوو بۆوە، لەناو یەکێتی خۆیدا توانەوە و قوتیدا". دیارە دەوڵەتی مۆدێرن هاوکات لەگەڵ رامالینی چوارچیوە ناوەندیەکان و گروپە کۆمەڵایەتیە جیاوازەکان، پەیدابوونی تاکی بە مانای راستەقینە و پەیدابوونی تاکباوەڕی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە لە دەوڵەتی پێشمۆدێرندا بوونی نەبوو: "باوانی ئێمە وشەی تاکباوەڕیان نەدەناسی کە ئێمە بۆ سودوەرگرتنی خۆمان دروستمان کردووە،

چــــونکە لەســــەردەمی ئەوانـــدا تاکێکـــت نەدەدۆزیـەوە کـە سـەر بـە گروپێـك نـەبێت یـا بتوانێـت خـۆی بەشـێوەیەکی رەهـا بـە تـەنیا بژمێرێت". تۆکڤیل لەو باوەڕەدایە جوڵە بەرەو یەکسـانی و دیموکراسـی، ئـەم تاکباوەڕیـەی بەرهـــەمهێناوە: "تاکبـــاوەڕی سەرچـــاوەی دیمـــوکراتی هەیـــە و بـــەو ڕێژەیـــەی پێگـەکان یەکسـان دەبـن، مەترسـی بڵاوبونـەوە زیاد دەکات".

دەوڵــەتی مــۆدێرن کــارزانی و تواناکــانی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی دەکاتە موڵکی خۆی و بە لەناوبردنی "دەسەڵاتە پلە دووەکان"، بەهێز دەبێـت و لەئەنجامـدا "بـونی ناوەنـد لـەنێوان خۆی‌و هاوڵاتیاندا قبوڵناکات". ئەم ڕاستیە دوو مەترسـی جیـاواز و تەنانـەت نـاکۆك بەیـەك دەهێنێتە پێشی: "یەکەمیان بەهۆی لاوازبوونی تاکەکانــەوە، دەوڵــەت وەسوەســە دەبێــت بــۆ ئـــەوەی دەســـتبخاتە نـــاو مەســـەلە شەخســـیەکانەوەو زیـــان بـــە ســـەربەخۆیی شەخسـیان بگەیـەنێت. دوهـەم ئەگـەری چـونە نـاوخۆی تاکـەکان و رو وەرگێڕانیـان لـە ژیـانی سیاســـــی و نیگـــــەرانی روتیـــــان بـــــۆ بەرژەوەندیـــەکانی خۆیـــان زیاددەکـــات کـــە دەرئـــەنجامی ئەمـــەش هـــەمان ئـــازادکردن و کردنـەوەی تـەواوی دەسـتی حکومەتـە. تۆکڤیـل وادەبینــێ کــە مافــەکانی تــاك لــە کۆمــەڵگا دیموکراتەکانـدا بـەهۆی زیـادبوونی دەسـەڵاتی سیاســــــیەوە، روبـــــەڕوی ســـــوکایەتی و فەرامۆشـــــکردن دەبێتـــــەوە. لێـــــرەوە بـــــۆ پارێزگـــاریکردن لـــە مافـــەکانی لەبەرامبـــەر دەســەڵات ســەپاندنی دەوڵەتــدا، ڕێگــە چــارەی جیــاواز پێشکەشــدەکات و لــەم ئاراســتەیەدا بەتایبــەتی پشــت بــە ڕێکخراوەکــان دەبەســتێت، چونکە ئەم ڕێکخراوانە توانای ئەوە بە تاکەکان دەبەخشن بەرگری لە خۆیان لە بەرامبەر خراپ بـــــەکارهێنانی دەســــــەڵاتدا بکــــــەن: "لای کۆمـــــــەڵگا دیموکراتیـــــــەکان تـــــــەنها لەڕێگـــەی ڕێکخراوەکانەوەیـــە ســـەقامگیری هاوڵاتیــان دەتوانێــت لەبەرامبــەر دەســەڵاتی ناوەندیدا، خۆی ڕابگرێت".

تۆکڤیـل کـە هوشـیاربوو بـە مەترسـیەکانی دەوڵـەتی مـۆدێرن، بەدیـدێکی حەسرەتئامێزەوە تەماشــای دەوڵــەتی پێشــمۆدێرن و تەنانــەت دەوڵەتشـاری دێـرین دەکـات کـە بـەبڕوای ئـەو خـاوەنی چەند خەسڵەتێکی باش بوو. تۆکڤیل بەتایبــەتی پەنجــە دەخاتــە ســەر جیــاوازی نیشــتیمانپەروەری لــە دەوڵەتشــاری دێــرین و دەوڵـەتی مۆدێرنـدا: نیشـتیمان پـەروەی دێـرین بە لـەخۆ بـوردنی تـاك بەرامبـەر بە نیشـتیمان و تـــەرخانکردنی خـــود بـــۆ پێکەوەبونســـتان دەناســـرایەوە و لەراســـتیدا بـــە " هەســـتێکی بیرلێنـــەکراوە" و "عەشـــقێکی غـــەریزی بـــۆ نیشـتیمان" دەژمێـررا. لـە سـەردەمی دێرینـدا نیشتیمانپەروەری "رەهەندێکی دەمارگیرانە، پڕ سۆز و بێسنوری تاکەکەسی هـەبوو کـە ئـەمڕۆ لەدەسـتیداوە". لەکاتێکـدا نیشـتیمانپەروەری مـۆدێرن هەسـتێکی عـەقڵانی و بیرلێکراوەیـە کـە لـە دیـدی بەرژەوەندیخوازانـەوە دێـت و دەبێتـە هـۆی جۆرێـك تێکئـاڵانی لەگـەڵ بەرژەوەنـدی تایبەتیـدا". تاکەکـەس سـود و زیـانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی تاوتوێـدەکات و بەرژەوندیشـی لـە بەرژەوەندی نەتـەوە گرنگترە و کاتێك بەشداری

لــە پێشــکەوتنی وڵاتەکەیــدا دەکــات کــە ئــەم پێشــکەوتنە بــۆ خۆشــگوزەرانی خــۆی، بــە سودمەند بزانێت.

هــــەروەها تۆکڤیـــــل دینـــــی مۆدێرنـــــەکان لەبەرامبەر بە دینی دێرینەکاندا دادەنێت، رێك وەك چـــۆن کۆنســـــتانت لـــەبارەی ئازادیـــــەوە ئـــــەمکارەی کردبـــوو. تۆکڤیـــــل هەلومـــــەرجی جیاوازی دین لە دەوڵەتشاری دێرین و دەوڵەتی مۆدێرنـدا دەسـەلمێنێت. لـە حاڵـەتی یەکەمـدا پەیوندیـــــەکی تەنگاوتــــەنگ و یەکێتیــــەکی راستەقینە لەنێوان نیشتیمان و دیندا هەبوو، لە کاتێکدا لە حاڵەتی دوهەمدا بە پێچەوانەوە دین لە سیاسەت جیا و سەربەخۆی خۆی لە دەوڵەت وەرگرتوە. لەدیدی تۆکڤیلدا ئەوەی سەرکەوتنی مەسیحیەت روندەکاتـەوە رەهەنـدە جیهانیەکـەی بـوو: ئـەم دینـە "سـەرکەوتنی خـۆی تارادەیـەك قەرزاری ئـەوەبوو کـە لـە هـەر دینێکی دی زیـاتر لــە هـــەموو ئـــەو شـــتانەی کـــە تایبـــەتن بـــە نەتەوەیـــــەك، یــــان شــــێوەیەك حکومــــەت، هەلومـەرجێکی کۆمەڵایـەتی، قۆنـاغێکی تایبـەت یان یەك رەگەز، دورخستۆتەوە".

تۆکڤیـل یـەکێتی تەنگاوتـەنگی کەنیسـە و دەوڵـــەت لـــە قۆنـــاغی رژێمـــی پێشـــمۆدێرنی فەرەنسادا رەخنە دەکات و بۆئەوەی کەنیسە لە رژێمـی سیاسـی سـەربەخۆ بێـت، پێشـنیاری جیابونـــەوەی کەنیســـە و دەوڵـــەت دەکـــات و خەسـڵەتە باشـەکانی دەوڵـەتی مـۆدێرن لـەم حاڵەتەدا دەردەخات. هەروەها تۆکڤیل دەیەوێت کەنیســـــــە لــــــــە دەســـــــەڵات ســـــــەپاندنی دەوڵــەت رزگاربکــات و لــە قــەدری دەســەڵاتی دەوڵەت کەمبکاتەوە.

لە دیــدی تۆکـڤیلدا ئـازادی مۆدێرن هــەم پێویسـتی بـە سـەربەخۆیی تاکەکـەس و هـەم پێویستی بە بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و لێــرەوە پێویســـتی بـــە بەشـــداریکردن لـــە مەسەلەکانی وڵاتدا هەیە. تۆکڤیل بە پێچەوانەی کۆنستانتەوە ئازادی مۆدێرن کورتناکاتـەوە بـۆ مافـەکانی تاکەکـەس و هوشـیارە بەرامبـەر بـە ترس لە توندڕەویە فەردیەکان، و مەترسیەکانی تاکباوەڕی کە هاوڵاتیان لە کۆمەڵگا و دەوڵەت دوردەخاتـەوە. لـەوڕوەوە کـە تۆکڤیـل دەیـەوێت ئـازادی سیاسـی واتـە بەشـداری هاوڵاتیـان لـە دەسەڵاتی گشتیدا بپارێزێ، تامەزرۆی خـۆی بـۆ ئامـانجی دەوڵەتشـاری دێـرین –واتـە جێگـەیـەك کـە هاوڵاتیـان چـالاکانە لـە ژیـانی سیاسـیدا بەشـداریدەکەن، ناشـارێتەوە. دیـارە تۆکڤیـل هوشـیارە بەرامبـەر بـە جیـاوازی ئـەم دوو جـۆرە بەشـداریە و دەزانێـت بەشـداری لـە رۆژگـاری مۆدێرنـدا راسـتەخۆ نیـە، بـەڵکو لـە رێگـەی نوێنەرەکانـــەوە ئەنجامـــدەدرێت: "پرنســـیپی نوێنەرایەتی بە روونی کۆمارە مۆدێرنەکان لە کۆمـــارە دێرینـــەکان جیادەکاتـــەوە".گەرچـــی تۆکڤیل بە دیدێکی گوماناویەوە تەماشای ئەو دەوڵەتـــە مۆدێرنـــە دەکـــات کـــە لـــە شۆڕشـــی فەرەنسیەوە دروستبوو، بەڵام هەمان هەڵوێستی بەرامبەر بە وڵاتە یەکگرتوەکان نیە. لەبەرئەوەی لەدیـدی تۆکڤیلـەوە بـۆ گەیشـتن بـە مۆدێرنـەی سیاســـی دوو شـــێوەی جیـــاواز هەیـــە (لـــە پەیوەندیـدا بـەوەی ئایـا مۆدێرنـەی سیاسـیی دەرئـەنجامی شـۆڕش بـووە یـا نـا)، کـەوابوو دوو جۆر دەوڵـەتیش هەیە. لە وڵاتـە یەکگرتوەکاندا مۆدێرنەی سیاسیی یەکسەر و بیٚ هیچ گرفتێك

ڕوویـــدا. چـــونكه ئـــەم وڵاتـــە ڕابردوویـــەكی ئەرستۆكراتی نەبوو تا لەگەڵیدا بجەنگێ و لەو ڕوەشـەوە كـە كۆمـەڵگا دەوڵـەتی دروسـتدەكرد، جیابونەوەی توندوتیژی دەوڵەت لە كۆمـەڵگای مـەدەنی، پێویسـت نـەبوو. هەرلەبـەر ئەمـەش شـۆڕش بـۆ دروسـتكردنی دەوڵـەتی مـۆدێرن پێویست نەبوو: " لە ئەمەریكادا ڕژێمی كۆماری بەپێی ڕێكەوتنێكی شاراوە، جۆرێك هاوڕابوونی بـــەربڵاو و بـــێ ململانـــێ و ڕووبەڕووبونـــەوە و بەڵگەهێنانـەوە، بـوونی هەیـە". بەمشێوەیە ئـەم دەوڵەتە بێ ئەوەی پێویستی بە شۆڕش هـەبێت، بە شۆڕشـی دیموكراسـی گەیشـت: " ئیمتیـازی گـــەورەی ئەمەریكیـــەكان ئەوەیـــە كـــە بـــێ ڕەنجكێشـــانی شۆڕشـــە دیموكراتیـــەكان، بـــە دیموكراسی گەیشتن و سەرەڕای ئەمەش لـەبری ئەوەی ببن بە بونـەوەری یەكسـان، بە یەكسانی لەدایكدەبن".

لەفەڕەنســـادا بـــە پێچـــەوانەوە مۆدێرنـــەی سیاسی دەرئەنجامی پرۆسەیەكی درێژخایـەن و سـەخت بـوو كـە بـە شۆڕشـی 1789 دەسـتی پێكـــرد و لەسەرتاســـەری ســـەدەی نـــۆزدەدا درێـــژەی پێـــدرا و پێویســـتی بـــە خـــەباتێكی توندوتیـــژئامێز، بـــۆ دروســـتكردنی دەوڵـــەتی مۆدێرن و جیابونەوەی بواری سیاسی لە بـواری تایبـــەتی، هـــەبوو. جگـــە لەمـــەش لـــە حاڵـــەتی فەڕەنسـادا دەوڵـەت بـەرەو كۆكردنـەوەی هـەموو دەسەڵاتەكان لەدەستی خۆیدا و كەمكردنـەوەی سنوری كۆمەڵگای مـەدەنی دەڕۆیشـت و لێرەوە كۆمەڵگا بووە پـەیڕەوی دەوڵـەت، لـە كاتێكدا لـە ئەمەریكادا دۆخەكە پێچەوانەی ئەمە بوو. هـەر لەبەرئەمـەش تۆكڤیـل كـەمتر لـەبارەی ئەمـەریكا زۆرتر لەبارەی فەڕەنساوە نیگەرانی باڵادەستی دەوڵەت بوو بەسەر كۆمەڵگادا. بەڵێ تۆكڤیل بە پێچەوانەی كۆنستانتەوە كە بە توندی بەرگری لـە مۆدێرنـەی سیاسـیی دەكـرد، هەڵوێسـتێكی خۆپـارێزی بەرامبـەر بـە مۆدێرنـەی سیاسـی هەبوو. گەرچی لەرووی واقعیەوە قبوڵی دەكرد. هەروەها گەرچی مۆدێرنەی سیاسیی بە ناچار و قـابلی گەڕانـەوە نـەدەزانی، بـەڵام پەنجـەی دەخسـتە سـەر زیـان و مەترسـیەكانی و ڕێگـە چارەیەكیشی دەخستە بەر دەست.

### 3_ ماركس و ڕەخنە لە دەوڵەتی مۆدێرن

مـاركس هـەنگاوێكی زیـاتر لـە تۆكڤیـل ڕۆیشـت و دەوڵـەتی مـۆدێرنی بەشـێوەیەكی جیـاواز و بـە ئاشـكرا و بـێ هـیچ گومـان و دودڵیەك ڕەخنەكرد و ئارەزوی بۆ لەناوچوونی دەخواست. ماركس بە میتۆدێكی تازەگەرانە و هوشـیارانە ئـەم مەسـەلەیەی تـاوتوێكرد و بـە وردبینیـەوە خەسـڵەتی دەوڵـەتی مـۆدێرنی شـــیكردەوە و بـــە پیشـــاندانی پرۆســـەی دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن، جیاوازیەكانی لەگەڵ دەوڵەتی پێشمۆدێرندا، دەرخست. دیارە دەبێ سەرنج لەوە بدەین كە ماركس لەبنەڕەتدا لـە نوسـینەكانی قۆنـاغی لاویـدا و بەتایبـەتی لـــە"ڕەخنـــە لـــە فەلســـەفەی یاســـایی هیگڵ"(1843)و "مەسەلەی یەهود"دا (1843) ئەمكارەی كردووە.

مـــاركس ســـەرەتا خەســـڵەتی دەوڵـــەتی مـــۆدێرنو دەوڵـــەتی پێشـــمۆدێرن بـــە وردی ڕوندەكاتـــەوە و ئـــەمكارەش یارمەتیـــدەدەن

بۆئــەوەی جیاوازیــە بونیادیــەکانی ئــەم دوو دەوڵەتــە ئاشــکرا بکــات. پاشــان چــۆنێتی گواستنەوە لـە یەکەمـەوە بـۆ دوهـەم لەرێگـەی پرۆسـەیەکەوە کـە نـاوی "شۆڕشـی سیاسـی" لێدەنێت، پیشاندەدات. بەڵام ئەم شیکردنەوەیە بە ئاشکراکردنی کەموکوڕیە قوڵەکانی دەوڵەتی مــۆدێرن، مارکســی بــەرەو رەخنــەگرتن و پێشـبینیکردنی لەناوچـون یـان تێپـەڕین لێـی، رێنمایی کرد.

### أ) دەوڵەتی پێشمۆدێرن و دەوڵەتی مۆدێرن:

لەدیـدی مارکسـدا دەوڵـەتی پێشـمۆدێرن بـە جیانەبونـەوەی دەوڵـەتی سیاسـی و دەوڵــەتی ناسیاسـی دەناسـرێتەوە. دەوڵــەتی سیاسـی بریتیە لە دەزگایەکی سیاسی بە هەموو رەگەزە جۆراوجۆرەکانیــــەوە (پاشـــا، حکومـــەت، ئەنجومەنەکان، دەزگای بـەڕێوەبردن و...) کە بە هــەمان شــکڵی دەوڵــەتی مــۆدێرن دەژمێرێـت. دەوڵەتی ناسیاسیش لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا دێتــــەوە بــــە هــــەموو رەگــــەزە پێکهێنــــەرە جۆراوجۆرەکانیــەوە (تاکــەکان، خێزانــەکان، گروپـەکان، چینەکان، پلـەکان..) کە بـە هـەمان کەرەسـە یـان ماهیـەتی دەوڵـەت دەژمێـرێن. لـە دەوڵـەتی پێشـمۆدێرندا جیابونـەوەی دەوڵـەتی سیاسـی و دەوڵـەتی ناسیاسی نیە لەبەرئـەوەی بـواری سیاسـی لـە بوارەکانی دی جیانەبۆتـەوە: "هێشتا دەزگایەکی سیاسی جیاواز لە دەوڵـەتی واقعـی و مـادی" واتـە جیـاواز لـە کۆمـەڵگای مـەدەنی "بـوونی نیـە". بـە دەربڕینێکـی دی " هێشتا دەوڵـەتی سیاسـی وەك شێوەی دەوڵـەتی مادی، پەیدا نەبوەوە. لە ئەنجامدا "لـە دەوڵـەتی پێشمۆدێرندا، دەوڵـەتی سیاسـی بـە نـەفیکردنی بوارەکـانی دی، فـۆرم بــە نــاوەڕۆکی دەوڵــەت دەدات": بەوشێوەیە کە لەگەڵ هـەیولا دەوڵەتدا دەبێـت بـە یـەك شـت. بوارەکـانی دی بـونێکی تایبــەتیان نیــە، واتــە دەوڵــەت و کۆمــەڵگای مــەدەنی بــوون بــە یــەك شــت و تێکــەڵبوون و لەیــەکجیا نەبونەتــەوە. هــەر لەبەرئەمــەش لــە دەوڵەتـە پێشـمۆدێرنەکاندا "خـەڵکی و دەوڵـەت یەکەیەکی جەوهەری پێکدەهێنن".

مارکس دوو نمونە بۆ دەوڵـەتی پێشـمۆدێرن دەهێنێتەوە"دەوڵەتشاری یۆنـانی لـە سـەردەمی دێرینــدا و دەوڵــەتی فیــودالی لــە ســەدەکانی ناوەڕاسـتدا. لـە دەوڵەتشـاری یۆنانیـدا تـەنیا ناوەڕۆکی واقعی بریتی بوو لە ژیـانی هاوڵاتیـان و لێرەوە لەگـەڵ ماهیـەتی دەوڵەتدا بەیـەك شت دادەنـرا. لەراسـتیدا مرۆڤی تایبـەتی(خسوسـی) نـە بوونی هـەبوو نـە ئازاد بـوو. بـە دەربڕینێکـی دی ژیانی هاوڵاتیان بریتی بوو لە بەشداریکردن لـە ژیـانی سیاسـی لـە دەوڵەتشـاردا و لێـرەوە هاوڵاتیان نە ژیانی تایبەتیان هـەبوو، نـە ئازادی فـەردی. لەسـەدەکانی ناوەراستیشـدا جیـاوازی لــەنێوان دەوڵــەتی سیاســی و کۆمــەڵگای مەدەنیــــدا نــــەبوو. هــــەمویان رەگــــەزە جۆراوجۆرەکـــانی کۆمـــەڵگای سیاســـی بـــوون: "هـــەموو بـــوارێکی تایبـــەتی، خەسڵەتێکی سیاسـی هـەبوو، لەراسـتیدا بـواری سیاسیی بوو"40".

موڵکایەتیش خەسڵەتێکی سیاسـی هـەبوو و لێرەوە نەیدەتوانی تەنها شتێکی تایبـەتی بێـت. هـەر لەبەرئەمـەش لـەنێوان دەوڵـەت و خەڵکیـدا

چونیەکی هەبوو" ژیانی خەڵکی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و ژیانی دەوڵەت چونیەك بوون". بەکورتی نە دەوڵەتی سیاسی هێشتا لە کۆمەڵگا جیابووبۆوە و نە مرۆڤەکانیش خاوەن ئازادی تاکەکەسی بوون.

مارکس لە "مەسەلەی یەهود"دا بە گەڕانەوە بۆ ئەم خاڵە رونیدەکاتەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کۆمەڵگای مەدەنی "راستەوخۆ خەسڵەتێکی سیاسی هەبوو" واتە رەگەزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی (خێزانەکان، چینەکان، پلەکان..) هاوکات بە رەگەزی دەوڵەتیش دەژمێران و گەرچی "کۆمەڵگاگەلێکی تایبەتیان لەناو جەرگەی دەوڵەتدا" پێکدەهێنا، بەڵام خەسڵەتێکی راستەوخۆ سیاسیان هەبوو، چونکە دەوڵەت لەوان پێکدەهات و لەراستیدا لەنێوان دەوڵەت وەك هەمەکیەك و تاکەکان وەك بەشەکانی ئەو هەمەکیە، دەوری ناوبژیوانیان دەبینی. تاکەکان نەك بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەڵکو تەنها بە ناوبژیوانی پلەکان و چینەکاندا (کە رێگەی دەستگەیشتن بە ژیانی سیاسی پێدەدان) بەشداریان لە ژیانی دەوڵەتدا دەکرد. لێرەوە دەوڵەت بە کۆمەڵێك کۆمەڵگای تایبەت دەژمێررا و یەکبوونی پێویستی بە بوونی فەرمانڕوایەکی جیا لە خەڵکی و لەسەرو ئەم کۆمەڵگایەنەوە هەبوو کە دەسەڵاتی سیاسی بەکاردەهێنا.

بە بڕوای مارکس دەوڵەتی مۆدێرن بە پێچەوانەی دەوڵەتی پێشمۆدێرنەوە، بە جیابونەوەی دەوڵەتی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی دەناسرێتەوە و وەك "پێکەوەبوونی دەوڵەتی سیاسی و دەوڵەتی ناسیاسی" دەردەکەوێت. واتە پێکەوەبوونی بواری سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی". لەراستیدا دەوڵەتی سیاسی بە جیابونەوە لە کۆمەڵگا و بەدەستهێنانی خودموختاری، فۆرم وەردەگرێت. بەڵام دەبێ سەرنج لەوەش بدەین کە هاوکات لەگەڵ ئەم جوڵەیەدا کۆمەڵگای مەدەنیش بونێکی تایبەت وەردەگرێت، هەرئەمەش ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشێت لە ژیانی تایبەتیدا ئازاد بێت. لەئەنجامدا ئەوەی دەوڵەتی مۆدێرنی پێدەناسرێتەوە: "ئەو ئەرکەیە کە سیستەمی یاسایی دەبێتە واقعێکی تایبەت لەپاڵ ژیانی واقعی خەڵکیدا، دەوڵەتی سیاسی دەبێت بە سیستەمی یاسایی" خەڵکی واقعی".

## ب) دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن

مارکس پاش پیشاندانی جیاوازی نێوان دەوڵەتی پێشمۆدێرن لەگەڵ دەوڵەتی مۆدێرندا، چۆنێتی گواستنەوە لە یەکەمەوە بۆ دوهەم ئاشکرا دەکات. مارکس لەمبارەیەوە دەڵێت: پێویستیە کە "دەوڵەتی سیاسی" لەسەر بناغەی رەگەزە جۆراوجۆرەکانی ژیانی خەڵکی دروستدەکات" و ئەمەش پێویستی بە جیابونەوەی دەوڵەتی سیاسی -وەك جەمسەری قازانج و بەرژەوەندی گشتی- و کۆمەڵگای مەدەنی -جێگەی ژیانی تایبەتی و بەرژەوەندی تایبەتی- هەیە. ئەم دوانە هاوکاتی یەك دروستدەبن و بونێکی سەربەخۆ وەردەگرن. واتە هاوکات لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی سیاسیدا، کۆمەڵگای مەدەنیش بە ئامادەکردنی

ئەو ئەگەرەی کە بوارە تایبەتیەکان بە ئازادی بگەن، دروستدەبێت. لە ئەنجامدا " سیستەمی یاسایی سیاسی تەنها لە جێگەیەکدا بەشێوەیەکی کامڵ گەشەدەکات و پەرە دەستێنێ کە بوارە تایبەتیەکان سەربەخۆییان وەرگرتبێت. لەو شوێنەدا کە سەوا و مامەڵە و بازرگانی و موڵکایەتی زەوی ئازاد نەبێت، یان هێشتا سەربەخۆ نەبێت، ئەوا سیستەمی یاساییش ئازاد نابێت". بەمشێوەیە لەدیدی مارکسەوە مۆدێرنەی سیاسی لەسەر بناغەی جیابونەوەی دەوڵەتی سیاسی لە کۆمەڵگای مەدەنی راوەستاوە کە هەر یەکەیان بونێکی تایبەتیان وەرگرتووە. هەر لەبەرئەمەش هەم دەوڵەتی سیاسی و هەم کۆمەڵگای مەدەنی سەر بە سەردەمی مۆدێرنن.

مارکس لە کتێبی "مەسەلەی یەهود"دا دەستدەکات بە شیکردنەوەی پرۆسەی گواستنەوە لە دەوڵەتی پێشمۆدێرنەوە بۆ دەوڵەتی مۆدێرن و ناوی دەنێت "شۆڕشی سیاسیی". ئەم شۆڕشە بە گۆڕانی کۆمەڵگای فیودالی، رێکخستنی سیاسی پێشو ژێروژور دەکات و هاوکات فۆرم بە دەوڵەتی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی دەدات. لە راستیدا شۆڕشی سیاسی " کۆمەڵگا بچوکەکان" (پلەکان و گروپەکان..) وێران دەکات و "رەهەندی سیاسی" لە کۆمەڵگا دەستێنێت و بە دەوڵەتی دەبەخشێت" رزگاربوونی سیاسی هاوکاتە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای پێشمۆدێرندا (....) شۆڕشی سیاسی هەمان شۆڕشی کۆمەڵگای مەدەنیە". ئەم پرۆسەیە جیابونەوەی دەوڵەتی سیاسی و کۆمەڵگای مەدەنی دەهێنێتەدی و فۆرم بەم دوانە وەك بونێکی سەربەخۆ دەدات.

لەلایەکەوە سەرەتا ئەم شۆڕشە (رۆحی سیاسی) پەرشوبلاو لەناو کۆمەڵگا فیودالیەکاندا ئازاد دەکات و پاشان کۆیان دەکاتەوە تا فەزایەکی دامەزراو لەسەر هاوبەشی بەرژەوەندیەکان و قازانجی گشتی، دروستبکات. وێرانکردنی گروپەکان ئەو توانایە بە تاکەکان دەبەخشێت، ببنە خاوەن بونێکی سیاسی و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری لە ژیانی دەوڵەتدا بکەن و لە ئەنجامدا ببنە هاولاتی. لێرە بەدواوە چیدی تاکەکان پێویستیان بە ناوبژیوانی پلەکان و گروپەکان نیە، بەڵکو بەشێوەیەکی راستەخۆ دەستیان بە ژیانی سیاسی دەگات.

لەلایەکی دیەوە ئەم شۆڕشە سیاسیە فۆرم بە کۆمەڵگای مەدەنی وەك بونێکی جیاواز لە دەوڵەت دەدات، ئەم کۆمەڵگایە بۆ رەگەزە تاکەکان شیدەکاتەوە و دەیکات بە پانتاییەك بۆ بەرژەوەندیەکانی تاکەکەس. لێرە بەدواوە چالاکیە جیاوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، هەموو رەهەندێکی سیاسی لەدەستدەدات و تەنها رەهەندێکی تاکەکەسی و تەنانەت خۆویستانەیان دەبێت "رزگاربوونی سیاسی کارێك بوو کە بەهۆیەوە کۆمەڵگای مەدەنی خۆی لە کۆت و بەندی سیاسەت رزگارکرد". لە ئەنجامدا دەوڵەتی مۆدێرن وەك جەمسەری بەرژەوەندی و قازانجی گشتی و کۆمەڵگای مەدەنی وەك جێگەی بەرژەوەندی تایبەتی، هاوکات و پێکەوە دروستدەبن: "دروستبوونی

دەوڵـەتی سیاسـی و دابەشـبوونی کۆمـەڵگای مـەدەنی بـۆ تاکـە سـەربەخۆکان (....) بـە هەنگاوێکی تاکانە و یەکتا ئەنجامدەدرێت".

پێبـەپێی جیابونـەوەی دەوڵـەتی سیاسـی و کۆمەڵگای مەدەنی، لە خودی مرۆڤیشدا درزێك دروسـتدەبێت. بـەو شـێوەیە کـە مـرۆڤ دابەشدەبێت بەسەر دو پارچەدا واتە هـاوڵاتی - ئەنـدامی دەوڵـەت- و تاکەکـەس -ئەنـدامی کۆمـەڵگای مـەدەنی- . بـەمجۆرە شۆڕشـی سیاسـی هـەم هـاوڵاتی یـا "مرۆڤـی سیاسـی" و هەم تاکەکەس یا مرۆڤی تایبـەتی دروستدەکات "رزگار بوونی سیاسیی هەمان گۆڕینی مرۆڤە لە لایەکەوە بۆ ئەندامی کۆمەڵگای مەدەنی واتـە بۆ تاکێکی سـەربەخۆ و خووویست، هـەم لەلایـەکی دیەوە بۆ هـاوڵاتی واتـە کەسایەتیەکی یاسایی.

دەبـێ سـەرنج لـەو خاڵـە بـدەین کـە پەیـدابوونی هـاوڵاتی و تاکەکـەس هاوکـات روودەدات و یـەکێکیان ناتوانێـت بـێ ئـەوی دی روبـدات. لـە ئەنجامـدا لـە پـاڵ مافـەکانی هاوڵاتیـدا کـە بـە هـەمان مـافی سیاسـی یـا هـاوڵاتی دەژمێرێـت، مافی تایبـەتی تاکەکەسیش هەیـە کە بە هـەمان مافـەکانی مـرۆڤ ناودەبرێـت. لێـرەوە تاکەکـەس کۆمەڵگای مەدەنی بە بناغەی دەوڵـەتی سیاسـی دەژمێرێت و و دەوڵـەتی سیاسیش ئـەم راستیە بـە راگەیانـدن و قبـوڵکردنی مافـەکانی مـرۆڤ بـە فەرمی دەناسێت.

دەکرێـت بـەکارهێنانی تایبـەتی ئـەم شیکردنەوەیە لە مۆلکایەتیدا ببینرێت. مارکس لـە کتێبـی ئایـدۆلۆژیای ئەڵمانیـدا (1845-1846) پەیوەنـدی گـۆڕانی دەوڵـەت و گـۆڕانی موڵکایـەتی پیشـاندەدات و پەنجـە دەخاتـە سـەر پەیوەنـدی دەوڵـەتی مـۆدێرن و موڵکایـەتی تایبـەتی. لـە روی مێژووییـەوە ئـەم دوانـە هاوکـات پەیـدابوون و لەراسـتیدا موڵکایـەتی شێوەی گشتی پێشوی واز لێهێنا و شێوەیەکی تایبـەتی و فـەردی بەخۆیـەوە گـرت: "دەوڵـەتی مـۆدێرن لەگـەڵ ئـەم موڵکایەتیـە تایبەتیـەی مۆدێرندا، گونجاو و هاوشێوەیە".

لەراستیدا کاتێك دەوڵـەتی مۆدێرنی جیا لە کۆمەڵگای مەدەنی بوو بـە شتێکی پێویست کە موڵکایـەتی شـێوەی گشـتی لەدەسـتدا و و دەوڵـەتی مـۆدێرن بـۆ پارێزگـاری لـە موڵکایـەتی تایبەتی لەبەرامبەر هەڕەشە جۆراوجۆرەکانەوە، دروسـتبوو: "هاوکـات لەگـەڵ ئـازادبوونی موڵکایـەتی تایبـەتی لـە دەسـتی گشـت، دەوڵـەتیش لـە پـاڵ و دەرەوەی کۆمـەڵگای مەدەنی، بونێکی تایبەتی وەرگرت" و دەکرێ بە ئامێرێکی دابنێین بۆ پاراستنی ئەم موڵکایەتیە. بەمشێوەیە لـە دیـدی مارکسدا فـۆرم وەرگرتنـی دەوڵـەتی مـۆدێرن و پەیـدابوونی موڵکایـەتی تایبـەتی، لـەو روەوە پەیوەندییـەکی تەنگاوتـەنگیان پێکـەوە هەیـە کـە هاوشـان و هاوکات بە یەك چەکەرەیانکرد.

دیـارە مـارکس هـەر بـە شـیکردنەوەیەکی ئەبسـتراکتی گواسـتنەوە لـە دەوڵـەتی پێشـمۆدێرنەوە بـۆ دەوڵـەتی مـۆدێرن واز ناهێنێـت، بـەڵکو نمونـەی مێـژوویی هەڵبـژاردە دەهێنێتـەوە" واتـە شۆڕشـی فەرەنسـی. مـارکس ئـەم شۆڕشـە لەگـەڵ "مێـژووی پەیـدابوونی دەوڵـەتی مۆدێرنـدا" بەیـەك شـت دادەنێـت و تیایـدا شۆرشـێکی سیاسـی دەبینێـت کـە گواسـتنەوە لـە دەوڵـەتی پێشـمۆدێرنەوە بـۆ

دەوڵەتی مۆدێرنی بە ئەنجامگەیاندووە. جگە لەمەش مارکس ئەم شۆڕشە وەك پرۆسەی جیابونەوەیەك تەفسیردەكات كە هاوكات بووە هۆی فۆرم وەرگرتنی دەوڵەتی سیاسی و كۆمەڵگای مەدەنی و هەروەها پەیدابوونی هاوڵاتیان و تاكەكەس. ئەم پرۆسەیە بەشكلێ جیاواز خۆی دەردەخات، بەتایبەتی بە لابردنی پلەكان و داماڵینی گروپەكان و دروستبونی ئەنجومەنی نەتەوەیی، راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤ و هاولاتی و ئەوانی دی. سەرەڕای ئەمە مارکس بە بیركردنەوە لە قۆناغی كۆنڤاسیۆن و تیرۆر، بڕوایوایە كە لە هەندێك ساتەوەختدا دەوڵەتی سیاسیی دەتوانێت و تەنانەت دەبێت ململانێییەكی توندوتیژ لەگەڵ كۆمەڵگای مەدەنیدا بكات، بۆئەوەی بوونی خۆی سەقامگیر بكات. ئەم ململانێیە دەتوانێت تا لەناوبردنی رەگەزەكانی كۆمەڵگای مەدەنی وەك دین، موڵكایەتی تایبەتی و تەنانەت ژیانی تاكەكان بچێتە پێشێ: "ژیانی سیاسی لە حاڵەتی شەیدابونیدا، دەستدەكات بە خنكاندنی ئەو بنەمایەی كە لێوەی لەدایكبووە، واتە كۆمەڵگای مەدەنی و رەگەزەكانی. بۆئەوەی وا لە مرۆڤ بكات ژیانی چۆنایەتی خۆی وەك ژیانێكی واقعی و هاوئاهەنگ، قبوڵبكات. بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانجێكی وا پێویستە بە توندوتیژی روبەڕوی مەرجەكانی بوونی خۆی بوەستێتەوە".

بەڵام ئەگەرچی شۆڕشی فەرەنسا ئامانجی خۆی بە بەرپاكردنی دەوڵەتی مۆدێرن داناوە، زۆری پێنەچوو كە بە لاڕێدا رۆیشت و كەوتە داوی دژایەتییەكی ئاشكراوە. لەراستیدا رۆبسپێر و سین ژۆست كە لە قۆناغی كونڤاسیۆندا بە بەشداریەكی زۆریان لە فۆرم وەرگرتنی دەوڵەتی مۆدێرندا كرد، لە دیدی ماركسدا توشی تێكەڵیەكی ترسناك بوون كە "وەهمێكی مەزنی" بەدوای خۆیدا هێنا، چونكە "كۆماری دێرینیان(...) لەگەڵ دەوڵەتی مۆدیرندا كە لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی راوەستاوە، تیكەڵ بەیەككرد". بەدەربڕینێكی دی دەوڵەتی مۆدێرنیان لەگەڵ دەوڵەتی پێشمۆدێرندا تێكەڵكرد و ئەمەش بەرەو ناكۆكیەكی شوم و كوشندەی بردن. لەراستیدا ئەوان دەیانویست دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر بناغەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن بهێننە دی و دەیانویست تا " سەری سیاسی" كۆمەڵگای مەدەنی "بەشێوەیەكی دێرین قاڵبگیری بكەن". بەهەمانشێوە تیرۆریش دەیویست "شێوەی دێرینی ژیانی سیاسی" بسەپێنیٚ". بەكورتی دەبێت دژایەتی رۆبسپێر و سێن ژۆست لەم خاڵەدا بدۆزرێتەوە: ئەوان نەیاندەتوانی لەیەككاتدا هەم دەوڵەتێكی مۆدێرن دروستبكەن كە مافی مرۆڤ دەسەپێنێت و هەمیش وەك دەوڵەتی پێشمۆدێرن لە قاڵبی بدەن كە ئاگای لە مافی مرۆڤ نەبوو. ئەوان نەیاندەتوانی لەیەككاتدا هەم كۆمەڵگای مەدەنی بە ئازادیەكانییەوە بە فەرمی بناسن و هەم خوازیاری لەناوبردنی نیشانە بنەڕەتیەكانی ئەم كۆمەڵگایە بن. ئەم كارە لەو روەوە نەشیاوە كە مافەكانی مرۆڤ "مافی ئەو مرۆڤە دەستنیشاندەكات كە ناتوانێت مرۆڤی كۆمەڵ و پێكەوەبونستان بێت". بەمشێوەیە دەبێ تێكشكانی رۆبسپێر و سن ژۆست لە

تێکەڵکردنی دەوڵەتی مۆدێرن لەگەڵ دەوڵەتی پێشمۆدێرن و هەروەها خواستی ئەوان بۆ بونیادنانی دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر شێوەی نمونەی دەوڵەتی پێشمۆدێرن، بدۆزینەوە. دەرئەنجامی ئەم حاڵەتەش ئەوە بوو کە ئەم شۆڕشگێڕانە لەبری ئەوە ئاسانکاری بۆ فۆرم وەرگرتنی دەوڵەتی مۆدێرن بکەن، پتر دەوریان لە دواخستنی بەدیهاتنیدا بینیوە.

## ج) دەوڵەتی مۆدێرن

شیکردنەوەی مارکس بۆ دەوڵەتی مۆدێرن و پەیدابوونی بەشێوەیەکی سروشتی، رایانکێشا بۆ رەخنەکردنی ئەم دەوڵەتە و دواجار رەدکردنەوەی مۆدێرنەی سیاسی. لەراستیدا جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە هەمکیەکی چونیەکدا درزێك دروستدەکات و دوو رەگەزی جیاواز روبەڕوی یەك دادەنێت. لەشوێنێکدا کە پێشتر یەکێتی هەبوو، دژایەتیەك دەردەکەوێت و دەوڵەت رووی لە بالادەستی بەسەر کۆمەڵگادا هەیە. مارکس تەنها بە پیشاندانی کەموکوریەکانی دەوڵەتی مۆدێرن واز ناهێنێت، بەڵکو شێوەکانی تێپەراندنیشی تاوتوێدەکات و پاشان بۆ زاڵبوون بەسەر جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، رو لە دیموکراسی دەکات. لەراستیدا مارکس دیموکراسی وا دەبینی کە دەتوانێت یەکێتی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی سەرلەنوێ بونیادبنێتەوە، چونکە لە دیموکراسیدا ئەوە خەڵکە رژێمی سیاسی دەستنیشاندەکات. هەر لەبەرئەمەش لە دیدی مارکسدا "دیموکراسی مەتەڵی هەڵهێنراوی هەموو سیستەمە یاساییەکانە". واتە بە رێگە چارەی کێشەیەك دادەنرێت کە هەر رژێمێکی سیاسی دەیهێنێتە پێشێ. دیموکراسی لەو روەوە دەکرێت بە رێگە چارە بزانرێت کە جیابونەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت دادەماڵێ و بە مافی پێشخستنی خەڵکی بەسەر دەوڵەتدا و بە بەستنەوەی دەوڵەت بە کۆمەڵگاوە، یەکێتی ئەم دوانە سەرلەنوێ بونیاد دەنێتەوە.

مارکس بەتایبەتی وابیردەکاتەوە کە یەکێتی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانێت لەرێگەی بڵاوبونەوەی دەنگدان بۆ هەموان بەدیبێت، چونکە توانای بەشداریکردن لە بریارەکانی دەوڵەتدا بە هەموو هاوڵاتیان دەدات. لە دیدی مارکسەوە "دەنگدانی گشتی پەیوەندی بێ ناوبژیوان و راستەوخۆی (...) کۆمەڵگای مەدەنیە لەگەڵ دەوڵەتی سیاسیدا (...) تەنها لە دەنگدانی بێسنوردا -چ کاریگەرو چ ناکاریگەر- یە کە کۆمەڵگای مەدەنی بە ئەبستراکتی خۆی و و بوونی سیاسی وەك بونێکی واقعی و گشتی و بنەڕەتی دەگات". گشتیبوونی رای گشتی جیابونەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت دادەماڵێ، یەکێتی کارایان بەدیدێنێتەوە و دواجار بە لەناوبردنی دەوڵەتو کۆمەڵگای مەدەنی وەك دو بوونی نەیاری یەکدی، دەبێتە هۆی لەناوبردنی هاوکاتی هەردوکیان: "کەوابوو خواستی ریفۆرمی سیستەمی دەنگوەرگرتن، هەمان خواستی توانەوەی دەوڵەتی سیاسی ئەبستراکتە لەناو هەمان دەوڵەتدا کە دیارە خواستی توانەوەی

کۆمەڵگای مەدەنیشە". بەمشێوەیە مارکس بە رەدکردنەوەی دەوڵەتی مۆدێرن وازناهێنێت، بەڵکو پێشنیاری بەرپاکردنی یەکێتی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بەهۆی دیموکراسی و دەنگدانی گشتیەوە دەکات.

وەك بینیمان شۆڕشی سیاسی بە جیابونەوەی هاولاتی و تاکەکەس، دو پارچەییەك لە ناو مرۆڤدا دروستدەکات. ئەم رەوتە لەو روەوە نامۆبوونی مرۆڤ لە دەوڵەتدا بەدوای خۆیدا دەهێنێت کە مرۆڤ بۆ دروستکردنی دەوڵەت دابەش دەبێت بەسەر دو پارچەدا. لە دیدی مارکسدا ئەم نامۆبونە کاتێك لەناودەچێت کە مرۆڤ واز لە دوپارچەبوونی خۆی بهێنێت و یەکێتی خۆی بدۆزێتەوە. لەئەنجامدا دەبێت جیابونەوەی هاولاتی و تاکەکەس و هەروەها جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لەناوببرێت. کارێکی وا پێویستی بەوەیە مرۆڤ لەناو خودی خۆیدا هاولاتی بدۆزێتەوە و "هێزی کۆمەلایەتی بەشێوەی هێزی سیاسی" لە هاولاتی نەسڕێتەوە. بەدەربڕینێکی دی مرۆڤ دەبێت جەوهەری خۆی کە لە دەوڵەتدا نامۆ بووە، بدۆزێتەوە و یەکێتی خۆی بەدەست بهێنێتەوە. رەوتێك کە هەم دو پارچەیی مرۆڤ و هەم جیابونەوەی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دادەماڵێت.

هەڵوێستی مارکس بە پێچەوانەی کۆنستانس و تۆکڤیلەوە، بەرامبەر بە دەوڵەتی مۆدێرن زۆر رەخنەگرانەیە. مارکس بە نمایشی خەسڵەتی واقعی و کەموکوڕیەکانی دەوڵەتی مۆدێرن، شیکردنەوەیەکی تازە و رۆشنگەرانە بەدەستەوە دەدات کە سەرەتا بە رەخنە و پاشان رەدکردنەوەی دەوڵەت دەگات کە لەنێوان بواری سیاسی و بواری تایبەتی و هەروەها لە نێوان بواری هاولاتی و تاکەکەسدا، جیابونەوەی دروستکردووە. وەك بینیمان ئەم جیابونەوەیە دەبێتە هۆی نامۆبوونی مرۆڤ و دەوڵەت روبەڕوی کۆمەڵگا دەکاتەوە. رێك لەبەرئەمە مارکس بە دوای لەناوبردنی ئەم جیابونەوەیە و بەرپابوونی دوبارەی یەکێتی مرۆڤە. ئاشکرایە مەبەستی مارکس گەڕانەوە نیە بۆ دەوڵەتی پێشمۆدێرن، بەڵکو دەیەوێت بە هاوکاری دیموکراسی و دەنگدانی گشتی و لە روانگەی بونیادی پێکەوەستانی واقعی مرۆیی، لە دەوڵەتی مۆدێرن بچێتە سەرەوە. ئەم روانگەیە کە لە نوسینەکانی قۆناغی لاویدا پەرەپێدرا و هیچ کاتێك فەرامۆش نەکرا، دەتوانێت تێڕوانینی دوایی مارکس بۆ کۆمەڵگای کۆمۆنیست رونبکاتەوە کە وەك "پێکەوەبونستانێك" نمایشکراوە کە تیایدا دەوڵەت جێگەیەکی نابێت. لێرەوە لەدیدی مارکسدا تێپەڕین لە دەوڵەتی مۆدێرن، لە کۆمەڵگای کۆمنیستی و بەهۆی کۆمەڵگای کۆمنیستیەوە، بەدیدێت.

**سەرچاوە:**

وەرگێرانی فەسڵی سێهەمی کتێبی: "مۆریس بارییە: مدرنیتەی سی اسی. ت. عبدالوهاب احمدی. تهران – اگە 1383"

# چاوخشاندنێك بەسەر واتای پۆست مۆدێرنیزمدا

رامین جەهانبەگلوو
لە فارسییەوە: سامان کۆنەپۆشی

**1ـ مانای وشە:**

پەیڤی "پۆست مۆدێرنیزم" لە رۆنانی پێشگری "پۆست"(*post*) و "مۆدێرنیزم" (*modrrnism*) پێك هاتوە. مۆدێرنیزم لە مۆدێرن و مۆدێرنیتە و ئەم دوو پەیڤەش لە رەچەڵەکی لاتینی (*modo*) کە بە مانای (ئێستا) دێت، وەرگیراون. هەر بۆیە دەبێ سەردەمەکانی پێش مۆدێرن(*premodern*)، مۆدێرن(*modern*) و پۆست مۆدێرن(*postmodern*)) لێك جیابکەینەوە. بە کورتی پێش مۆدێرن بە سەردەمێك دەگوترێ کە تاك لەژێر کاریگەری و زاڵیەتی لاهووتی و دەسەڵاتی سیاسیدایە. لە قۆناخی مۆدێرندا تاکایەتی بەرز دەبێتەوە و نەریت رەخنەکاری دەکرێت. لەم قۆناخەدا تاکی مۆدێرن بە سەرهەڵدان یاخود سەرهەڵدان لە فۆرمی ناسکاری دێکارتیدا، خۆی بە سەروەر و خاوەنی سروشت لە قەڵەم دەدا و نرخ و بەها بە مانای پێشکەوتن و تێروانینی هەنووکەیی بۆ مێژوو دەدات. لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی قۆناخی مۆدێرن دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانە بکەین: ئاگایی تاك بە نیسبەت تاکایەتی خۆی، پێداگرتن لەسەر ئازادییە تاکەکسییەکان و ئەو شتەی کە ماکس ڤیبەر بە "سڕینەوەی ئەفسوون لە جیهان" ناوی دەبات. ئەم قۆناخەی مێژووی مرۆڤایەتی بە رووداوگەلێکی مێژوویی وەك شۆڕشی ئەمریکا و فەرەنسا و راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا و جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی ساڵی 1789 ی فەرەنسا دەستی پێکرد. مۆدێرنیتەش سەردەمی جەختکردنەوەیە لەسەر زانستی گالیلەیی و نیوتنی هاوکات لەگەڵ شۆڕشە زانستی و کۆمەڵایەتییەکان لە رۆژئاوادا. بە دەربڕینێکی دیکە، قۆناخی مۆدێرن یان مۆدێرنیتە لە دوو توخمی سەرەکیدا کورت دەکرێتەوە:

1ـ ئـاوەزی ئـامرازی ــ بـە مانـای زاڵیـەتیی مـرۆڤ بەسـەر سروشـت و مرۆڤـدا لـە ڕێگـای بەکارهێنانی زانست و تەکنۆلۆژییەوە.

2. ئاوەزی ڕەخنەگرانە ـ بە مانای پێداگریی لەسـەر ناسـکاری (بابـەت)ی ئۆتۆنـۆمی کـە ناسـێنەری خـۆ و جیهانـە و جـەخت لەسـەر ئازادییە تاکەکەسییەکان دەکاتەوە.

لە باری مێژووییەوە، کولتووری مۆدێرن بە قۆنـاخی ڕێنسـانس دەسـت پێـدەکا و لەگـەڵ سـەردەمی ڕۆشـنگەری و شۆڕشـی فەرەنسـا و ئایدیالیزمی ئاڵمانیدا، وەك دیسکۆرسی کلیلی ڕۆژئاوا دەچەسپێت.

هـــزری پۆســـت مـــۆدێرن چەشـــنێك بیرکردنەوەیـە کـە بـە ئامـانجی دیـاریکردنی سـنوورەکانی ئەقڵانییـەتی مـۆدێرن دەسـت دەداتـــە ڕەخنـــەکاریکردن و تـــەواوکردنی مۆدێرنیتـە. ئەگەرچـی زۆرکـەس لـەم بڕوایـەدان کە پۆست مۆدێرنیزم بە جۆرێك لە جۆرەکان بە کۆتـایی مـۆدێرنیزم بـە ئـەژمار دێـت، بـەڵام لـە ڕاستیدا پۆست مۆدێرنیزم بە ڕوانگەیەکی ـ چ فەلسـەفی و چ هونـەری ــ دەگـوترێ کـە لـە چوارچێوەی مۆدێرنیزمدا بیچم دەگرێت. لەگەڵ ئـــەوەدا کـــە پۆســـت مـــۆدێرنیزم ڕووبەڕووبوونەوەیـــــەکی دژبەرانـــــەی چوارچـێوەی مۆدێرنیزمـە، بـەڵام لـە نێـو لێزگەی فکری و فەلسەفی مۆدێرندا ڕوودەدات. هاوکـــات لەگـــەڵ ئەوەیکـــە کـــوڕی مۆدێرنیتەیـــە ئامانجـــەکان و گوتارەکـــانی ڕووبەڕوی ململانێ دەکاتەوە.

پۆسـت مـۆدێرنیزم دەخـوازێ بـاوەڕی قۆناخی مۆدێرن بە ئاوەز، کە وەك هەمەکیترین و بابـەتیترین بەڵگـەی واقعییـەت چـاوی لێـدەکرێ، هـەروەها ئـەم بڕوایـەی کـە هـەموو گـۆڕان و گۆڕانکارییـە کۆمەڵایەتییـەکان لەسـەر بنـەمای چـالاکیی ئـاوەز ڕوودەدەن، ڕەخنـەکاری بکـات. لەم ڕوویەوە، پۆست مۆدێرنیزم هاوکات لەگەڵ ڕەخنـــەکاریی پـــڕۆژەی ڕۆشـــنگەری و چـەمکگەلێکی وەك پێشـکەوتن، هەمەکییـەت، ئەقڵانییـەت و سیسـتماتیکبووندا، گومـان لـە هـەموو بنـەما تاکەکەسـی و کۆمەڵایەتییـەکانی مۆدێرنیتـە و پێکهاتـەی مەعریفـەیی دامـەزراوە سیاســـییەکان دەکـــات. بـــە کـــورتی پۆسـت مـۆدێرنیزم ململانێیـەکی فەلسـەفی، هونـــەری، کۆمەڵناســـانە و سیاســـییە بـەدژی هـەموو کۆڵەکـەو بنـەما فکـری و سیاسـی و زانسـتییەکانی مۆدێرنیتـە و لەوانە هیومانیزم، لیبرالیزم، ڕیالیزم و زانستی نوێ و تەکنۆلۆژی.

سـەردەمی ڕۆشـنگەری کـە پێـی وابـوو قۆنـاخی تـاریکی و خورافـەی بەجێهێشـتووە، ڕەخنـەکانی خـۆی ئاراسـتەی دەسـەڵاتی کڵێسـایی کـرد و بـەم کـارەش دۆزی ڕەوایـەتیی سیاسیی مۆدێرنی هێنایە گۆڕێ، بە پشتبەستن بـە شۆڕشـی نیـۆتنی و بـاوەڕ بـە پێشـکەوتنی زانسـتی و ئاکـاری مـرۆڤ، بنـەما ئـابووری و سیاسییەکانی سەدەی هەژدەیەمی پێك هێنا کە لە لیبرالیزمی ئابووری و سیاسیدا دەرکەوتوون. ڕۆشـــنگەری پێـــی وابـــوو کـــە، ناســـین، چـەمکێکی پووچـەڵ و بابەتییـە کـە دەتـوانێ ببێتـە بنـەمای ئـازادی و ڕزگـاری مـرۆڤ و خەونەکەشی ئەوە بوو کە لە ڕێگای ئەم ناسینە فەلسـەفی و زانسـتییەوە بەسـەر جیهـان و

پێشکەوتنی مرۆییدا زاڵ بێت. لە راستیدا پۆست مۆدێرنیزم ململانێیەکی جیدییە لەگەڵ ئەم روانگە و تێروانینە فەلسەفییەدا بۆ مرۆڤ و جیهان.

## 2ـ بیچمگیری فکری پۆست مۆدێرن:

زۆرکەس نیچە، هایدگەر، ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر بە بنیاتنەرانی پۆست مۆدێرنیزم دەزانن. نیچە بە یەکەمین فەیلەسووفی پێکهاتەشکێنی مۆدێرنیتە بە ئەژمار دێت کە گەلێك لە بیریارانی پۆست مۆدێرن و لەوانە دێریدا، فۆکۆ، لیوتارد و بۆدریاری خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. رووی هێرشی نیچە لە دۆزی هەقیقەتە و لە وەلامی ئەم پرسیارەدا کە "پایلێت" ئاراستەی مەسیحی دەکا کە "هەقیقەت چیە؟" و مەسیح بێدەنگ دەبێ نیچە دەبێژێت کە، "هەقیقەتەکان ساویرگەلێکن کە لە بیریان چۆتەوە کە شتێك نین جگە لە ساویر[1]."

بە وتەی پۆست مۆدێرنەکان، بیر و هزری فەلسەفەی هایدگەر لێکەوتەگەلێگی ئەرێنی و بەکەڵکی بۆ رەخنەکاریکردن و راکردن لە مۆدێرنیتە بووە، بەلام هەندێکیان لەم بروایەدان کە هایدگەر خۆی وەك دیلێکی سەردەمی خۆی دەمێنێتەوە. رەنگە بتوانین بڵێین کە هایدگەری خولی دووەم، واتە هایدگەر وەك نووسەری کتێبەکانی کات و بوون (1962) یاخود کۆتایی فەلسەفە و ئەرکی هزرین (1963)، یارمەتی باسەکانی پۆست مۆدێرن لەسەر زمان وەك سیستەمی جیاکاریی و جیاوازیی لە هێماکاندا داوە، کە ئامادەبوونیان لە پەیوەندیی لەگەڵ توخمێکدا دیاری دەکرێ کە خۆی ئامادە نییە.

هەروەها رەنگە کتێبی دیالێکتیکی رۆشنگەری ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەر زۆرترین کاریگەری لەسەر بیریارانی پۆست مۆدێرن داناوە دەربارەی رەخنەکاریی لە پرۆژەی رۆشنگەری.

تەوەری سەرەکیی ئەم کتێبە روونکردنەوەی ئەم بابەتەیە کە ئامانجی سەرەکیی رۆشنگەری ئازادکردنی مرۆڤ لە بۆشگا[2]ی ترس و خەفەکردنی سیاسی و بەدبەختی ئابووری و مادی. بەلام رۆشنگەری خۆی بووە بە ئوستوورەیەك کە بەدبەختی و چارەڕەشی بە شوێن خۆیدا دێنێت. لە روانگەی ئادۆرنۆ و هۆرکهایمەرەوە پرۆژەی ئەقلانی رۆشنگەری بووە بەهۆی زاڵبوونی تەکنۆلۆژی بەسەر جیهاندا، و هەروەها دیل و بەکۆیلەبوونی مرۆڤ لە سیستەمە تۆتالیتارەکاندا.

بە وتەی (وۆڵفگانگ ویلش) چەمکی پۆست مۆدێرن یەکەمین جار لە سەرەتاکانی ساڵەکانی 1870دا بەکار برا. بەلام ئەوەی کە روون و بەڵگەنەویستە ئەمەیە کە پەیڤی پۆست مۆدێرنیزم لە ساڵی 1926دا وەك ناوی کتێبێکی "بێرنارد بێل" بە ناوی *post modern and other Essays* بەکاربراوە. وشەی پۆست مۆدێرن لە نووسراوەکانی "چارلز ئۆڵسۆن"(ساڵەکانی 1950) لە بواری شیعر و رەخنەی ئەدەبیدا بەکار دەبرێت. ئۆڵسۆن لەژێر کاریگەریی فەلسەفەی هایدگەردا هەوڵ دەدا تا لە بواری شیعر و ئەدەبیاتدا دابڕانێك لەگەڵ

نەریتی ئاوەزخواز و هیومانیستی رۆژئاوادا پێکبێنێت. ئەو بە پشتبەستن بە بیرۆکەی هایدگەری "کۆتایی میتافیزیکی ئاوەزی ناوەندی" بنەماگەلێکی نوێ لە بواری شیعری پۆست مۆدێرندا بنیات دەنێت. "ئەروینگ هاو" لە ساڵی 1959دا وتارێکی بەناوبانگ لەمەڕ "کۆمەڵگەی جەماوەری و ئەدەبیاتی چیرۆکی پۆست مۆدێرن" دەنووسێ و لەم وتارەدا سایۆل بلو، سالینجەرو نۆرمان میلەر وەك نووسەرانی پۆست مۆدێرن دەناسێنێت.

لە نێوان ساڵەکانی 1963 و 1967دا رەوتگەلێکی دژەمۆدێرنیستی نوێ لە بواری بیناسازی و هونەر و ئەدەبیاتدا سەرهەڵدەدەن. لە نووسراوەکانی دوو نووسەر بە ناوەکانی لیۆنارد مەیر، وتاری کۆتایی رێنسانس، و ئیهاب حەسەن لە وتاری پارچەپارچەبوونی ئۆرفێوسدایە کە ئەم رەوتانە لە بواری ئەدەبیاتو رەخنەی ئەدەبیدا دەردەکەون. ئیهاب حەسەن دەخوازێ جیاکارییەك لەنێوان ئەدەبیاتی مۆدێرن و پۆست مۆدێرندا بکا کە بە بۆچوونی ئەو، ئەدەبیاتی پۆست مۆدێرن ئەدەبیاتی بێدەنگییە. ئیهاب حەسەن ئەدەبیاتی بێدەنگی بە ئەدەبیاتێك دەزانێ کە دژەمۆدێرن و دژی هەرچەشنە دووبارە نیشاندانەوەیەکە. بە وتەی ئەو، سامویێل بێکت نوێنەری ئەدەبیاتی بێدەنگییە بە واتا نوێیەکەی. حەسەن پێی وایە کە ئەدەبیاتی بێدەنگی ئەدەبیاتێکی دژەهیومانیستییە کە لە ئاماژە بەرزەفڕانەکانی مۆدێرنیزم دووری دەکات، چونکە دژی هەرچەشنە ئوتوریتاریزم، هیومانیزم و دەستەبژێری (*elitism*)یە. لیۆنارد مەیریش شوێنکەوتووی روانگەی شۆڕشگێڕانەیە بە نیسبەت مرۆڤ و لەم باوەڕەدایە کە، چیدیکە مرۆڤ سەنتەری جیهان نیە و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ درەخت، بەرد و باکترییەکاندا نییە.

لیۆنارد مەیر دەخوازێ بیچم بە ئیستاتیکایەکی دژەهیومانیستی بدات. حەسەنو مەیر لەم باوەڕەدان کە ئەدەبیاتی چیرۆکی و شیعر دەبێ لە بیری پێکهێنانی خەونگەلێکی بێئاست و سنووردا بن و بۆ ئەم کارەش دەبێ لە زمان دوور بکەونەوە. بە دوو شێوە دەکرێ لە زمان دوور بکەوینەوە: بە شێوەی کۆمێدی مالارمە و یاخود بە شێوەی بێ هەڵاواردنی ئارتوور رامبۆ.

لەپاش حەسەن و مەیر، سوزان سونتاگ و لێسلی فیدلێر لە ساڵەکانی 1960 لە ئەمریکا سەرنج لە مێتۆدەکانی رەخنەکاریی مۆدێرنیزم لە هونەر و ئەدەبیاتدا دەدەن. سونتاگ لە وتارێکدا کە لە ساڵی 1964 و لەژێر ناوی دژی شرۆڤەدا نووسی، دەبێژێت:"ئێمە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ هەست(حس)ەکانمان. ئێمە دەبێ فێر بین کە پتر ببینین، پتر ببیسین و پتر هەست پێبکەین." کەوابێ، سونتاگ راڤە و شرۆڤەکردنی پراکتیکی بە کۆنەپەرستانە دەزانێ و پێی وایە کە دەبێ دووری لێبکەین، چونکە بەهای بەرهەمە هونەرییەکان لە ماناکانی خودی بەرهەمدایە، نەك لە شرۆڤەیەکدا کە ئێمە لێیان دەخەینەڕوو.

سونتاگ لە سینەمادا دوو فیلمی ساڵی رابردوو لە مارین باد ئالێن و رێنە و ژیانی خودی ژان لوك گۆدار بە نموونە دێنێتەوە.

بە بۆچوونی سونتاگ فیلمەکەی (ڕێنە) شــرۆڤە هــەڵناگریّ و دەتــوانین بــە شــێوەی ڕاستەوخۆ لـە هەستەکانی وێنـەکان تێبگـەین. (گــــۆداریش) هەرچەشــــنە هۆکاریّــــك ڕەت دەکاتـەوەو هـەوڵی ڕوونکردنـەوەی هیچ شـتێك نادات. فیلمەکەی گۆدار ناسێنەری ڕوانگەیەکی تایبــــەت نیــــە، بــــەڵکو تێکەڵەیەکــــە لــــە دیکۆمێنتگـــــەلێکی جۆربـــــەجۆری وەك دەق، گێڕانەوە و کورتیلە وتەکان.

(فیـدلێر)یـش بـە نۆبـەی خـۆی مـەرگی مـۆدێرنیزم ڕادەگەیـەنیّ و دەبێـژێت کـە ئێمـە پێمـان ناوەتـە قۆنـاخی پۆسـت مۆدێرنـەوە کـە قۆنـاخێکی دژی ئـەقڵانی و سـۆزدارییە. فیـدلێر پێی وابوو کە ڕۆمانی پۆست مۆدێرن مەودای نێــــوان دەســــتەبژێرەکان[3] و جــــەماوەر دەسڕێتەوە، هەر بۆیە هونەری پۆست مۆدێرن هونەرێکی دژەهونەری و لە بنەمادا سیاسییە.

کۆمەڵناســی ئــەمریکی، دانییــل بێــل لــە ساڵی 1973دا کتێبی بەرزکردنـەوەی کۆمەڵگەی پۆسـت پیشەسـازی بڵاودەکاتـەوە و لـەو کتێبـەدا پێی وایە کە، ئێمە لە ڕۆژئاوادا لە کۆمەڵگەیەکی بـەکارهێنانی جەماوەریـدا دەژیـن کـە بێکـاری بەدواوەیـە. بـە ڕای بێـل کۆمەڵگـەی پۆسـت پیشەسـازی کۆمەڵگەیەکـە کـە لـەودا مەسـەلەی خزمەتگوزاری(خدمات) لە بەرهەمهێنان چاکترە، پیشەســازییەکان(صــنایع) لەســەر زانســت و تــەکنۆلۆژی بوونەتــە ســەنتراڵ و دەســتەبژێرە نوێکـان ئـەو تەکنۆکراتانـەن کـە توێژبەندییـەکی نویّ دەدەنە کۆمەڵگە.

دانییـل بێـل لـە سـاڵی 1976 لـە کتێبـی ناکۆکییــــەکانی کولتــــووری کاپیتــــالیزم دا دەنووسـێت:"ئێمـە شـایەتی پیربـوون و داڕزانـی مۆدێرنیزمین و چەشنە جۆربەجۆرەکانی پۆست مۆدێرنیزم دەرکەوتـەکانی ئانالیزەبوونی خـودن لـە تێکۆشـانێکدا بـۆ لـەنێو بردنـی خـودی تاکەکەسـی." هـەر لـە سـاڵی 1970دا ئیهـاب حەســەن وتارێــك بــە نــاوی عیرفــانی نــویّ دەنووســیّ، لــەودا پۆســت مــۆدێرنیزم بــە پەیوەندییـەکی نـویّ دادەنێـت لـەنێوان مـرۆڤ و بۆشگاکانی ژیانی ئەودا. ئەو لەو بڕوایەدایە کە نـەبوونی دیـاریکردن و نـەبوونی پـیرۆزی و بـە ترانســدێنتاڵکردن دوو پێناســەی ســەرەکیی پۆست مۆدێرنیزمن. هەر لە ساڵەکانی 1970دا هاوکــــات لەگــــەڵ ئیهــــاب حەســــەن، گۆڤاری *Boundary* لە لایـەن ویلیام سپانۆسەوە دادەمـەزرێنرێت. سـپانۆس هـەوڵ دەدا تـا بـە هاوکـاری حەسـەن و ئۆلسـۆن دژە هیومـانیزمی هایدگـەری پەیوەنـد بـدا بـە بیرۆکـەکانی پۆسـت مۆدێرنیزمەوە.

لـە سـاڵەکانی 1970دا چـارلز جـنکس و ڕابێرت ونتۆری دوو سیمای گرنگ و ناسراوی بواری تەلارسازی بوون. لـە ڕاستیدا کاتێك کە جـنکس لـە کتێبـی زمـانی تەلارسـازیی پۆسـت مـۆدێرن (1975)دا کـەڵکی لـە پـەیڤی "پۆسـت مـۆدێرن" وەرگــرت، ئــەم وشــەیە بــوو بــە زاراوەیەکی پەسەندکراوی خەڵکی ڕەمەکی. لای جنکس تەلارسازیی مۆدێرن بیرێکی جیهانی و گەردوونگیری[4] هەبوو و بۆ بەکارهێنان کەڵکی لە مادەکان وەردەگـرت، لـە کاتێکـدا کـە پۆسـت مـۆدێرنیزم بـە هـۆی ئـەوەی کـە لـە تەلارسـازیدا کـەڵك لـە تەکنۆلۆژییـە نوێیـەکان وەردەگـریّ بـە جۆرێـك دەگـات لـە پلـۆرالیزم. لـە بیناسـازیی

پۆست مۆدێرنـدا سـنوورەکان دیاریـنـەکراو و بۆشگاکان ناکۆتا و بێ لێوارن. هەربۆیە جنکس بەم باوەڕە دەگات کە بیناسازیی پۆست مۆدێرن بیناسازییەکی دووڕەگە و پێوەندی(*hybrid*)یە. جـنکس لـە کتێبـی پۆسـت مـۆدێرنیـزم چـیە؟کە سـاڵی (1986) چـاپی کـرد دەنووسـێت کـە ئامانجی پۆست مۆدێرنیزم وەدیهێنانی بەڵێنی کولتووری پلۆرالە لەگەڵ ئازادی جۆربەجۆرداو هـەروەها دوورکەوتنەوەیـە لـە سیسـتمی تـاك رەهەنـدی مـۆدێرن، کـە دەنگـە نـەیارەکانی سـەرکوت دەکـرد و بنەماگـەلێکی هەمـەکی بـۆ سـەلیقەو زەوق دیـاری دەکـرد. بـە بۆچوونی جنکس، تەلارسازیی مۆدێرنیست بە تێکۆشـانە ئاوەزخوازانـەکانی خـۆی سیستمێکی تایبەت و دیاریکراوی بەسەر تاکدا دەسەپاند، لە کاتێکدا کە بیناسازیی پۆست مـۆدێرن خـۆش سروشـتی دێنێتـە نێـو بۆشـگا شارییەکانەوە.

رابێـرت ونتـوری کـە یـەکێك لـە تیۆردانـەرە بەرجەسـتەکانی پۆسـت مۆدێرنیزمـە لـە بـواری تەلارسـازیدا، لـەم باوەڕەدایـە کـە پۆسـت مـۆدێرنیزم تێکەڵەیەکـە لـە شـێوەگەلی جۆربەجۆرو لە کتێبی ناکۆکی و ئاڵۆزییەکان لە تەلارسازیدا(1988) دەنووسێت:"من قەرەباڵغی چالاك و بەجۆشم لە یەکیەتی روون و ئاشکرا پـێ چـاکترە." ونتـوری دەرکەوتـەی ئـەم قەرەباڵغییـە بـە جـۆش و چـالاکە لـە شـاری لاسڤێگاسـدا بەدیـدەکات. شـارێك کـە بـە وتـەی ونتـۆری لـەودا نیشـانەکان و هێماکـان لـە تەلارسازی گرنگترن.

گـرنگترین هـەوڵێك کـە لـە بـاری فەلسـەفییەوە لـە راسـتای تیۆردانـان لـە بـواری پۆسـت مۆدێرنیزمـدا هاتۆتـە کایـە لـە هـزری فەیلەسووفی فەرەنسی، ژان فرانسوا لیوتاردا ئـەنجام دراوە. لیوتـارد لـە کتێبـی بـارودۆخی پۆسـت مـۆدێرن (1978)دا دۆزی شـناس لـە قۆنـاخی پۆست مۆدێرندا دەخاتـە بەر سەرنج. ئەو لـەم باوەڕەدایـە کـە بـە کۆمپیوتـەربوونی کۆمەڵگـە پیشەسـازییە مۆدێرنـەکان گـۆڕانی بەسەر چییەتی[5] شناسدا هێناوە، شناس بووە بـە کاڵایـەکی زانیـاری، زانسـت لـە بـارودۆخی بنەمایی و سەرەتایی خۆی جیا بۆتەوە و بووە بە ئامرازێك لە دەستی دەسەڵاتدا. کەواتە ئەو کەسـانەی کـە کـۆنترۆڵی ناسـینیان لەبـەر دەستدایە سیاسەتیش کۆنترۆڵ دەکەن. لیوتارد پێی وایە کە لە قۆناخی پۆست مۆدێرندا، ئەو میتـا حیکایەتانـەی کـە لـە شارسـتانییەتی رۆژئاوادا باسیان لە هەقیقەتی ترانسدێنتاڵ و گەردوونگرەوە دەکرد، جێگای خۆیان دەدەنە کایـە زمانییـەکان. بـەڵام بـە پێچـەوانەی ئایـدۆلۆژیا سیاسـییەکان، زانسـت هێشـتا توانستی پاراستنی بازنەی ترانسدێنتاڵی خۆی هەیـە و ناسـینی زانسـتی خـۆی دەخاتـە ئەوبـەرتری کایـە زمانییەکانـەوە و بـۆ بـەڕەوا نیشـاندانی خـۆی پـەنا دەباتـە بـەر رووبـەری حیکایـەت. ناسـینی زانسـتی لـە رێگـای حیکایەتەوە خۆی بەوانی تر دەناسێنێت و لەو بڕوایەدایـە کـە گەردوونگرەوەیـە و لـە هـەموو بارودۆخێکـدا بـۆ هـەموو شـتێك شـایانی پاساودانەوەیە. ئامانجی لیوتارد دژایەتیکردنە لەگـەڵ میتـا حیکایەتەکانـدا کـە بـە وتـەی ئـەو،

ئەفراندنە تاکەکەسییەکانیان سەرکوت کردوە، و لـە بەرامبـەردا بڕیـار لەسـەر حیکایەتـەکان دەدات. ئـەم حیکایەتانـە لەلایـەن کۆمەڵـە کەسـێکی کەمـەوە و بـە ئامـانجی بـەرەو پـێش بردنی ئامانجگەلێکی دیاریکراو دێنە ئاراوە کە وەك نموونـە دەتـوانین ئامـاژە بـە یەکیـەتیی خوێنـدکاران و کرێکـاران لـە مـانگی مـەی 1968دا بکـەین کـە خوازیـاری وەڵامدانـەوە بـە دۆزەکـانی کۆمـەڵی فەرەنسـا بـوون. ئـەو بـە مەبەسـتی دژایـەتیکردنی میتـا حیکایەتـەکان دەگەڕێتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەگەری نیچەیی، و ئەم بـاوەڕە ڕەتدەکاتـەوە کە سیسـتمە بـاوەڕی، ئیمانی و فکرییەکانی ئێمە خاوەن بنەماگەلێکی بـەهێز بـن. لیوتـارد پێـی وایـە کـە ڕووداوگـەلێك بوونیـان هەیـە کـە ڕوانگـەی ئێمـە بـە نیسـبەت جیهـان و دیسکۆرسـە ئایدۆلۆژییـەکان دەبەنـە ژێـر پرسیار. ئاشـویتس و ڕووداوەکانی مانگی مەی 68 نموونەگـەلێکن کـە میتا حیکایەتـەکان لـە بەرامبەریانـدا هـەرەس دێـنن. قـەبووڵکردنی ئـەوەی کـە ڕووداوەکـان پێشـبینی نـاکرێن و ئـەوەی کـە داهـاتوو هـەمووکات کراوەیـە و نـاتوانین لـە پێشتر دیـاری بکـەین، هـاتنی میتـا حیکایەتەکان دیاری دەکات. لە لایەکی دیکـەوە، ڕووبەڕووبوونـــــــەوەی بەرژەوەندییـــــــــە جۆربـــەجۆرەکان هـــەمووکات وەك جیـــاوازی دەمێننەوە و هیچکات چارەسـەر ناکرێن. لێرەدا لیوتـارد بەرامبـەر بـە هابرمـاس ڕادەوەسـتێت، چونکە ئەو خوازیاری ڕێککەوتنێکی کۆتاییە لـە کۆمەڵـدا. بـەڵام لیوتـارد ڕێککـەوتن بـە کۆتـایی ئازادی و هزر لە قەڵەم دەدات. بە بۆچوونی ئەو، ئەمە نەبوونی ڕێککەوتنە کە مەجالی کارکردن و ئـەزموون بـە ئێمـە دەدات. داهێنـان هـەمووکات هاوڕێی پێچەوانەخوازی و ڕێك نەکەوتنە.

یـەکێکی دیکـە لـە بیریـارانی پۆسـت مـۆدێرن، کۆمەڵناسـی فەرەنسـی، ژان بۆدریـارە کـە لـەو بڕوایەدایـە جیهـانی پۆسـت مـۆدێرن جیهانی هاوشێوەسازییە[6] و هـەر بـەم هۆیـەش، دیزنـــی لەنـــد و تەلـــەڤیزیۆن واقعییەتـــەکانی ئـەمریکا پێکـدێنن. بـە بۆچوونی بۆدریـار ئێمـە پێمـان ناوەتـە نێـو جیهـانی بـان واقعییـەوە. بـە دەربڕینێکی دیکە، واقعییەت بەرهەم دێت، بەڵام بەدەر لە دەسەڵاتی ئێمەیە. بۆدریـار تەنانـەت لـە سـەرەتاکانی سـاڵی 1990دا وتـارێکی لەسـەر شـەڕی کەنـداوی فـارس نووسـی و گـوتی، ئـەم شـەڕە بەتـەواوی لەلایـەن ڕاگەیاندنەکانـەوە دروست کرا و ئەمە ئەوان بوون کە شەڕێکی لـەم چەشنەیان بۆ ئێمە دروست کرد. ئەو شتـەی کە ئێمە لە واقعییەت و جیهانی واقعی دەیبینین، لە ڕاستیدا وێنەیەکـە کـە نیشـانی ئێمـە دەدرێـت. ڕاگەیاندنـەکان وەك دەروازەی ڕوانینـەوەی ئێمـە بـۆ جیهـان کـار دەکـەن. تەنانـەت کاتێـك کـە دەخـوازین دژایـەتی ئـەم سیسـتمە کاپیتالییـە پێشکـەوتووە بکـەین، دەبینـە بەشێك لـە خـودی سیستمەکە. بۆدریار پێی وایە کە سەرکەوتنی ئـاوەزی ئـامرازی بەسـەر شـێوەکانی ژیـانی مرۆییـدا بـووە بـە هـۆی لێکهەڵوەشـانەوەی[7] ناسـکاری[8] کۆمەڵایـەتی و بەتایبـەتیبوونی ڕەهەنـدی سیاسـی. ئـەم لێکهەڵوەشـانەوەیە کـە لەگـەڵ لێکهەڵوەشـانەوەی بەتـەواوی ناسـکاری هێگڵیـدا دەخـوازێ ڕەخنـەکاریی نیچـەیی لـە مێتافیزیـك زینـدوو بکاتـەوە، بیریـارانی پۆسـت مـۆدێرن بـەرەو جۆرێـك ڕێژەگـەرایی کولتـووری

**رادەکێشـــێت کـــە لەگـــەڵ پلـــۆرالیزمی ئەفسوونســـڕەوەدا[9] ئەگـــەری رووخـــانی ئایـــدۆلۆژیا و روانگـــە ســـاکارگەراکان[10] دەرەخسێنێت.**

**فەرهەنگۆك**

1ـ ساویر: وەهم
2ـ بۆشگا: فضا، محیط
3ـ دەستەبژێر: نخبە
4ـ گەردوونگیری: عالم گیر
5ـ چییەتی: ماهیت
6ـ هاوشێوەسازی: شبیەسازی
7ـ لێکهەڵوەشانەوە: انحلال
8ـ ناسکار: سوژە- نێوەرۆك-بابەت
9ـ ئەفسوونسڕەوە: افسون زدا
10ـ ساکارگەرا: سهوگرا

**سەرچاوە:**

کتێبی موج چهارم. لاپەڕەی (71 ـ 79).

# گوتاری حیکایەتخوانیو گوتاری ئاینی

## پرسێکی رەخنەیی لە تازەبوونەوەدا

کریستۆفەر نۆرس
لە عەرەبییەوە: د. شاهۆ سەعید

ئەو پرسیارانەی کە رۆمانەکەی سەلمان روشدی "ئایەتە شەیتانیەکان 1988" وروژاندیان پەیوەندیی پتەویان بە بابەتگەلێکەوە هەیە لەبابەتی راستگۆیی گێرانەوە، هەقیقەت لە رۆماندا (وەك هونەرێکی خەیاڵی)، هەروەها پێگەی دەقی ئەدەبی لەئاست فۆرمەکانی دەسەڵاتی ئاینیو سیاسیدا. سەلمان روشدی، هەروەك سپینۆزا لە بەرەنگاربوونەوەی تەوژمی هەڵکشاوی فەندەمێنتاڵیزمدا کەسێکی بوێر بوو. ئەڵبەتە ئەو تەوژمە دەسەڵات لە دەقی پیرۆزەوە وەردەگرێ بەو پێیەی دەقێکی بێگەردو پارێزراوە، هەروەها پابەندی خوێندنەوەیەکە کە بەهۆی ناکۆکی باوەڕدارانەوە تۆختر دەبێتەوە وەك کەسانێك کە پێیان وایە خۆیان هەقیقەتی یەزدانی دەناسنو هەر ئەوانیش پاسەوانیی لێدەکەن. سەلمان روشدیش هەروەك سپینۆزا ئەرکی ریسواکردنی تەوژمی فەندەمێنتاڵیزمی خستە سەر شانی خۆی، بۆ دەرخستنی فرتو فێڵی هەندێ لە پیاوانی ئاین کە دەسەڵاتی خۆیان لەرێگەی کەرەستەی غەیبییەوە بەکاردێنن، وەك پێغەمبەرایەتیو موعجیزەو قەدەرو چەندین جۆری تری بەڵگە کە هەندێکیان واقیع بەزێنو هەندێکیان خورافین. لەو کارەدا دڵی خەڵکی بۆ چەشنێك لە بیروباوەڕ رادەکێشن کە لەبەردەم رەخنەدا خۆیان پێ رانـاگیرێ. لەو بارەیەوە کاتی خۆی سپینۆزا دەیوت: "نهێنیی نهێنییەکان لە دەوڵەتی ستەمگەردا بریتیە لە پەنابردن بۆ پاکتاوکردنی رەعیەتو بڵاوکردنەوەی ترس لە

دڵودەروونیاندا لەژێر پەردەی ئایندا" (*Spinoza, (1670) 1884 a, vol. p.5*).

وەك بینیمان سپینۆزا هەموو ئەو ڕێچکانەی گرتەبەر لەپێناو خۆڕزگارکردن لە خورافە، یان بەلانی کەمەوە لەپێناو پەردەهەڵماڵین لەو بەدحاڵیبوونەی دەیانخستەوە، وەك بەشێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی لە چاخێکی دیاریکراودا. سپینۆزا پاش ئەوەی هەموو فاکتەرەکانی تاووتوێکرد گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە "پەیمانی نوێ" دوورتر ڕۆیشتووە تا "پەیمانی کۆن"، چونکە قەشە پۆڵس -بۆ نمونە- بانگەواز بۆ هەمان تیۆرە دەکا کە سپینۆزا بانگەشەی بۆ کردووە، چەندین بەڵگەو ئەنجامگیری دەخاتەڕوو بۆ پووچەڵکردنەوەی ئیدعاکانی جولەکە، ئەو بەڵگەو ئەنجامگیریانە زادەی ئەقڵو بیرکردنەوەن نەك وەهمو خورافە کە لە شیکردنەوەی بەشەکانی "پەیمانی کۆن"دا پەنای بۆ براوە (*p. 159*). بێگومان سپینۆزا بەدرێژایی ژیانی کەسێکی دوودڵ بوو سەبارەت بە بانگەوازی هەقیقەت، بەتایبەتی لەلایەن کەسانێکەوە کە لە بانگەوازدا پشتئەستور بوون بە دەسەڵاتی دەقی پیرۆزو هەرەشەی زۆر توندیان -بە خەیاڵ یان واقع- لەو کەسانە دەکرد کە لاڕێ بوون یان گیانی بەرەنگارییان تێدا بوو سەبارەت بەو شتانەی کە لای خۆیان بەڵگەنەویست بوون.

هەندێ لەو کەسانەی دیدو بۆچوونیان سەبارەت بە کێشەی سەلمان ڕوشدی خستۆتەڕوو پێیانوایە نابێ حوکمدان، چ جای گوناهبارکردن، لەسەر نوسینی کارێك کە دەچێتە خانەی گێڕانەوەی خەیاڵی، یان ڕۆمانی سەر بە "چاخی پۆست مۆدێرن"، بەئاقارێکدا ببرێ کە گوایا ئەو کارە ئەدەبییە ئیدعای ڕاستگۆیی دەکا، یان ئیدعای ئەوە دەکا ئەو شتانەی کە دەیگێڕێتەوە ڕاستو مێژوویین. بەدەربڕینێکی ڕەخنەیی تر: ڕۆمانی "ئایەتە شەیتانیەکان" سەر بە ژانرێکی هونەرییە کە بە ریالیستی سیحریی *magic realism* دەناسرێ، ئەو ژانرە تەکنیکێکی گێڕانەوە پێڕەودەکا کە لەڕێگەیەوە سنورەکانی واقع تێکەڵ بە بورای فەنتازیا دەبێو ئەو ڕووداوە واقعیانەی دەشێ ڕاست بن تێکەڵ بەو ئیحالانە دەبن کە دەشێ ناڕاست بن، بە ئەندازەیەك خوێنەر دەگاتە ئاستێك ناتوانێ لەڕێگەی هەستەکانیەوە جیاکاری لەنێوان هەقیقەتو خەیاڵدا بکا. هەر لەم دەروازەیەوە دەکرێ بڵێین ناکۆکیی ڕاوبۆچوونەکان جۆرێکە لە زیادەڕۆیی کە پەیوەندیی بە دیارینەکردنی پسپۆڕییەوە هەیە، هەروەك چۆن هەڵەیەکە زادەی نەسەلماندنی ئەو هەقیقەتەیە کە دەڵێ: کارە ئەدەبیەکان لە پرسە بابەتیەکان ناکۆڵنەوەو ئەو بیرۆکانەش ناخەنەڕوو کە مشتومڕی زانستییان لێدەکەوێتەوە، هەروەها سەرلەنوێ مێژوو نانوسنەوەو ناچنە ناو کێشە ئایدیۆلۆجیو ئاینیو مەزهەبیەکانەوە.

لێرەوە دەکرێ بڵێین ئایەتوڵڵا خومەینیو ئەو کەسە فەندەمێنتالانەی پشتیوانی لێدەکەن کۆمەڵێك خوێنەری حەرفیین -واتە بە پیتەکانی دەقەوە دەنوسێن- و خاوەنی دیدێکی بەرتەسکن سەبارەت بە سروشتی کاری ڕۆمان...، ئەوانە کەسانێکن لەبەر دوو هۆکار

ئیدانەی رۆمانەکەی سەلمان روشدی دەکەن، کە هەردووکیان ناڕاستن: یەکەم، پێیانوایە لەو رۆمانەدا سوکایەتی بە چەند رووداوێکی راستەقینەی ژیانی پیغەمبەر (د.خ)و مێژوی ئیسلام کراوە. دووەم، پێیانوایە ئەو رۆمانە بانگەواز بۆ چەند بیرۆکەیەکی ئیلحادیی پیس دەکا کە دژی ئیسلامە وەك ئاینێکی پیرۆزو بەرز. بەڵام چاکترین داکۆکی لە رۆمانەکەی سەلمان روشدی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بڵێین: بنیاتی خەیاڵیی رۆمان سروشتێکی ئاڵۆزی هەیە، بەجۆرێك ناچێتە خانەی کاری "زانستی"یەوە سەبارەت بە خستنەڕووی هەقیقەتو پرسەکانو هەڵێنجانی بەڵگە لە دەقە پیرۆزەکانو سەرچاوەی ترەوە..، ئەمە جگە لەوەی حوکمدان لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ئەو رۆمانە لە ئاین لای داوە حوکمێکی هەڵەیەو زادەی بەدحاڵیبوونێکی گەورەیە.

بەهەرحاڵ دەکرێ باس لە ئاراستەیەکی بیرکردنەوە بکەین بۆ هێورکردنەوەی هەستوسۆزی گڕگرتوو لەپێناو سازدانی ئاگربڕێك کە یارمەتیمان دەدا بۆ ساردکردنەوەی دۆخەکە. پاش بڕیارێکی حکومەتی هیندستان سەبارەت بە قەدەغەکردنی رۆمانەکەی، سەلمان روشدی لە نامەیەکی کراوەدا بۆ سەرەك وەزیرانی ئەو دەمەی هیندستان راجیڤ گاندی ئاماژەی بۆ ئەم پرسە کردووەو دەڵێ:

"ئەو بەشەی کتێبەکە کە جێی مەبەستە (چونکە دەبێ ئەوەمان لەیاد بێ کتێبەکە لە واقعدا دەربارەی ئیسلام نیە، بەڵکو دەربارەی کۆچ، شێواندنو پەرتبوونی کەسایەتی، خۆشەویستی، مردن، لەندەنو بۆمبایە) باس لە پێغەمبەرێك دەکا کە ناوی محەمەد نییە، لە شارێکی فەنتازیدا دەژی کە لە لم بنیات نراوە، هەر کە باران دەبارێ ئەو شارە دەتوێتەوە، تاقمێك لە کەسانی خەیاڵی لەدەوری ئەو پێغەمبەرەن، کە یەکێکیان هەڵگری ناوی یەکەمی خۆمە (سەلمان). سەرباری ئەوەی هەموو چیرۆکەکە لە خەونی کەسایەتیەکی خەیاڵیدا ڕوودەدا کە ئەستێرەیەکی سینەمایی هیندییە خەریکە شێت دەبێ. ئیتر چ نوسەرێك دەتوانێ هێندە خۆی لە مێژووی واقعی بەدوور بگرێ؟!"؟

(*in Appignanesi and Matland, 1989, p.44*)

لەم دەقە وەرگیردراوەی نامەکەدا دەردەکەوێ مەسەلەکە مەترسیدارەو دەبێ بەهەند وەربگیردرێ، نەك تەنها سەبارەت بە سەلمان روشدی، بەڵکو سەبارەت بە چەندین نوسەری داهێنەری تر لە وڵاتانێکدا کە لەژێر دەسەڵاتی رژێمی ئاینیو سیاسیی ستەمگەرو داپڵۆسێنەردان. لێرەدا دەبێ رێز لەو سنورانە بگیردرێ کە کاری خەیاڵیی رۆماننوس لە کاری بابەتیی مێژونوس جیادەکاتەوە، هەروەها نابێ رۆمان بخوێندرێتەوە وەك ئەوەی گوزارشتێکی راستەوخۆ بێ لە بیروباوەڕی نوسەرەکەی. سەرباری ئەوە، لە کۆمەڵگەی خۆشماندا، کە تا رادەیەك کۆمەڵگەیەکی سیکیۆلارییە، مرۆڤ سەبارەت بە بابەتێکی لەو جۆرە پێویستی بە وەرگرتنی هەڵوێستو هاوسۆزیی هەیە، هەرچەندە هەڵوێستوەرگرتن لە کۆمەڵگەکانی خۆماندا لەسەر بنەمای چەند پرنسیپێك دادەمەزرێ کە بوونەتە پرنسیپی

بەڵگەنەویست. بەڵام نەیارە فەندەمێنتاڵیستو توندڕەوەکانی سەلمان روشدی بڕوایان بەو هەڵوێستو پرنسیپانە نییە، کە لەسایەیدا کڵێساو دەوڵەت لە یەکدی جیادەکرێنەوە، ئازادییە دیموکراتیەکان دەستبەردەکرێن، مرۆڤ مافی بیرکردنەوەو گوزارشتی هەیە، هونەر خاوەنی سەربەخۆییەکی ڕێژەییە بەو پێیەی کەرەستەیەکە بۆ گوزارشتکردنو تا ئەندازەیەکی زۆر ملکەچی ئەو قەیدومەرجانە نیە کە یاسا حوکمیان لەسەر دەدا. بەڵام دەکرێ بڵێین: تەنانەت رەخنەی ئەدەبییش، هەروەك هونەر، خاوەنی سەربەخۆییو حەسانەتی خۆیەتیو زادەی قەوارەیەکی تەواوی پێوەرو چەمکی رەخنەییە کە لە گۆڕەپانی رۆشنبیریدا قسەوباسی لێدەکرێ وەك: بایەخنەدانی ئیستاتیکی ***aesthetic disinterest***، پەسەندکردنی وەهم یان دواخستنی بەدرۆخستنەوە ***suspension of disbelief***، ئاڵۆزیو فرەمانایی ***ambiguity***، کۆدژیی ***paradox***، نوسەری شاراوە ***implied author***، دەقئاویزان ***intertextality*** و چەندین چەمکی تری لەمجۆرە. بێگومان ئەم قەوارە رەخنەییانە لەگەڵ زاراوەکانیدا ئەدەب دەکەنە داڕشتنێکی تایبەتو ناوازە بۆ گوزارشتکردن لەگەڵ چەندین پێودانگدا کە پەیوەندییان بە ریالیستی خەیاڵییەوە هەیە. (بڕوانە: ***Hohendahl, 1982, Eaglton, 1984***)

ئەمانە هەندێك لەو بەهایانەن کە سەلمان روشدی لە نوسینەکەیدا بۆ سەرەك وەزیری هندستان دەیانورژێنێ. ئەم هەڵوێستەی وی هەڵوێستێکی مێژووی رێنیسانسی ئینگلتەرامان دێنێتەوە یاد کاتێ سێر فلیب سیدنی داکۆکی لە شیعر کرد بەو پێیەی داڕشتنێکی درۆزنو گوزارشتێکی خەیاڵییە، داڕشتنێکە ناتوانین لە مەحەکی لۆجیکی بدەین، هەروەك چۆن ناتوانین شاعیران بخەینە ریزی فەیلەسوفانو زانایانی ئاکارو مێژوونوسان، ئەوانەی هەقیقەتو یاساکانی لۆجیك دەپارێزن. هاوزەمان لەگەڵ دەرکەوتنی رۆماندا، وەك ژانرێکی تایبەت، هەڵوێستێکی تری لەمجۆرە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمەوە تا کۆتاییەکانی ئەو سەدەیە سەری هەڵدا. کێشەی گەورە ئەوە بوو کە ئەدەبی گێڕانەوەی پەخشانئامێز ***prose-fiction*** ملکەچی ئەو نیشانەو رەگەزە ئەدەبیانە نەبوو کە وەك شیعر لە ڕووی شێوەو ناوەرۆکەوە روونو ئاشکرا بوون[1]، تەنانەت خەریك بوو تێکەڵاوی لەنێوان ئەدەبی گێڕانەوەی پەخشانئامێزو ئەو گوتارەی نوسیندا ئەنجام بدرێ کە راستیەکانو فاکتەکان دەگێڕنەوە. پاشان کۆششی زۆر خرایەگەڕ –چ لەسەر ئاستی یاسادانانو چ لە نێوەندی ئەدیبانو رەخنەگرانی رۆماندا– لەپێناو روونکردنەوەی ئەو جیاوازییە یەکلاکەرەوەیە لەنێوان ئەو دوو گوتارەدا، هەروەها لەپێناو دانانی سنورێکی جیاکەرەوە لەنێوان رۆمان ***novels*** لە لایەكو راپۆرتی رۆژنامەوانیو پەخشانی مێژوییو نوسینی سیاسیو لاهوتی لە لایەکی ترەوە. (***Davis, 1983***)

لەبەر رۆشنایی قسەیەکی هابرماس زیاتر لەو بابەتە تێدەگەین کە باسمان کرد، ئەو باس لە سەربەخۆییو جیاوازیی فۆرمە مەعریفیەکان

دەكا لەنێو سیستێمی گشتیی فیكری مرۆیی مۆدێرندا، ئەو سیستێمەی جیاوازیی كایەكانی مەعریفە لەمەڕ ئیدعای راستگۆیی و گەڕان بەشوێن هەقیقەتدا لەبەرچاو دەگرێ. لە چوارچێوەی ئەم سیستێمەدا بەركەوتی ئەدەب لە سەربەخۆیی و ئازادیدا زۆر بەرفراوانە، ئەدەب لەئاست كایەكانی تری مەعریفەدا دوورە لەوەی ئیدعای راستگۆیی و هەقیقەت بكا. بەڕای ئێمە سپینۆزا یەكەمین فەیلەسوف بوو كە پەی بەم جیاوازییە بردو لایەنەكانی روونكردەوە، چونكە ئەو دژی ئەوە بوو بابەتگەلێكی وەك ئاینو وەحیو هەقیقەتی بەڵگەنەویست تێكەڵ بە فۆرمە درۆزنو خەیاڵیەكانی داهێنان بكرێن. هەر لەبەر ئەم هۆیەش دەڵێین: گرنگترین دەسكەوتی سپینۆزا لە مێژوی فیكری رەخنەیی سیكیۆلاریدا بریتیە لە ئازادكردنی پرۆسەی شیكردنەوەو راڤەكردنی دەق لە كۆتو بەندی ملكەچبوون بۆ داخوازیی تەوژمە ئاینییە توندڕەوەكان. پێویستە هەمیشە ئەوەمان لەیاد بێ كە رۆچوون لە باسكردنی ئەو مەسەلانەدا جارێكی تر پەلكێشمان دەكا بۆ قسەكردن دەربارەی ئازادییەك كە هێندە بەئاسانی نەهاتۆتە بوون، بەڵكو چەندین نوسەری داهێنەر خەیاڵیان لە هەموو مەسەلەیەكدا بەكارهێناوە، جا ئیتر ئاستی راستگۆیی ئەو خەیاڵەو پێگەی لە ئایندا هەرچۆنێك بووبێ.

گراهام سویفت *Graham Swift* ئاماژە بۆ ئەم خاڵە دەكاو هەمان قسەی سەلمان روشدی دووپات دەكاتەوە. سویفت لە نوسینێكدا دەربارەی رۆمانی "ئایەتە شەیتانیەكان" دەڵێ: "كاری ئەدەبی لەوە گەورەترە كە تەنها گوزارشتێكی ئازادانە بێ، كاری ئەدەبی گوزارشتێكی داهێنەرانەیە كە مشتومڕو فەرمانو دووپاتكردنەوەی تێدا نییە بەڵكو ئەفراندنو داهێنان لەخۆدەگرێ. هەربۆیە رۆمان دێتە بەرهەمو لە زەینیەتی خوێنەراندا بە زیندویی دەمێنێتەوە، بە ئەندازەیەك كە هیچ راپۆرتێكی شیكارو هیچ وتارێكی جەختكار ئەو توانایەی نیە" (*in Appignanesi and Maitland, 1989, p.219*). رەنگە كاریگەرترین بەرگری لەمبارەیەوە كارلۆس فوینتێس *Carlos Fuentes* پێشكەشی كردبێ كاتێ هەڵوێستی سەلمان روشدی بەراورد دەكا بە هەڵوێستی میخائیل باختین *Mikhail Bakhtin* "كە رەنگە گەورەترین بیریارو تیۆرسازی رۆمان بێ لە چاخی ئێستادا.. ئەو كەسەی كە ژیانی خۆیشی نمونەی تەواوی كارەكانی بوو". باشتر وایە سەرنجەكانی فوینتێس بە درێژی باس بكەین چونكە رۆشنترین مانیفێست لەخۆدەگرن سەبارەت بە ئازادیی خەیاڵی كەسی داهێنەر، بەدیاریكراویش دەربارەی رۆمان بەو پێیەی یەكەمینو دواهەمین شوێنە بۆ داڵدەدانی ئەو ئازادییە. ئەو مانیفێستە لەسەر هەمان رێی باختین دەڕوا سەبارەت بەو گوشارو نیشانە نادروستانەی كە پرۆسەی داهێنان دەخنكێننو لەچوارچێوەی "هێڵێكی كێشراودا" قەتیسی دەكەنو لە دۆگماتیزمدا گیری دەكەن، هەروەها ئەو پرۆسەیە بە شێوە جیاوازەكانی ستەمو گوتاری تاك مەودا *monological discourse* كۆت دەكەن (*Bakhtin, 1981*). فوینتێس دەڵێ:

"رۆمانەكەی سەلمان روشدی هەمان ئەو پرنسیپەی باختینی بەسەردا جێبەجێدەبێ كە

ماوەیەکی درێژ بانگەوازی بۆ کردووە، ئەو پرنسیپە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە ململانێی نێوان دەنگە جیاوازەکان خەسڵەتی تایبەتی ئەم سەردەمەی ئێمەیە. رۆمان ئەو مەیدانە کاریگەرەی ململانێو کێبڕکێی نێوان دەنگەکانە. لە گەرمەی پشێویی رۆماندا کەسایەتییە پێکاهەڵپژاوەکان ناتوێنەوەو لەنێوان دێڕەکانی دیالۆگدا مرۆڤەکان پێکەوە رێك ناخرێن..، بەڵکو رۆمان ئەو ژانرەیە کە هەموو چاخە مێژووییەکان، هەموو ئاستە کۆمەڵایەتییەکان، هەموو خەسڵەتە شارستانیەکانو هەموو هەقیقەتە دیارەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە. ئەمەش زۆر بەدیاریکراوی ئەو خاڵەیە کە ئایەتوڵڵاکانی تاران پەسەندی ناکەن، چونکە ئەو هەقیقەتەی ئەوان داوای دەکەن لە تاکە قسەیەکی دەقی پیرۆزدا بەرجەستەدەبێ. دەقی پیرۆز، بەگوێرەی پێناسەکەی، دەقێکی کۆکارو مانیعە، واتە کەس بۆی نیە شتی تازەی بخاتەسەر..، دەقێکە لەگەڵ کەسدا وتووێژ ناکا... هەر ئەو دەقە دەبێتە پاساوو بەیداخو سەنگەری کەسانێکی لەرزۆك کە دژی کەسانێکی تر بەکاری دێنن کە لە گەرمەی هەقیقەتدا بەشوێن ئارامیدا دەگەڕێن. گەر ئێمە ئیدعای ئەوە بکەین هەموو شتێك دەزانین، ئیتر ئەوە ئێمە لە بواری گێڕانەوەی رۆمانی خەیاڵیدا *fiction* کارناکەین، بەڵکو لە بواری داستاندا *epic* کاردەکەین. رۆمان زادەی بێدەسەڵاتیی ئێمەیە لە پەیوەندی بەستندا، بێ توانایی ئێمە لەوەی لە زمانی یەکتری تێبگەین. ئێستا زمانی تاك مەودای تەقلیدی پەکی کەوتووە، ئەو زمانەی کە تیایدا رۆمان لەناودەچێو بگرە کۆمەڵگەش لەناودەچێ.

*in Appignanesi and Maitland, 1989,* )
(*p.245-6*

رێکەوت نیە کە بەیەکگەیشتنی فیکریی لەنێوان سەلمان روشدیو باختیندا لەسەر چەندین ئاستی تێکرژاو بەرجەستەدەبێو خۆی لە چەند بابەتێکدا دەبینێتەوە وەك: سەرکوتکردن، ئازادیی بیرکردنەوەو سروشتی گوتاری ئاینیی بەرتەسك یان تاك جەمسەر..، ئەو بابەتانەی کە سپینۆزاش لە رەخنەکردنی کتێبی پیرۆزدا وروژاندنی. دەکرێ مرۆڤ بڵێ: سپینۆزا سەر بەو رۆماننوسو شاعیرو نوسەرە گاڵتەجاڕو پیاوانەی ئەدەبە کە کارەکانیان -لە ستراتیجدا- خزمەتی هەڵاتنی خۆری ئازادیی کردووە. ئەو کارانە نەمرییان بەخشی بەو خۆرەی کە ئاسۆکانی فەلسەفەو سیاسەتو زانستی لاهوتو بوارەکانی فیکری مرۆییان روناککردەوە. کیرمۆد لەسەر هەق بوو کاتێ داهێنانی تیۆریو پراکتیکی رەخنەی شیکاریو راڤەی سیکیۆلاریی گەڕاندەوە بۆ سپینۆزا، ئەو پیاوەی بەرەنگاری دەسەڵاتی پیاوانی ئاین بۆوەو دیدی خۆی بۆ هەقیقەتی کتێبی پیرۆز خستەڕوو.

بەڵام نابێ مرۆڤ ئەوە لەیاد بکا کە بەگوێرەی دیدی سپینۆزا -ئەو دیدەی چەند رەخنەگرو بیریارێکی وەك ئاڵتۆسێرو ماشێری کاری پێدەکەن- کارە خەیاڵیەکان خورافات نیەو ناتوانین بڵێین بەهای ئەو کارانە هیچ نیە جگە لە بەهایەکی ئیستاتیکی نامەعریفی کە پەیوەندیی بە پرسی راستیو ناڕاستییەوە نیە.

ڕەخنەی ئەدەبی –لەڕێگەی ئەو شتەوە کە سپینۆزا ناوی دەنێ سروشتی نەرمو فرەلایەنی گوتاری گێڕانەوە[2]– دەکرێ ڕۆبچێتە چەندین ناوچەوە کە پێشتر لە دەرگایان نەدراوە، هەروەها دەکرێ باس لە چەندین هەڵەی عەقائیدیو ئایدیۆلۆجی بەربڵاو بکرێ کە پێشتر وەك هەقیقەت مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە. ئەمەش ئەو شێوازە فەلسەفییەیە کە هەقیقەتێکی گرنگ دەسەپێنێ بەوەی دەکرێ ڕۆمانەکان مشتومڕی زۆر کاریگەر بوروژێننو دیالۆگی جدی بخەنەوە. ئەڵبەتە ئەو حاڵەتە تەنها بەسەر ڕۆمانی خاوەن پەیامدا *roman 'a th'ese* جێبەجێ نابێ، هەروەها تەنها ئەو ڕۆمانانە ناگرێتەوە کە بابەتی سیاسیو ئایدیۆلۆجی دەوروژێنن یان زۆر بێپەروا دیدی خۆیان دەخەنە ڕوو..، بەڵکو هەموو چەشنە ئەدەبێك دەگرێتەوە تەنانەت ئەو چەشنەش کە کاریگەریی لاواز بەسەر خوێنەرەوە بەجێدێڵێ، چونکە ئەو جۆرەش پەرچەکرداری جیاواز دەوروژێنێ کە لە پەرچەکرداری پشتیوانیکردنی ئاشکراو ڕاستەوخۆوە دەستپێدەکا تا توڕەبوونو ڕەتکردنەوەی ڕەها.

کەمجار ئەم جۆرەی ئەدەب دەبێتە شوێن بایەخی گوتاری ڕەخنەی ئەکادیمی. ئەو گوتارە زیاتر بایەخ بە بابەتی خاوەن بەهای ئیستاتیکی دەدا نەك ئەو بابەتانەی کە مشتومڕو ناکۆکی دەخەنەوە. بەلاّم کۆمەڵێك ڕەخنەگری ئەکادیمی دیار هەن کە ئەم یاسایەیان بەسەردا پێڕەونابێ وەك ماشیری، دی مان، ئیمپسۆنو کەسانێکی تری وەك جیراڵد گراف کە بەرەنگاری ئەم تەوژمە ئیستاتیکییە بەهێزە بوونەوە. دیارترین شت کە ئەم بیریارانە پێکەوە کۆدەکاتەوە – سەرباری ئەو جیاوازییە گەورەیەی لە دیدو بۆچوونیاندا هەیە– بریتیە لە باوەڕی هەموویان بە سێ خاڵ: یەکەم، ئەو کارانەی بەرهەمی خەیاڵن، وەك ڕۆمانو بەرهەمی ئەدەبی بەگشتی، چەندین پرسو مەسەلەی جیاواز دەخەنە ڕوو. دووەم، نابێ ڕەخنەی ئەدەبی لە تاوتوێکردندا بەهای پیرۆز لەخۆی بئاڵێنێ. سێیەم، ڕەخنەگر لە دەقەکاندا ئەو بابەتە فەلسەفیو سیاسیو کۆمەلاّیەتیو مێژووییانە هەڵدەهێنجێ کە دەشێ پرسی ڕاستیو ناڕاستی، یان هەقیقەتو بوختان لەخۆبگرن.

هەوڵدان بۆ بێبەریکردنی ئەدەب لە بانگەشەکردن بۆ هەقیقەت، جا ئیتر هەر جۆرە بانگەشەکردنێك بێ، خۆی لەخۆیدا کۆششێکە بۆ بەنزم تەماشاکردنی ئەدەبی ڕۆمان، یان تەماشاکردنی ئەو ئەدەبە وەك جۆرێك لە کاری بێهوودەو عەبەس کە تەنها لە گێڕانەوەو ڕەگەزەکانی چیرۆکدا پابەندی یاساکان دەبێ. بەلاّم ئامانجی ئەدەب ئامانجێکی پراکتیکیو {دوور خایەن}ەو هەوڵ نادا {بەشێوەیەکی تیۆری} لەسەر بابەتێکی بایەخداری تایبەت بوەستێ. شتێك کە جێی سەرنجە ئەوەیە بیریارانو ڕەخنەگرانی ئەدەب لە قۆناغی پۆست مۆدێرندا هەولێکی لەمجۆرە دەدەن، جا ئیتر لەدیدی هاوسۆزییەوە بێ یان لە دیدی دوژمنایەتییەوە بێ، ئەمە لە کاتێکدا خودی ڕۆماننوسەکان هەولی لەوجۆرە نادەن. ئەو ڕۆماننوسانە، وەك کۆرت ڤۆنێگت *Kurt Vonnegut*، ئەنجیلا کارتەر *A. Carter*، ئی. دۆکتۆرۆ *E. L. Doctoro*، هەروەها خودی

سەلمان روشدی...، پێیان ئاساییە کە دوو شت پێکەوە بسازێنن: یەکەم، فۆرمەکانی ئەزمونگەری لەگەڵ ئەو تەکنیکانەی رۆماندا کە پێشتر بەکار نەهاتوون و لە قۆناغی پۆست مۆدێرندا بڵاوبوونەتەوە.. دووەم، بەگەڕخستنی جار ناجار یان بەردەوامی توخمە ریالیستی و دۆکیۆمێنتییەکان (*Hotcheon, 1987*). ئەوەی تایبەتمەندی دەبەخشێ بەو رۆماننوسانە – بەدیاریکراویش سەلمان روشدی– ئەوەیە کە ئەوان گوتاری رۆمان لە دەزولەکانی وەهم و واقع، خەیاڵ و هەقیقەت پێکەوە دەچنن، بەڵام جۆرە چنینێکە کە جیاوازیەکانی هەردوولا دەسڕێتەوە. واتە داوامان لێدەکەن وێنای چەند جیهانێکی واقعی ئاڵتەرناتیڤ بکەین، کە زۆر لە جیهانی خۆمان دەچن، بەڵام لە هەمان کاتدا لە هەندێ رووەوە لێی جیاوازن.

لە بنیاتی چنراوی ئەو رۆمانانەدا چەندین شتی دژبەیەك لەنێوان جیهانە ناکۆکەکاندا پێکەوە کۆدەکرێنەوە، خەسڵەتەکانی کەسایەتییەك دەبەخشرێ بە کەسایەتیەکی تر، رووداوەکان تێکەڵ بەیەکتر دەکرێن، کاتە جیاوازو خەسڵەتە جیاوازەکان تێکدەڕژێن...، هەر بۆیە پێویستە لەسەر رەخنەگری ئەدەبی کە کاریگەریی واقعیی ئەو رووداوانە بەهەند وەربگرێ. بەمانایەکی تر پێویستە رەخنەگر بایەخ بدا بەو دۆزەی کە بەهەموو شێوەیەك بەرهەمی بێلایەنەو سەر بە جیهانێکی دیاریکراو نیە، بەڵکو قەوارەیەکی خاوەن شوناسی نوێ و جیاوازە، شوناسێك کە هەڵگری چەندین ئەدگاری تایبەتە لەکۆی ئەو جیهانە ناکۆکانە (*Pavel, 1987*). ئەڵبەتە یەکێك لەو جیهانانە ئەم جیهانەی خۆمانە کە تیای دەژین، جیهانێکە خاوەن چەندین توخمی پێکهێنەری ئۆنتۆلۆجییە کە بەگوێرەی شیکردنەوەی مەرجەعیی رەخنەگر گۆڕانی بەسەر دێ و زیاد و کەم دەکا، یان بەئەندازەی پێڕەوکردنی دیدێکی واقعی لەلایەن ئەو رەخنەگرەوە گۆڕانی بەسەر دێ، ئەو دیدەی کە تەنها لەسەر فۆرمی دەرەکی دەوەستێ و رواڵەتی هەموو جیهانەکان یەکانگیرو وەك یەك دەبینێ، واتە دۆخێك لەشێوەی واقعدا *actually existing* بەو جیهانانە دەبەخشێ، تا خوێنەر هەستی پێبکا جا ئیتر لە پێگەیەکی ماتریاڵەوە بێ یان لەڕێگەی هەستی ناوەکییەوە بێ (*Lewis, 1986*).

مەبەستی من لەو پەرەگرافانەی سەرەوە ئەوەیە بەرەنگاری بیرۆکەیەك ببمەوە کە دەڵێ دەقی رۆمان هیچ پەیوەندییەکی بە بەهاکانی هەقیقەت و ساختەیی و درۆ و راستییەوە نیە، یان هیچ پەیوەندییەکی بەو بابەتانەوە نیە کە لە کایەکانی تری نوسیندا هەیە، وەك میژوو سیاسەت و فەلسەفەو... هتد. هەروەها دەبوو بێهەڵوێستیی ئەو کەسانە ئاشکرا بکەم کە لە داکۆکیکردندا لە دۆزی سەلمان روشدی پێیانوابوو کاری رۆماننوسین پەیوەندیی بە مەرجە مەعریفیەکانی راستگۆیی گوتارەوە نیە. بێگومان ئەو هەڵوێستەی ئەوان پاڵپشتێکی مێژوویی کۆنی هەیە لە ئەفلاتۆنەوە دەستپێدەکا کە پێیوابوو شیعر جۆرێکە لە ریسوایی و لەخشتەبردن، تا ئەوانەی پێکەوە بەرگرییان لە شیعرو رۆمان دەکرد وەك: سێر فیلیب سیدنی، شیللی، ئارنۆڵد، ریچاردس و رەخنەگرە نوێیەکان *New Critics*. ئەوان هەموویان

پێیانوابوو ئەدەب "هەقیقەت"ێکی جیاواز دەخاتەڕوو کە پشتئەستورە بە خەیاڵ، داهێنان، گوزارشتی ویژدانیی بەجۆش، ئاڵۆزیو فرەمانایی، کۆدژیو تەوسو.. هتد. ناکرێ ئەم رەگەزانە بەراوردبکرێ بە ئامرازی فۆرمەکانی تری گوتاری مەعریفی بۆ گەڕان بەدوای راستگۆییو بەهاکانی هەقیقەتدا. بەڵام بەهەر حاڵ توندڕەوە ئیسلامیەکان لەوەدا راست بوون کە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە جیاوازییان نەخستە نێوان گوتاری خەیاڵیی رۆمانو فۆرمەکانی تری گوتار، ئەوەش ئەو هەڵەیەیە کە بەدرێژایی چەندین سەدە پیاوانی ئاینی مەسیحیو فەرمانبەرانی دەزگای سانسۆری حزبە تۆتالیتارەکان تێی کەوتوون.

ئەوەی دەربارەی سپینۆزا ووتمان بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیی بەو مشتومڕەوە هەیە کە دەربارەی رۆمانی "ئایەتە شەیتانیەکان" لەگۆڕێدایە. چونکە سپینۆزا قایل نەبوو تەماشای کاری ئەدەبیی گێڕانەوە بکا وەك ئەوەی شتێك بێ لەدەرەوەی ئەقڵو بەدەر بێ لە بازنەی هەقیقەت، یان وەك ئەوەی ریچاردس دەیووت بچێتە خانەی "وتەزا ساختەکان *pseudo-statements*"، چونکە تەنها یەك پێودانگ لەئارادا نیە بۆ پێوانەکردنی بەها لەسەر بنەمایەکی سوودگەر کە عەقیدە پەسەندی بکا (*Richards, 1942*). بەڵام بەپێچەوانەوە رۆمان لە ناوچەیەکدایە کە تیایدا ناکۆکی لەنێوان هەقیقەتو ساختەییدا هەیە، ناوچەیەکە دەبێتە پنتی بەیەکگەیشتنی بیرۆکەو وێنا پەسەندەکان *adequate ideas* لەگەڵ مۆتیڤەکانی خەیاڵو هەڵەکانی داڵغەو

میتافۆرو چواندنە سەیرەکانو چەندین جۆری تری مۆتیڤی هەڵخەڵەتێنەر. لێرەوە قسەکەی ماشیری بەسەر رۆماندا پێڕەودەبێ کاتێ دەیووت: "کاری رۆماننوسینی راستەقینە –نەك وەهەم– ئاڵتەرناتیڤی مەعریفەیە بەڵام هاوتای نیە، بۆیە دەبێ هەموو تیۆرەیەکی ئەدەبی ئەوەمان بۆ ئاشکرا بکا کە دەق چی دەناسێو چۆن دەیناسێ" (*Macherey, 1978, p.64*).

لێرەوە ئەرکی رەخنەی ئەدەبی بریتیە لە شیکردنەوەو لێکدانەوەی میکانیزمەکانی بنیاتی رۆمان کە لەڕێگەیەوە پێشبینیو درکاندنە سەیرەکانی خەیاڵ ئاشکرا دەبن. گەر رەخنە نەتوانێ مۆتیڤەکانی خەیاڵو وێنەو درکاندنە سەیرەکانی مەجازو گوزارشت لە رۆماندا لەخۆبگرێ، گەر نەتوانێ لەو بیرۆکانە بگا کە لە ئەدەبدا هەیە، نابێ لە دۆخێکی ئاوهادا بەرپرسیارێتی بخەینە سەر شانی رەخنەگرێکی دیاریکراو..، بەڵکو –هەروەك سپینۆزا فێری کردووین– دەبێ بەشوێن ئەو بارودۆخە ئاینیو سیاسیو کۆمەڵایەتیانەدا بگەڕێین کە بەشێوەیەکی کاتی دەبنە هۆی بەدحاڵیبوون لەئاست سیستێمی ئاڵۆزو لێکدراوی مۆتیڤەکانی خەیاڵو بیرۆکە پەسەندو راستەکان. هیچ شتێك وەك رۆمان توانای گوزارشتکردنی نیە لەو سیستێمە ئاڵۆزەی کە دەبێتە پنتی نێوان هەقیقەتو وەهم..، دەبێ تیۆرەی ئەدەبییش بەچالاکی بەگەڕبخرێ لەپێناو تێگەیشتنو بڕیاردان لەمەڕ ئەم مەسەلەیە. لێرەوە دەبینین رۆمانێکی لە بابەت "ئایەتە شەیتانیەکان" لەیەك کاتدا توانای قەناعەت پێهێنانو وروژاندنی هەستو

سۆزیشی هەیە، پڕە لەو شتانەی کە لەسەروو وێناکردنی پێڕەوە هاوچەرخەکانی پۆست مۆدێرنیزمەوە هەیە. خودی سەلمان روشدی لە دیدارێکی رۆژنامەوانیدا (ناوەڕاستی سیپتێمبەری 1988)، بەرلەوەی ئەو هەڵمەتەی لەدژی بەرپاکرا بگاتە ئاستی حەلالکردنی خوێنی، ئاماژەی بە حاڵەتێکی لەمجۆرە داو ووتی:

"رەنگە ئەم رۆمانە هەستو سۆزی خەڵکانێك بریندار بکا، بەلام ئەمە هەوڵێکە بۆ نوسین دەربارەی ئاینو وەحی لە گۆشەنیگای کەسێکی سیکیولارەوە. بەڕای من ئەمە کارێکە رەوایەتی خۆی هەیە. کەسایەتی محەمەد (د. خ) شایەنی بایەخ پێدانە، ئەو تاقە پێغەمبەرێکە کە لە سەردەمانێکی کۆنەوە تا ئێستا ئامادەییو بوونی هەیە، هەواڵو زانیاریە مێژووییەکان دەربارەی وی تا ئێستا لەنێوان گومان و دڵنیایدان. هەموو ئەم شتانە ئەو دەکاتە مرۆڤێك کە دەبێ بەفراوانی بایەخی پێبدرێ"[3].

(*in Appignanesi and Maitland, 1989, p.41*)

زۆرجار لەکاتی خوێندنەوەی کارێکی ئەدەبیدا سەرقاڵی پێوانەکردنو حوکمدانین لەسەر ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بە هەقیقەتەوە هەیە. واتە سەرقاڵی ئەو پرۆسەیەین کە کاتی خۆی سپینۆزای سەرگەرمکردبوو، بەوەش گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو پرۆسەیە تاقە رێگەی تێگەیشتنی دروستو رۆشنگەرانەیە. واتە گرنگترین شت کە فیکری رەخنەیی هەوڵی بۆ دەدا بریتیە لە گەیشتن بەو حاڵەتەی کە دەق هەندێ مانا ئاشکرا دەکا زیاتر لەوانەی کە دەیانڵێ، بەجۆرێك ناچاردەبین لەخوێندنەوەی دەقدا وردەکارییە سەختو هەڵخەڵەتێنەرەکان رێکبخەینەوە تا ببنە خاوەن مانایەکی دیاریکراو، خوێندنەوەیەکی لەو جۆرە لە کۆتو بەندی بیرۆکە نەریتیەکانی پێشینان رزگارمان دەکا. ئەم کارە بۆتە جێبایەخی رەخنەگرانو چەند رەخنەگرێکیش کە میتۆدی سپینۆزایان بۆ خوێندنەوەی کاری ئەدەبی پێڕەوکردووە – لەبابەتی ماشێری– بەهێزترینو کاملترین تیۆرەی رەخنەییان لەوبارەیەوە پێشکەشکردووە. تا ئێستا ئەم میتۆدە رەخنەییە بۆ هەموو دەروازە رەخنەییەکانی تر گونجاوە.. وەك دەروازەی مارکسی، هەڵوەشانگەری، فێمێنیستی *Feminist*، سۆسیۆلۆجیو رێچکەی مێژوویی نوێ *New Historicism* کە پێیوایە دەشێ رەخنەی ئەدەبی (دەق) بگوشێو چەندین لایەنی مەعریفی لێ بتکێنێ بۆ بەزاندنی عەقیدە باوەکانو تێپەڕاندنی بیرۆکە راستەوخۆکان. مرۆڤ دەتوانێ ئەوە بدرکێنێ کە بنەمای هەموو پێشکەوتنە تیۆرییە رەخنەییەکان، بەجۆرێك لە جۆرەکان، دەگەڕێنەوە سەر سپینۆزا کاتێ باسی لە هەموو ئەو بابەتانە کردووە کە پەیوەندییان بە هەقیقەتو بوختانو خەیاڵو وەهمەوە هەیە.. بگرە پێشکەوتنەکان لە بواری تیۆرەی رەخنەییدا پشتئەستورن بە بەڵگەنەویستە لۆجیکیەکان لەئاست کارە خەیاڵیەکانی رۆماننوسینو گێڕانەوەدا. بەپێی ئەو تیۆرەیە بیرۆکە خەیاڵیەکان یان وێنای فەنتازی لە رۆماندا سەرچاوەیەکە لە

سەرچاوەکانی مەعریفەی راستەقینە، چونکە ئیدعای ئەوە ناکەن کە خاوەنی دوا وشەن، بەڵکو رێگەدەدەن رەخنە ئازادیی خۆی وەرگرێ تا هەقیقەت لە ساختەیی جیابکاتەوەو پەیوەندیی نێوانیان لەسەر ئاستی ستراکتوریی دیاری بکا.

لەبەر ئەم هۆیە {دەڵێین} رۆمانەکەی سەلمان روشدی چەندین مەسەلە دەوروژێنێ کە ناکرێ هەر لەبەر ئەوەی لە دوو تویێ رۆماندا هاتوون پشتگوێ بخرێن، یان بڵێین کە ئەم رۆمانە باس لە عەقیدە ناکاو باس لە ئیدعاکانی هەقیقەت ناکا لە ئاینێکی ئاسمانیدا. ئەو رەخنەگرانەی -کە بێگومان لەنیازپاکیانەوە- بەم شێوەیە قسەدەکەن پەیوەندی نابینن لەنێوان ئازادیی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی‌دەربارەی دەقە پیرۆزەکان کە رەخنەگرانێکی سیکیولاری وەك سپینۆزا ئەنجامیاندا، لەگەڵ خەسڵەتی بیرۆکە خەیاڵیەکانی رۆمان بۆ ئاشکراکردن‌و ریسواکردنی دیدی ئاینی‌و سیاسیی بەرتەسك‌و خورافی‌و دەمارگیر. مارینا وارنۆ *Marina Warner* لە بەرپەرچدانەوەی نەیارە توندڕەوەکانی سەلمان روشدیدا وەلامێکی قەناعەت هێنی پێشکەش کردو ووتی:

"ئەو شتەی کە بەپلەی یەکەم ئەوانی تووڕە کردووە بریتیە لەوەی شەیتان توانیویەتی دەست وەرداتە قورئان‌و هەندێکی بۆ زیاد بکا. کلێسا رووبەڕووی ئێرازمۆس *Ersamus*[4] بۆوە کاتێ ئەوەی ئاشکراکرد کە تەرجەمەی دەستاودەستکراوی کلێسا بۆ ئینجیل تەرجەمەیەکی ورد نیە. بەلام سەلمان روشدی - وەك ئیزامۆس- ئیدعای ئەوەی نەکرد کە شارەزایی لە تەفسیرکردن‌و شێوازی هاتنەخوارەوەی قورئاندا هەیە. ئەو هەلا گەورەیەی کە خستیەوە جدیەتی بەخشی بە قسە گاڵتەجارو بێ‌پەرواکانی ئەو، کە لەئاست ئەو جدییەتەدا نەبوون. وانەیەك کە فێری دەبین ئەوەیە پێویستە رووی گوتارمان بکەینە بیریارە موسڵمانە میانڕەوەکان کە توانای پێکەوەگرێدانی دیدی مێژوویی *Historicist*و شیکردنەوەی دەقئامێزی قورئانیان هەیە".

*in Appignanesi and Maitland, 1989,* (*p.210*)

دەبێ لەم دەرگایەوە رۆمانی "ئایەتە شەیتانیەکان" بخوێنینەوە، هەروەك چۆن کارێکی ئەدەبی وەك "کاندید"[5]ی ڤۆڵتێر، یان شانۆنامەی شیعریی "برۆمیتۆس تلیکا"[6]ی شیلی دەخوێنینەوە، ئەو دوو کارەی کە توانایەکی گەورەیان هەیە لە خستنەوەی مشتومڕو پەرچەکرداری توندو دوژمنکارانە، چونکە ئەدگاری گێرانەوە وەردەگرن‌و پڕن لە خەیاڵ‌و وێناکردنی شیعریی پرچۆش. لەم بەراوردەدا شیلی پێگەیەکی تایبەتی هەیە، نەك لەبەر ئەوەی سپینۆزای خوێندۆتەوەو پێی سەرسام بووەو وەریگێراوەتە سەر زمانی خۆی، بەڵکو لەبەرئەوەی وتارێکی بریندارکەری نوسیوە بە ناونیشانی "پێویستیی ئیلحاد"(1811)، هەروەها لە شیعرەکانیدا هێرشی بەربلاو دەکاتە سەر بەهای دەزگا ئاینیەکانی مەسیحی. شیعرەکانی ئەو دەمامکی ئەفسانە دەپۆشن، لێوان لێون لە هێما و مەجازو ئیستعارە کە تەلیسمی جیهانی ئەفسانەیی

بەتاڵدەکەنـــەوەو جیهـــانێکی میتۆلـــۆجی دروستدەکەن لە جۆرێکی نوێ. بەڵام هەموو ئەو کەرەستانە سەرکەوتو نەبوون لەوەی مەبەستی ئەو شیعرانە بشارنەوە کە دەیانویست بڵێن ئـاین بەرژەوەنـدیی چـینێکی دەسـتەبژێری پیاوانی ئاینی دەپارێزی کە پشتئەستورن بە هاوپەیمانیی نێوان کڵێسا و دەوڵەت، هەروەها پشتئەستورن بە چەند عەقیدەیەکی غەیبیی و وێناگەلێکی خورافی ناکۆك کە ئەقڵی عەوامی خـەڵکیان داگیرکـردووە. ئەڵبەتـە ژمارەیـەکی زۆری خوێنـەران نـازانن شـیلی هەڵمـەتێکی شـــیعریی و پەخشـــانئامێزی چـــڕی دژی ئیدعاکردنی هەقیقەت سەبارەت بە ئاینێکی نێردراو لە ئاسمانەوە بەرپاکردووە، بەڵام لە راستیدا ئەوە مەبەست بوو جا ئیتر پەسەندی بکەن یان نکوڵی لێبکەن.

**کۆتایی:**

**تیۆرەی ئەدەبی و هۆکاری جیاوازییەکان**

ئەم لێکۆڵینەوەیە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە دیالۆگی هەنوکەیی لە مەیدانی تیۆریدا بەڵگەی ئەوەیە دیدو بۆچوونەکانی سپینۆزا هێشتا دروست و کاریگەرن، لە کاتێکدا زۆر کـەس نـەیاری ئـەو دیـدو بۆچـوونانەن و رەخنەگرانیش لەسەر هەموو ئاستەکان ناکۆکن لـەو بارەیـەوە. گـرنگترین خـاڵی نـاکۆکی پەیوەنـدیی بـە ئەگـەری لێکدانـەوەی کـارە ئەدەبییەکانـەوە هەیـە لەبـەر رۆشـنایی خسـتنەڕووی بـیرو بۆچـوونەکان و مشـتومڕ لـەبارەی بارودۆخـە جیاوازەکـان و بایـەخی مـەعریفیی پەیوەندیـدار بـە هەڵسـەنگاندنی ئـەقڵانی و گـەڕدانی رەخنەییـەوە. رەنگـە دوا نوسـینەکانی ئیمپسـۆن، بەتایبـەتی کتێبـی "ستراکتۆری وشە ئاڵۆزەکان" دیارترن نمونەی ئەو پرۆژە رەخنەییە بێ بۆ خستنەڕووی پرس و بوارەکانی تیۆرەی ئەدەبی، لەهەمان کاتیشدا بۆ خسـتنەڕووی بابەتگـەلێکی فـراوانتر وەك نـاوەرۆکی ئـەخلاقیی مێـژوویی، بەتایبـەتیش ناوەرۆکی ئاینی.

بەڵام زۆر هەڵەیە گەر وابزانین لەنێوان ئەو دوو تێزەدا ناکۆکی و جیابوونەوە هەیە، چونکە بایەخـدانی زۆری ئیمپسـۆن بـە شـیکردنەوەی سیمانتیکی بەمەبەستی گەیشتن بە هەقیقەت، کە بەسەر شیعرو رۆمانیشدا پێڕەوی کرد، هاوزەمان بوو لەگەڵ خۆدەربازکردنی لە فشاری عەقیـدەی مەسـیحی و هـەوڵ و کۆششـە بێوچـانەکانی بـۆ شـیکردنەوەی ئـەدەب بەشـێوەیەکی ئـەقڵانیی پـەتی. لەڕاسـتیدا ئیمپسـۆن، پـاش کتێبـی خواوەنـدی میلتـۆن *Milton's God* (1961)، بەرهەمە رەخنەییەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ مشتومڕ دەربارەی دۆخی دەربـازبوون و ئـازادی لای ژمارەیـەکی زۆری ئـەدیبان، وەك مـارلۆ، دۆن، مارفـل، کـۆلێردج، جـۆیس، ئیلیـۆت، یتـیس و کەسـانێکی تـر. بـەگوێرەی لێکدانـەوەکانی ئیمپسـۆن ئـەو ئەدیبانە هەموویان کوشتەی دەستی کێشەیەك بوون کە بریتی بوو لە هەستکردن بە گوناهو ململانێی نێرڤسی لە ناخی خۆیاندا، چونکە ئەوان یان بێهیچ دوودڵیەك تەسلیمی پەیامی مەسـیحی دەبـوون، یـان زۆر سەرسـەختانە بـەرەنگاری دەبوونـەوە، سـەرەنجام بوونـە یەخسیری چەند لێکدانەوەیەکی ئاینیی نوێ

لەپێناو ئەنجامدانی رۆڵێکی ئەخلاقیی یان موژدەی گەیاندنی پەیامێکی ئایینی ( *Empson, 1984, a,b*). مەبەستی من ئەوە نیە بڵێم هەموو ئەو نوسینانە بەپلەی جیاواز توانای قەناعەت پێهێنانیان هەیە، یان بڵێم پرۆژەیەکی تەواو پێشکەش دەکەن دەربارەی فەلسەفەیەکی هێرمینیۆتیکای سکیۆلاریی نوێ، کە دواتر شیکردنەوەیەکی سیمانتیکیی مێژوییان لێدەکەوێتەوە لە کتێبی "ستراکتۆری وشە ئاڵۆزەکان"دا. بەڵکو مەبەستی نوسینەکان ئەوەیە هاوکاریمان بکەن بۆ دیاریکردنی پەیوەندیی توندی نێوان ئارەزوی رەخنەگری ئەقلانی لە روونکردنەوەی سەرچاوەی بیرۆکە هەڵەو شێواوەکان، هەروەها بایەخدان بە مانای ئەدەبی دوور لەو کەرەستانەی ئاماژەیان پێدرا وەك ئاڵۆزیو کۆدژیو وتەزای ساختەو پاساوەکانی خەیاڵو چەندین پاساوی لاوازو دروشمی باقو بریقی تر کە رەخنەگران بانگەشەی بۆ دەکەن.

پاشان ئەوە رێکەوت نەبوو کە خوێندنەوەی ئیمپسۆن بۆ میلتۆن رێرەوێکی رۆمانتیکی چەپ وەرگرێ، یان رێکەوتێکی نا-نەریتی کە بلێك *Blake* ئەو دێرە شیعرە بەناوبانگەکەی پێ دەستپێکرد کە تیایدا وەسفی میلتۆن دەکا بەوەی "پاڵپشتی پارتی شەیتانە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێ"، بەهەمان شێوە شیلی لە وتاری "داکۆکیکردن لە شیعر 1821"دا درێژەی پێدا. ئیمپسۆن هەمان نەریتی لە خوێندنەوەی شیعری میلتۆن-دا پێرەوکرد، کە تیایدا سێ تەوەری سەرەکیی لەبەرچاوگرتبوو: یەکەم، "بەهەشتی ون" چامەیەکی داستانئامێزەو هەڵگری چەند ناوەرۆکێکی ئایدیۆلۆجیی پەیوەندیدارە بە عەقیدەی مەسیحییەوە، کە نابێ وەك "ئەدەبێکی مەزن" مامەڵەی لەتەکدا بکرێ، کە گوایا هەروەك شاعیرو رەخنەگری ئینگلیزی سیسیل دای لویس *C. Day Lewis* (1904-1972) دەڵێ نیشانەی یاخیبوونی پێوەدیارە لە ئاین..، واتە سەرباری توندرەوییەکەی هیچ کێشەیەکی لە گۆشەنیگای لاهوتییەوە تێدا نیە. دووەم، چامەکە بەرگەی چەندین سەختیو دژواریی گرتووە لەپێناو پاساوهێنانەوە بۆ ئیرادەی یەزدان لەئاست مرۆڤدا. سێیەم، میلتۆن شایەنی ئەوەیە کە رێزێکی زۆری لێبگیردرێ، لانی کەم لەبەر ئەوەی خاوەنی هەستو سۆزی یاخیبوونە دژی داخوازیەکانی عەقیدەی ئاینی رەسمی خۆی، سەرباری ئاستی "نائاگایی" لە یاخیبوونەکەیدا.

بەکورتی ئیمپسۆن زۆر بە توندی دژی هەر خوێندنەوەیەك دەوەستێتەوە کە هەوڵ بدا کارە هونەرییەکان بگەڕێنێتەوە بۆ بواری ئەو هەقیقەتە خەیاڵیانەی کە وەك پەخشانی فەلسەفی پەنا نابەنە بەر ئەقڵو لۆجیك، یان پشت نابەستن بە پێوەرە باوەکانی رەفتاری مرۆیی راست. ئەمە ئەو پنتەیە کە تیایدا "رەخنەگرە نوێیەکان" روبەڕووی چەندین گرفت بوونەوە سەبارەت بە رێچکەی ئیمپسۆن-ی رەخنەییو دووچاری پشێویی کردنەوە. هەرچەندە ئەوان رازی بوون بە بیرۆکە پتەوەکەی وی سەبارەت بە خوێندنەوەی ورد *close-reading*و لێکدانەوەی رواڵەتی وتەیی..، بەلام رێچکەی توندو ئەقلانیی ئەویان پەسەند

نەکرد سەبارەت بە دەرخستنی بابەتە لۆجیکیو بیرۆکــە هوشــیارەکان لــە چــامەکاندا، کــە بەسروشتی حاڵ لەگەڵ وتەکانی ئەواندا یەك نایەنــەوە. جــۆن کــرۆ رانســۆم John Crowe Ransom نیگـــەرانیی ئـــەو جـــۆرە کەســـانە وێنادەکاو دەڵـێ ئیمپسـۆن زیـاد لـە پێویسـت باس لـە شیعر دەکاو شتگەلێکی لێباردەکا کە بەرگەی ناگرێ. هەروەها دەڵێ باشترین نمونە دەربارەی ئەو رێچکە رەخنەییە توندە بریتیـە لـە شیکردنەوەکەی ئیمپسۆن بۆ چامەی "هێربێرت Herbert"و "قوربانی The Sacrifice" کە تیایدا دەگاتـە زنجیرەیـەك بابـەتی لـۆجیکیی هـاودژو پێچـەوانەی پرنسـیپەکانی بـاوەڕی مەسـیحی. رانسۆم پێیوایە "دیدیی هێربێرت-ی شاعیر بۆ پرسـەکانی بـاوەڕ هـەمان دیـدی پیـاوی لاهوتـە، لەگـەڵ یـەك جیـاوازیی زۆر گرنگـدا ئـەویش ئەوەیـە کـە یەکـەمیان گاڵتـەجاڕو بێپەروایـە بـــەڵام دووەمیـــان جـــدیو مۆنومرچـــە". رانســۆم لــە کۆتــایی ئــەو نوســینەدا دەڵــێ: "هەرچـەندە شـیعری میتـافیزیکی ئیلـهام لـە لاهـــوتو عەقیـــدە وەردەگـــرێو هـــەوڵی لاساییکردنەوەیان دەدا، بـەڵام لاهـوتو عەقیـدە نیــەو هــەوڵی ئــەوەش نــادا ببێتــە ئــەو دوو شتە"(*Ransom, 1938, pp.328-9*).

ئەم ناکۆکییە فراوانیی ئەو کەلێنـە دەردەخا کـە لـەنێوان بیرکردنـەوەی ئیمپسـۆنو رێچـکە رەخنەییـە هاوچـەرخەکاندا هەیـە، یەکێکیشـیان رێچکە کۆنەکەی "رەخنەی نوێی"یە کە هەڵگری چـەندین مـۆركو دروشمـی مەسـیحیی نوێیـە، پـاش ئـەویش چـەندین قوتابخانــەی فیکــری رەخنـــەیی ســـەریانهەڵدا کـــە رایەڵـــەکانی پەیوەنـــدیی نێـــوان مانـــاو واتـــاو بـــەهاکانی هەقیقـەتو سـاختەیی دەپسـێنێ. کاریگـەرترین گەواهی لەو بارەیـەوە ئـەوەی جۆناسان کوللـەرە Jonathan Culler لە کتێبەکەیدا *Framing the Sngn* (1988). کوللـەر هـاوڕای ئیمپسـۆنە لـەو خاڵەدا کە ترسناکترین شت لە تەوژمی رەخنـەی ئەنگلۆ-ئەمریکیدا، کە لە دوای جەنگی جیهـانی دووەمـــەوە بڵاوبـــۆوە، بریتیـــە لـــە مـــەیلی نمایشـکردنی کـارە ئەدەبیـەکان لـەناو تـەرازوی عەقیدەو بەها ئاینییەکاندا کە هەندێکیان دیـارو هەنـــدێکیان شـــاراوەن. لـــەوەش ترســـناکتر بەردەوامبوونی ئەو کارەیـە تـا ئـەو ئەندازەیـەی گومـان بکـرێ لـەوەی کـە بەشـێکە لـە کەلـەپوری رۆشـــنبیریی مەســـیحیو تێپەڕانـــدنی ببێتـــە وێرانکردنـی ئـاینو گـومڕاییو بـێزەوقی. "ئـەم قەیرانــە شــتێکمان یاددەخاتــەوە کــە دەشــێ رووبـدا، (بەتایبـەتی) ئـەو کاتـەی کـە پرۆسـەی فێرکـــردن دەســـبەرداری ئـــەرکی مێـــژوویی خـــۆی دەبـــێ لـــە قەڵاچـــۆکردنی خورافـــەو هانـدانی گفتوگـۆ لـەنێوان هـەموو ئاینەکانـداو لـــە بانگەشـــەکانی راســـتیو ناڕاســـتی دەکۆڵێتـەوەو دژی هـەموو وێنـەو کاریگەرییـە سیاسـیەکانی دۆگمـاتیزمی ئـاینی دەجـەنگێ" .(*Culler, 1988, p.78*).

هەڵمەتەکەی کوللـەر تـەنها دژایـەتیکردن نیـە لەئاســت پشــێویی پێــوەرە رەخنەییــەکان، تێکەڵکردنی کارە ئەدەبیەکان بە عەقیدەو بەها ئاینیـەکان، کاریگـەریی بزاوتـەکانی ژیاندنـەوەی ئـاینی لـە مەسـیحیو ئیسـلامدا لەسـەر فیکـری رەخنـەیی هاوچـەرخ...، بـەڵکو دژی ئـەو میتـۆدە ئەکادیمییەشـە کـە حـاڵی حـازر پێڕەودەکـرێو

کەمتەرخەمە لەوەی رۆڵی خۆی ببینێ لە بڵاوکردنەوەی کەلەپوری رەخنەیی رۆشنگەر، جا ئیتر بەهۆی خۆپارێزییەوە بێ یان بەهۆی رەچەڵەکخوازییەوە بێ. کوللەر تێبینی ئەوەش دەکا کە لە ماوەی رابردوودا هەڵمەتێکی گەورەی ژیاندنەوەی کەلەپورە پیرۆزەکان *the sacred* بەرپابووە، هەروەها بایەخێکی زۆر بەو کەلەپورە دراوە نەك هەر لە نێوەندی مەسیحییە رەچەڵەکخوازە نوێیەکاندا –رەخنەگرە نوێیەکان لە ئەمریکا– کە ئیمپسۆن رەخنەیان لێدەگرێ، بەڵکو لە نێوەندی ماموستایانی چەند قوتابخانەیەکی رەخنەیی تریشدا، وەك: رەخنەی ئەفسانەکان *myth-criticism*، دەرونشیکاری، تیۆرەی گێرانەوە *narrative theory*، تیۆرەی راڤەکاریی، هەڵوەشاندنەوە.. تەنانەت جیفری هارتمان بەتەوسەوە پێشنیاری ئەوەی کرد کە بەشەکانی ئەدەب لە زانکۆدا ناوبنرێن "بەشەکانی ئیدارەی نهێنییە پیرۆزەکان *Department of Mystery Management*" (ل81). بەڵام بەهەرحاڵ هەروەك کوللەر ووتی: "رەخنەی ئەدەبی بەرەو ئەوە دەڕوا گوتاری ئاینی تۆخبکاتەوە، هەروەها یاسا بۆ ئەو گوتارە دادەنێ لەبری ئەوەی رێرەوی رۆشنگەرانەی تێدا بدۆزێتەوە"(ل79). ئەمە مانای ئەوە نیە رێز لە بەها ئاینیەکان نەگرین، بەڵکو داوای ئەوە دەکەین کە لە شیکردنەوەی ئەو بەهایانەدا ئەقڵ پەك نەخەین، هەروەها داوادەکەین فیکری رەخنەیی لەئاست ئەو بەهایانەدا بەگەڕبخرێن، چونکە باوەڕ بریتیە لە ئازادیی هەر تاکێك لەوەی باوەڕی بەشتێك هەبێ یان نا، بێ ئەوەی رێگا بۆ ئەقڵی خەڵکی دابنرێ بەوەی چۆن بگەڕێ و چۆن وردبێتەوە.

ئەمە ئەو سنورەیە کە لەنێوان لایەنەکانی ململانێدا هەیە سەبارەت بە رۆمانەکەی سەلمان روشدی. چونکە لەلایەکەوە ئەو کەسانە ئامادەییان هەیە کە داکۆکی لە هەقیقەتە بەڵگەنەویستەکان دەکەن، ئەو هەقیقەتانەی کە ملکەچی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی یان دیالۆگی رەخنەیی نین. لەلایەکی تریشەوە تاقمێك ئامادەن کە حاڵی حازر لە دۆخی پەرتەوازیی و ناکۆکیدان و بانگەواز بۆ دیالۆگی کراوە و مشتومڕێکی ئاشکرا دەکەن بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی سەرلەبەری هەڵوێستەکە، هەروەها بەڵگەو بەهای نەیارەکانیان بەبەراورد لەگەڵ بەڵگەو بەهاکانی خۆیان تاوتوێ دەکەن. رەنگە ئەو خەڵکانە هەڵوێستی بیریارە ئازادەکان و کۆششی بیریارانی رۆشنگەرییان لەیادکردبێ لەبابەتی ئیرازمۆس، مۆنتان، سپینۆزا، کانت و ڤۆڵتێر و هەموو ئەو کەسانەی کە بەشدارییان لە سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی مەسیحیەتدا کرد. ئەوەتا ئێستا ئێمە زۆر پێویستمان بە تیۆرەیەکی ئەدەبی هەیە کە ببێتە چوارچێوەیەکی بێگەرد و گوتارێکی تایبەت بۆ حوکمدان سەبارەت بە هەڵوێستە پێکاهەڵپژاوەکان دەربارەی بینینی هەقیقەت. بگرە هەروەك کوللەر دەڵێ لەسەرو هەموو ئەو شتانەوە:

"پێویستە بێوچان بەرگری لە هێزی هاندەری رۆشنگەر و رەخنەگرانەی تیۆرەی ئەدەبیی هاوچەرخ بکەین، ئەو هێزەی تاقمێك لە رەخنەگران بەلای خۆیدا رادەکێشێ بەمەبەستی

خزمەتكردنی چەند غايەتێكی ئاينی. پێويستە پرسيار لە خۆمان بكەين و بڵێين: بۆچی ئێستا لێكۆڵينەوە ئەدەبييەكان دەسبەرداری دروشمی (دەربازبوون لە دەسەڵاتی پياوانی ئاينی) بوون؟ پێويستە هەڵوێستی كردەيی وەربگرين بۆ جياكردنەوەی گوتاری رەخنەيی لە گوتاری ئاينی و ئايديۆلۆجی، بۆ ئازادكردنی لێكۆڵينەوە ئەدەبييەكان لە كۆت وبەندی لاهوت و كەلەپوری راڤەگەری و دەسبەرداربوونی بيرۆكەی دەقی پيرۆز. لەو پێناوەدا تەنها پێويستمان بە گەرانی تيۆريی نيە، بەڵكو پێويستمان بە رەخنەی كردەيی و سياسيش هەيە، بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی داپڵۆسێنەری گوتاری ئاينی بێئەوەی لە رێزو ويقاری ئاين كەم بكرێتەوە"(*1988. p.86*).

من هيچ شتێكی زيادەم نيە لە پەراوێزی تێزەكەی كوللەر-دا بينوسم تەنها هێندە نەبێ كە جياكاريەكەی وی لەنێوان مەعريفەی تيۆری و مەعريفەی پراكتيكيدا هاودژی لەنێوان ئەو دوو جۆرەی مەعريفەدا دروستدەكا، يان ئەو مانايە دەبەخشێ كە مەعريفەی تيۆری بەهەدەردانی كۆششێكی فيكرييە كە باشتر وايە بەرەو مەبەستی عەمەلی ئاراستەبكرێ. لە راستيدا كتێبەكەی وی دژی ئەم جۆرە وێناكردنەيە، بەتايبەتی كاتێ ستايشی كتێبەكەی ئيمپسۆن "ستراكتۆری وشە ئاڵۆزەكان" دەكا، ئەو كتێبەی تيۆرەيەكی راڤەگەری پێشكەشدەكا لەرێگەی چوارچێوەيەكی عەمەلی فراوانترەوە كە پشتئەستورە بە ديدی خۆی بۆ تێگەيشتنی نێوكۆی كۆمەڵايەتی مێژويی *socio-historical*.

لای من كارێكی رەخنەيی كە ديدی تيۆری و مەبەستی پراكتيكی پێكەوە كۆبكاتەوە بريتيە لە كرۆكی "ئەركی رەخنە" و ئامانجی لێكۆڵينەوە ئەدەبييەكانە بەگشتی. بەرای من ئەم بابەتە ناوكی ئەو ديالۆگەيە كە ئێستا و لەم قۆناغە مێژووييەدا ئەنجام دەدرێ، لە نێوكۆی واقعێكی سياسيدا كە بە هەموو هێزيەوە لەنێو ئەو هەڵا گەورەيەدا ئامادەيە كە دەربارەی رۆمانەكەی سەلمان روشدی لەگۆرێدايە. لە گەرمەی ئەو پاشاگەردانی و پەرچەكردارە دژبەيەكانەدا خەريك بوو رۆڵی رەخنەی ئەكاديمی بفەوتێ و دەنگی بتاسێ.

## پەراوێزەكان:

(1) مەبەستی نوسەر لە تايبەتمەندييەكانی شيعر كێش و سەرواو كەرەستە جياوازەكانی رەوانبێژييە، هەروەها مانای بێسنوری چامەو ناونيشانە مەجازيەكەی... هتد.

(2) واتە توانای ئەو گوتارە لە روونكردنەوەی چەمكە ناراستەكان لەرێگەی سيستمێكی گێرانەوەی تۆكمەو نمايشێكی راستەوخۆ بێ پێچ و پەنا.

(3) لێرەدا وەرگێری عەرەبی ئەم دەقە پەراوێزێكی درێژی دەربارەی رۆمانەكە نوسيوە كە تيايدا ميتۆدێكی رەخنەيی پێچەوانەی ميتۆدەكەی كريستۆفەر نۆرس پێرەوكردووە كە بەپێويستمان نەزانی تەرجەمەی بكەين. (و.ك)

(4) ناوی راستی دزرايۆزس ئێرازموس (1466-1536) گێرهارد گێرهاردسە كە ناوێكی لاتينيە، بەڵام خۆی گۆرپويەتی بەو ناوە يۆنانييەی كە ناوبانگی پێوە

دەرکــردووە. فەیلەســوف و بیریــارێکی هۆڵەنــدی بــوو تیۆلۆجیـاو ئایناسـی خوێنـدووە، چـەند پلەیـەکی لـە کڵێسادا وەرگرتووە، تا دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساوە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بخوێنێ، لەوێ فێری یۆنانی بووە، پاشان بانگهێشت کراوە بۆ کامبردج تا ببێتە وانەبێژ، دواتر هەر لەوێ بۆتە ئوستادی لاهوت. چەندین نوسینی هەیـە دەربـارەی هونـەرەکانی ئـەدەب و زمـان و تێرامـان و سەرگوزشـتەی پیـاوانی کڵێسـا، کـە تیایانـدا بەشـێوەی داشۆڕین و گاڵتەجاڕی باس لە کەموکورتیەکانی پیاوانی ئاینی دەکا. بەڵام گەورەترین کاری وی لە بواری لاهوتدا بریتیـە لـە سـاغکردنەوەی پـەیمانی نـوێ (ئینجیـل) و بڵاوکردنـەوەی بـەزمانی یۆنـانی لەگـەڵ تەرجەمەیـەکی لاتینیدا، هـەر ئـەو کـارەش بـووە هـۆی ئـەوەی نازنـاوی پێشـەنگی راڤـە (تـەئویل)ی رەخنـەیی کتێبـی پـیرۆزی پێببڕێ و ببێتە یەکێك لە پیاوانی ریفۆرم و رێنیسانس لە ئەوروپای چاخەکانی ناوەڕاستدا. لە راستیدا ئێرازموس زانایەکی ئەکادیمی بوو نەك پیاوێکی ئاینیی لەبابەتی لۆســەرو پێشــەنگەکانی تــری چــاخی رێنیسانســی ئــەوروپی. ســەرباری رەخنــەی وی لــە خەوشــەکانی کاسـۆلیکیەت بـەڵام هـەروەك کەسـێکی دڵسـۆزی ئـەو مەزهەبە مایەوە.

(5) چـیرۆکێکی فەلســەفییە کـە ڤـۆلتێر ئیلـهامی رووداوەکانی لەو بومەلەرزە ترسناکەوە وەرگرتووە کە ساڵی 1755 لە شاری لیشبۆنەی پورتوگال روویداوە. لە رۆمانەکەدا ستریێسێکی گاڵتەجاڕانە بەدیدەکرێ دژی کارەساتەکانی قەدەر، هەروەها رەخنە لەو دیدە گەشبینە دەگـیردرێ کــە لای فەیلەســوفە هاوچــەرخەکانی وەك لیبێنتس و رۆسۆ هەبووە. بەدیاریکراوی باس لە شـەڕو گونـاهو کارەسـاتی زۆردارانـە دەکـرێ کـە مرۆڤـەکان رادەپێچن. رۆمانەکە ساڵی 1759 بڵاوبۆتەوە.

(6) درامایـەکی لیریکییـە لـە چوار نەسـکدا ساڵی 1820 بڵاوبۆتەوە، تیایدا شیلی هەوڵدەدا گوزارشت لەو رۆحـی ئازادییــە بکـا کــە پــاش شۆڕشــی فەرەنســی ئەوروپای تەنیبوو، هەروەها ستایشی ئەو پرنسیپە دەکا کـە سـەردەمانێك لـە شـیعرو نوسـینەکانیدا بـەرگریی لێدەکردووە. بەپێی ئەو پرنسیپە هێزی رەها بریتیە لە گوناهی رەها، ستەمگەریی بەرفراوانیش گەندەڵییەکی تاکڕەوانەیە. دراماکـە ئیلـهام لـە ئەفسـانەیەکی یۆنـانی وەردەگـرێ بـۆ گوزارشـتکردنێکی شـیعری و نیشـاندانی ئاسمـان وەك مەیـدانی شـانۆگەرییەك کـە چـەند کەسـێك رۆڵی یەزدانەکان دەبینن، "جۆبیتەر" مەزنە خواوەندی ئۆڵۆمپ وەك مەزنـە دیکتـاتۆر هەڵدەبـژێردرێ کـە هـەموو خواوەنـدەکانی تـر ملکەچـی دەبـن. بـەڵام رزگـاربوون و ئازادی لە کەسایەتی برۆمیسیۆسدا بەرجەستەدەبێ کە لەگـەڵ مرۆڤەکانـدا راستگۆیەو ستەمی جۆبیتەریان بۆ دەردەخـاو ئـاگری یـەزدانیان بـۆ دەدزێ کـە ئـاگری مەعریفەو زانستە.

## سەرچاوە:

کریســتوفر نــورس، الخطـاب الروائـي والخطـاب الـديني: قضـية نقدیـة متجـددة. الأدب والنقـد والتـاريخ الأدبـي. ت: د. عبـد الحميـد شـيحة، المجلـس الأعلـى للثقافة، ص117–141.

# ئازادی لە ڕوانگەی هێگل و کانتدا

رامین جەهانبەگلوو

لە فارسییەوە: ئاکار مەریوانی

لە چەند دەیەی رابردووەوە رووناکبیران خەباتێکی پڕ ئاریشەیان لەبۆ پێناسەکردنی چیەتی ئازادی دەستپێکردوە. هزرڤانان لە هەوڵدا بوون تا پێناسەیەکی رەها و کۆتایی لەم بابەتە بەدەستەوە بدەن و ویستوویانە بە توێژینەوەی تیۆرە رکەبەرەکان رێساکانی کایەکە بگۆڕن. لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا ئیمانوێل کانت لە بەرهەمەکانیدا هەوڵیدا بە توێژینەوەکردن لەسەر هزرەکان و باوەڕەکانی سەردەم، گەشە بە تیۆری ئەقڵانیەتی رادیکاڵ، وەك باشترین ئامراز لە پێناسەکردن و وەدیهێنانی ئازادی جیهانیدا بدات. لەوێوە کە کانت لەم باوەڕەدا بوو کە بەجیهانیبوونی ئەقڵانیەت یەکسانە لەگەڵ بەجیهانیبوونی ئازادیدا، نامیلکەیەك کە ئەو لەژێر ناوی ئاشتی سەقامگرتوودا نووسی ئەم روانگەیە لە چێوەی پێکهێنانی فیدراسیۆنێکی جیهانی لە نەتەوەکاندا دێنێتە گۆڕێ، کە ئامانجەکەی گەیشتن بە ئاشتیەکی ئەقڵانیە. بە پێچەوانەوە، دژایەتی سەرسەختانەی گ.و.ف.هێگل لەگەڵ کانتدا، بە کۆسپێك لەسەر رێگای مەترسیە ئاکاریە شاراوەکان لە واتای کانتی بەجیهانیکردنی ئەقڵانیەتی رۆژئاواییدا بە ئەژمار دێت. هێگل ئەم تیۆرە لەسەر بنەمای وەدیهێنانی ئازادی لە چێوەی دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتانێکدا دێنێتە کایەوە کە نوێنەرایەتی باوەڕەکان و بەها ئەقڵانیەکانی هاوڵاتیانی خۆیان دەکەن. هێگل پێی وایە کە فیدراسیۆنی دەوڵەتان وێدەچێ شتێکی نابەجێ، دەسکرد و کاریگەری وەرگر بێت و ئینتیمای بۆ بەتایبەتیبوون هەبێت، کەواتە هاوئاراستەی ئازادی نیە. هێگل بە مەبەستی بەهێزکردنی واتای ئازادی نەتەوەیی هێرش دەکاتە سەر پێشگریمانە بنەماییەکانی کانت، کە ئاشتی بە دیاردەیەکی باش لەقەڵەم دەدەن. لەوێوە کە کۆمەڵگەکان تێڕوانینی ئەقڵانی خۆیان بۆ

ئازادی دیاری و جیا دەکەنەوە، کەوابێ کارێکی ئەقڵانیە کە ئەم روانگە جیاوازە نەتەوەییانە، وەك بەشــگەلێك لــە پرۆســەی وەدیهــاتن و دووبارەبوونــەوەی ژیــان، بکەونــە رکەبەرییــەوە. بەڵام هێگل واتای ئازادی جیهانیش بە بێبایەخ نازانێت. ئەو پێی وایە کە رۆحێکی جیهانی بەسەر پەیوەندیە بەرامبەرەکانی ئەم دەوڵەتە جیاوازانەدا زاڵ دەبێت کە لە کۆتاییدا لە ئاستی تایبەتیبوونی ئەوان بەرزتر دەبێتەوە و دەگاتــە ئاســتی بــەجیهانیبوون. بــەم چەشــنە بــەجیهانیبوون تــەنیا ئــەزموونێکی رۆژئــاوایی نیــە، بــەڵکو پێویســتی بــە بڕیــار و ئیرادەیــەکی جیهانی هەیە.

تیــۆری ئــازادی کانــت بــۆ تێگەیشــتن لــە ئامانجی ئەو لە ئاشتی سەقامگرتوو خاڵێکی دەســپێکی جیــددی و دیاریکــەرە. ناميلکــەی رۆشـنگەری چیە؟ ڕێنوێنیگەلێکە بۆ مرۆڤ تا دەست لە قەبوڵکردنی کوێرکوێرانەی رێساکان هەڵگرێت و لە پرۆسەی پەیجۆریەکانی خۆیدا کەڵك لە ئەقڵ وەربگرێت: "ئەم رۆشنگەریە جگە لە ئازادی پێویستی بە هیچ شتێکی دیکە نیە، ئازادی کەڵکوەرگرتن لە ئەقڵی ئاشکرا لە هەموو بارەکانــدا." کانــت لــەم بڕوایەدایــە کــە لــە رەوشێکدا کە خەڵك کەڵك لە ئەقڵ وەردەگرن ئازادتر دەبن. ئەو دواتر لە ساڵی 1793 و لە ناميلکەیەکدا بەناوی لەسەر پەندی پێشینان: ئەو شتەی کە وێدەچێ دروست بێ رەنگە لە کردەوەدا بەکەڵك نەبێت گەشە بەم روانگەیە دەدات. ئــەو لــە دۆزی دەوڵــەتی مەدەنیــدا دەبێژێت، دەبێ ئەقڵی رووت و پێشئەزموونی و پەتی بکەینە بنەما و بنچینەی یاساکان. واتە

ئەو ئەقڵەی کە بنەماکانی لە دەروونی ئێمەدا شــاردراونەتەوە، نــەك ئــەوەی کــە لــە رێگــای ئەزموونەوە وەدەست هاتبێت. لەوێوە کە ئەم یاســاگەلە لەســەر بنچــینەی بنـــەما ئەقڵانیــەکان راوەســتاون، ئەگەرچــی دەتــوانن ناچارەکی بن، بەڵام هاوکات دەست لە ئازادی مرۆڤ وەرنادەن.

بەشی سێیەمی ئەم ناميلکەیە باس لە مافە نێونەتەوەییــەکان دەکات. کانــت دەبێــژێت کــە مرۆڤــەکان گرێبەســتێکی بنەواشــەیی مــەدەنی پێکدێنن کە ئەم گرێبەستە لەبەر نەهێشتن و لــەنێوبردنی توندوتیــژی جیهــانی خــاوەن رێساگەلێکی ئەقڵانی ناچارەکییە. بەم چەشنە ناچــاری و گوشــاری شــەڕە بەردەوامــەکان "لــە ئاکامدا دەیانگەیەنێتە بەر زارکەی چوونە نێو رێککەوتنێکی جیهانی و تەنانەت بە پێچەوانەی ویست و ئیرادەی خۆیانەوە." تیــۆری ئــازادی کانــت لــە ناميلکــەی ئاشــتی ســەقامگرتوودا ئاراســتەی ئامــانجی کۆتاییهــاتنی شــەڕی ســەقامگرتوو کــراوە. بەشــی یەکــەمی ئــەم ناميلکەیە پێشمەرجگەلێکی وەك قەدەغەبوونی دانانی نەتەوەیەك بە هۆی نەتەوەیەکی دیکە و دەســتوەرنەدان لــە ئەساســنامەی نەتــەوە و حکوومەتێکی دیکەدا لەخۆدەگرێت. کانت لە مەسەلەی چارەدۆزی بۆ گەیشتن بە ئاشتی دەبێژێت، دەبێ ئەساسنامەی هەموو نەتەوەیەك کۆماری بێت. تەنیا لەم رەوشەدایە کە ئازادی مرۆڤــەکان گــارانتی دەکرێــت، چــونکە هــەموو مرۆڤەکان لەگەڵ یاساکاندا دەسازێن و لەژێر سێبەری ئەو یاسایانە و نوێنەرایەتیەکانیاندا بە یەکسانی ژیان دەبەنە سەر. ئەو لە وتاری

دووەمی ئەم نامیلکەیەدا نەتەوەکان بە کەسانێك دەژمێرێت کە دەبێ بە هۆی گرێبەستێکی هاوشێوەی گرێبەستی مەدەنیەوە مافەکانی خۆیان گارانتی بکەن. فیدراسیۆنی نەتەوەکان، یاخود نەتەوەی نەتەوەکان، لەسەر بنەمای یەکسانی و بەبێ حاکم و مەحکووم بنیاتدەنرێت. کانت پێی وایە کە هەموو نەتەوەیەك بەهایەکی بەرز بۆ نەبوونی بەرتەسکی و سنووردارییە دەرەکییەکان دادەنێت و هەر بەم پێیەش، ئەم مافە بە خۆی نادات کە شەڕفرۆشی بکات و شەڕ بخولقێنێ. بەڵام ئەقڵ شەڕ رەتدەکاتەوە و خوازیاری ئەوەیە کە نەتەوەکان ئازادی پووچی دەرگیربوون لە شەڕە یەك لەدوای یەکەکاندا وەلابنێن و خۆیان لە چوارچێوەی یاسایەکی هەمەکی لە نەتەوەی خەڵکدا رێکبخەن. ئەم کارە لە رەوشێکدا دەلوێت کە ویست و ئیرادەی گشتی روو لە ئەقڵ بێنێت .

بەشی کۆتایی نامیلکەکە بە سەرنجدان لە ئاشتی سەقامگرتوو چڕکراوەتە سەر گرژی و ململانێی نێوان ئاکار و سیاسەت. کانت دەبێژێت:"ئەگەرچی مرۆڤ بە کردەوە ناخوازێت کارێك بکات کە بۆ گەیشتن بە ئاشتی سەقامگرتوو پێویستە، بەڵام یەکیەتیبەخشین بە کۆمەڵگەی مەدەنی بەم شێوەیە پێویستی بە هێز هەیە، و رەنگە یاسادانەرێك توانستی ئەوەی هەبێت کە بەم چەشنە خەڵکی رێکبخات و پاشان ئەم دەرفەتەیان بۆ برەخسێنێت کە بە هۆی ویست و ئیرادەی گشتی خۆیانەوە ئەساسنامەیەکی یاسایی بنیاتبنێن." کانت لەم باوەڕەدایە کە ئەرکی سیاسەتڤانێکی ئاکاری چاکردنی ئەساسنامەی نەتەوەکەی خۆی بە چەشنێکی هاوئاهەنگ و سازگار لەگەڵ مافە ئەقڵانی و سروشتیەکاندایە. بەڵام کەسێکی کریارخواز بەپێی ئەزموونی خۆی بە سانایی رێگاچارەکە دەخاتەڕوو. لە لایەکی دیکەشەوە نموونەیەکمان بۆ چوون بەرەو ئاشتی بەردەوام لەبەردەستدا نیە. لەم روویەوە، ترس و پارێزی سیاسی بە ئامانج و ئاکامی دڵخوازمان ناگەیەنێت. لەلایەکی دیکەوە، وشیاری سیاسی وادەخوازێ کە پێشەکی دەبێ بە شوێن ئەقڵی پەتیدا بگەڕێین، "... و وێجا ئامانجەکەتان(ئاگایی ئاشتیی سەقامگرتوو) خۆی بە شوێنتاندا دێت." چونکە رێنوێنییەکانی وشیاریەکی لەم چەشنە راستەوخۆ لە چاوگی ویست و ئیرادەیەکی گشتیی زاتییەوە دێتە دەرێ. بەم چەشنە مافەکان وادەخوازن کە نەتەوەیەك بەپێی مافە سروشتیەکان ئەساسنامەیەك بۆ خۆی دابنێت و نەتەوەکان بە مەبەستی چارەکردنی یاسایی جیاوازیەکانیان یەکبگرن. ئەوان دەبێ وەفایان بۆ مافگەلێکی لەم چەشنە هەبێ و پێبەند بن پێیان، چونکە ئەم مافانە لە ئاوەزی پەتی پێشئەزموونیەوە سەریانهەڵداوە، و بەم چەشنە، پلە بە پلە ئامانجی ئاشتی سەقامگرتوو وەدیدێت.

گ.و.ف.هێگل لە کتێبی بنەماکانی فەلسەفەی مافدا دەست دەداتە پالاوتن و وردکردنەوەی واتای کانتی ئەقڵانیەتی جیهانی رۆژئاوایی وەك رایشێك بۆ ئازادی. بە بۆچوونی هێگل، ئاراستەی پەروەردە بە هۆی بنەماڵە و

کۆمەڵگەی مەدەنیەوە لە ئاکامدا لە وەدیهاتنی ئازادی تاکەکەسی لە دەوڵەتدا کۆتایی دێت. هەر بۆیە هێگل لەگەڵ ئەوەدا کە توێژینەوە لەسەر رۆڵی ناوەندی ئەقڵ بۆ ئازادی دەکات، هاوکات کاریگەری توخمە کولتوورییە تایبەتەکانی نەتەوەیش لە بیر ناکات. ئەو لە ئاکامدا پێناسەیەکی تۆکمە و پوخت لە ئازادی پێشکەش دەکات کە لە واتای کانتی ئەقلانیەتی جیهانی رۆژئاوایی بەرزتر دەبێتەوە. هێگل گرنگیەکی زۆری بە سەربەخۆیی و تەواویەتی نەتەوەیی دەدا، چونکە تێگەیشتبوو کە نەتەوە وەك گۆڕەپانی وەدیهاتنی ئازادی رۆڵێکی کلیلی دەگێڕێت. ئەو لە ئەنجامدا بۆشگایەکی نێونەتەوەیی وێنا دەکات کە لەودا، نەتەوەکان وەك کەسانێکی ئازاد پێکەوە پەیوەندی دەگرن و رۆحێکی جیهانی پێکدێنن کە لەودا، جیهانیبوون هەژموونی بەسەر تایبەتمەندی و تایبەتیبووندا پەیدا دەکات. جەوهەری دژایەتی هێگل لەگەڵ چەمکی ئاشتی سەقامگرتووی کانتدا لە جیاوازی روانگەی ئەواندایە لەسەر ئازادی. بە بۆچوونی هێگل، "... سەربەخۆیی و تەواویەتی دەوڵەتەکان بە بنەمای سامانەدەری پەیوەندیە بەرامبەرەکانیان بە ئەژمار دێت. ئەوان بەم فاکت و پێوەرانە لە هەلومەرجێکی سروشتی و لە پەیوەندیەکی بەرامبەردا دەژین و مافەکانیان بە هۆی ویست و ئیرادەی تایبەتی خۆیانەوە وەدیدێنن، نەك لە رێگای ویست و ئیرادەیەکی جیهانی و زاڵیەتی دەسەڵاتە رێککەوتننامەییەکان." هێگل لە وەڵامی پێشنیارەکەی کانت لە پەیوەندی لەگەڵ بیچمگرتنی فیدراسیۆنی دەوڵەتەکان بۆ پاراستن و گارانتیکردنی ئاشتی سەقامگرتوو دەبێژێت کە، لەم تیۆرەدا رێککەوتنێکی داسەپاو بەپێی تایبەتبوونی ئەقلانیەتی کانتیدا دەبینێت و بەم چەشنە، ئەم تیۆرە بە "تێکەڵ بە ئەگەرەکان" دەنرخێنێت. هەروەها هێگل لە واتای رێککەوتن و سازگاری فیدراسیۆنی نەتەوەکان لەمەڕ سەربەخۆیی و تەواویەتی نەتەوەییدا، واتای رێککەوتن لەسەر ئاشتی دەبینێتەوە. رەنگە کانت لە هەمبەر ئەم لافانەدا داکۆکی لە خۆی بکات و بێژێت کە بنەما ئەقلانیەکان بە شێوەیەکی پێشئەزموونی لە دەروونی ئێمەدا بوونیان هەیە. ئەم بنەمایانە جیهانین چونکە هاوتەریبن لەگەڵ راستیدا و لەگەڵیدا دەسازێن. کەوابوو:

ئەقڵ تەنیا لە رەوشێکدا دەتوانێ نەتەوەکان لە هەلومەرجی بێیاسایی(کە بەتەنیا شەڕ لەخۆدەگرێت) رزگار بکات کە دەست لە ئازادیە وەحشیانە(بێ یاسا)کانیان هەڵبگرن (بەو جۆرەی کە کۆی گشتی تاکەکان دەیکەن) و بە هاوتەریبکردن و سازانی خۆیان لەگەڵ سنووردارییەکانی یاسای گشتیدا، نەتەوەیەك لە فیدراسیۆنی خەڵکی پێکبێنن"...

ئەم نەتەوەیەی کە لە خەڵك پێکهاتووە پەیرەوی لە یاسای جیهانی دەکات و بەم کارەش ئازادی خۆی وەدیدێنێت. بەرەوڕووبوونەوەی روانگەکانی هێگل و کانت لەسەر ئازادی، بە گشتی لەسەر زەمینەی ئەقلانیەتی جیهانی روودەدات. ئینتیماکانی کانت بۆ ئەقلانیەتی جیهانی بەشێکە لە هەلومەرجی یەکەی مێژوونووسانی رۆژئاوایی لە سەردەمی رۆشنگەریدا. ئەورووپیەکان پێیان

وابــوو کــە چــیدیکە پێویســتیان بــە بــاوەڕە دیــاریکراوە ئایینیــە ئاشــتیدەرەکان نیــە و بــەم چەشنە دەتوانن روو لە ئەقڵ بێنن و پشتی پــێ ببەستن. بەڵام کامە ئەقڵ؟ لە راستیدا پێناسەی هــەموو کۆمەڵگەیــەك لــە چــەمکی "ئــەقڵانی" هــەڵقولاوی ئەزموونــە فکــری، مێــژوویی و کولتووریەکانی ئەو کۆمەڵگەیەیە. لە راستیدا لە رۆژئــاوادا ئەقڵانیــەت لەســەر بنــەمای واتــای بێلایــەنی زانستی کانتی راوەستاوە. بەڵام لــە وڵاتانێکدا کە ئەزموونە بەکۆمەڵەکانیان لەسەر بنــەمای بێلایــەنی زانســتی نیــە، چــەمکی "ئەقڵانیەت" پێناسەیەکی بەتەواوەتی جیاواز وەدەســت دێنێــت. بەداخــەوە کانــت لــە ســێ نامیلکەکەی خۆیدا باسێکی تەواو لەسەر ئەم بابەتــە پێشــکەش ناکــات و لــەم ســۆنگەیەوە، پێناسەی رۆژئاوا لە چەمکی "ئەقڵانی" بە تەنیا پێناســەیەکی دروســت دەژمێردرێــت کــە لێــی خراوەتەڕوو و لەم روویەوە، سیفەتەکەی خۆی، جیهانیبوون، رەتدەکاتەوە. ئەو شتەی کە جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە کانت کاتێك ئەم باسە دەست پێدەکات کە لە روونکردنەوەی ئەقڵدا وەك بنەمای ئاشتی سەقامگرتوو، وتەیەك لە ئینجیل دێنێتەوە:"کەواتە دەتوانین بڵێین کە:"پێشەکی پەیجۆریی مەلەکووتی ئەقڵی کردەیی پەتی و هەقیقەتەکەی بە، پاشان ئامانجی(ئاگایی ئاشتی سەقامگرتوو) خۆی بەشوێن تۆدا دێت.بە پێچەوانەی کانت، تیۆری ئازادی هێگل دەتوانێ هەڵگری پێناسەگەلێکی جۆربەجۆری کولتووری لەمەڕ ئەقڵانیەت بێت و بەم چەشنە، کەموکوڕی و مەترسیگەلێکی نیە کە کانت لەگەڵیدا رووبەڕوو دەبێتەوە.

کانت دژایەتیەکی لە نێوان ئازادی و بەجیهانیکردنی ناچارەکی یاسا ئەقڵانیەکان لە دەوڵەتی مەدەنیدا نەدەبینی و پێی وابوو کە، ئەمانە لەسەر بنەماگەلێك راوەستاون کە پێشتر لە زاتی مرۆییدا شاردرابوونەوە. ناچارەکیەکی گشتی کە ئەو لە ئاستی جیهانیدا وێنای دەکرد، ناچاری شەڕگەلێکی یەك لەدوای یەك بوو کە مرۆڤەکانی ناچار دەکرد بە مەبەستی هەڵهاتن لە توندوتیژی کۆببنەوە و فیدراسیۆنێك پێکبێنن. لە راستیدا ئەو بۆ راکێشانی مرۆڤەکان بەلای فیدراسیۆنێکدا کە پێشنیاری دەکرد زۆرتر پشتی بە هێزی ئەقڵ دەبەست و دەیگوت:"... ئیرادەی گشتی لەسەر زەمینەی ئەقڵ راوەستاوە." یەکێك لە لایەنە کلیلیەکانی ئەم کارە جەختکردنەوەی کانت لەسەر ئەساسنامەیەکی کۆماریە. تەنیا کاتێك کە خەڵك لە دواهاتەکانی شەڕ زیانمەند دەبن بڕیار دەدەن کە ئایا خەباتێکی لەم شێوەیە بکەن کە لەودا ئەقڵانیەت زاڵ ببێت و سەربکەوێت یاخود نە. لەبەر تیشکی ئەم راستیەدا کە ئەقڵی کانتی تەنیا لە رۆژئاوادا بەم بەرفراوانیە قەبوڵکراوە، دەتوانین بڵێین کە ئەم تیۆرەی کانت خاوەن ئەم دژوازیەیە کە ئایا دەتوانین بە کەڵکوەرگرتن لە زۆر نەتەوەکان ناچار بکەین کە پەیرەوی لە گریمانە و رێساکانی ئەو بکەن؟ بەڵگەنەویستە کە سەپاندنێکی لەم چەشنە بە گشتی ناکۆکە لەگەڵ نەریتە فکری، کولتووری و مێژووییەکانی نەتەوەکانی دیکەدا. ئەم ناهاوئاهانگیە کەلێنێکی ناوەکی دروست دەکات کە وێدەچێ بە شێوەیەکی جیددی

شوێن لەسەر ئازادیەکانی ئەوان دابنێت. بەڵام تیۆری روونی ئازادی نەتەوەیی هێگل، ئەگەرچی لەسەر بنەمای ئەقڵ راوەستاوە، بەڵام ئەقڵێکی سنووردار و دیاریکراو نیە کە لە ئەنجامدا بەسەر ئەوانیتردا بسەپێت. تەنیا لە خاڵێکدا دەتوانین لافی ئەوە لێبدەین کە سەپاندنی شتێك بەسەر خەڵکدا بەسوود دەبێت بۆ تەواوکردنی ئازادی ئەوان و ئەوەش کاتێکە کە ئەو شتە لەگەڵ بنەماکانی ئەواندا هاوتەریب بێت. بەڵام سەپاندنی شتێك کە بەتەواوەتی ناکۆکە لەگەڵ نەریت و بنەماکانی ئەواندا، تەنانەت ئەگەر لەژێر ناوی ئازادیشدا بێت، وێدەچێ بەتەواوی دژواز بێت.

لە راستیدا هێگل لە داکۆکی لە ئازادی نەتەوەییدا ئەم گریمانەیەی کانت بانگهێشتی ململانێ دەکات کە دەبێژێت:"ئاشتی شتێکی گونجاوە." هێگل تێگەیشتبوو کە شەڕ بە مانای پێداگرتن لەسەر تایبەتبوونی نەتەوەکانە و لەم روویەوە ئەوان لە پاراستن و داواکردنی مافەکانی خۆیاندا بە سەربەست دەزانێت. گرنگتر لەمەش، شەڕ تەندروستی ئاکاری نەتەوەکان دەپارێزێت، "هەر بەو چەشنەی کە هاتنی "با"، دەریاکان لە بێجووڵەیی دەپارێزێت و نایەڵێت کە بچنە خەوێکی بەردەوامەوە، کەواتە ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئاشتی بەردەوام (و ئەگەر نە سەقامگرتوو) لە نێوان نەتەوەکاندا، پێکهێنەری بێجووڵەیی بێت." رەنگە ئەم هەڵوێستەی هێگل بۆ کانت شاوانیهێنەر نەبێت، چونکە کانت پێی وایە کە مرۆڤەکان پێویستیان بە ئاشتیەکی سەرەڕۆیانە هەیە بۆ ئەوەی کە نەتەوەکەیان هەژموونی و زاڵیەتی وەدەست بێنێت. بەڵام ئەو پێی وایە کە سروشت بە هۆی جیاوازیە زمانی و ئایینیەکانەوە دەبێتە لەمپەر لەبەردەم ئەم پلەیە لە بەردەوامیدا و بەم چەشنە، هاوسەنگییەك لە نێوان دەسەڵاتە رکەبەرەکاندا وەدیدێت. هاوکات، سروشت بە هۆی ئینتیمای مرۆڤەکان بۆ ئەزموونەکان، لێکیان نزیك دەکاتەوە و هاوگرتوویەك لە نێویاندا پێکدێنێت. سەرەڕای ئەم خوار و ژێر کردنە لە پەیوەندیە جیهانیەکاندا، کانت تێگەیشت کە لە ئەنجامدا دەبێ ئاشتی سەربکەوێت، چونکە:"... ئەقڵ وەك ئامرازی دیاریکردنی مافەکان، بە شێوەیەکی رەها شەڕ مەحکووم دەکات و پەیجۆریی هەلومەرجی ئاشتی دەکاتە ئەرکێکی تایبەت و ناوازە".

بەم چەشنە، لێکدژی ئەم دوو هزرڤانە سەرلەنوێ لەسەر چەمکی بەجیهانیبوونی ئەقڵانیەت پێکدێت. بە بۆچوونی کانت ئاشتی بە شتێکی دووری هەڵنەگر بە ئەژمار دێت، چونکە هاوتەریبە لەگەڵ ئەقڵدا. بەڵام بە سەرنجدان لەو شتەی کە پێشتر گوتمان، دۆزەکە ئەمەیە کە کامە ئەقڵ؟ دەتوانین لە رۆژئاوادا داکۆکی ئەقڵانی لە ئاشتی قەبوڵبکەین، چونکە رۆژئاوا چەمکی بێلایەنی کردەیی کانت قەبوڵدەکات. کەواتە بەجیهانیکردنی ئامانجی "ئەقڵانی" ئاشتی کانت، بە پێویست دەبێتە شتێکی داسەپاو و لەگەڵ نەریتەکانی ئەماندا دەکەوێتە دژایەتییەوە. بەڵام بە پێچەوانەی کانت، روانگەی هێگل بۆ دەوڵەتی سەربەخۆ بە چەشنێکە کە لە رێگای خەبات بەدژی

نەتەوەکانی دیکە، ئازادیەکەی دیاریدەکات و دەیپارێزێت و تووشی ئەو دژوازیە داسەپاوەی ئەقڵانیەتی رۆژئاوایی نابێت کە کانت دەیهێنێتە گۆڕێ. لەم رێگایەدا ئەم مەجالە بە نەتەوەکان دەدرێت کە دەستیان بە پلەگەلێکی بەرزتر لە ئازادی رابگات. شایانی باسە کە کانت و هێگل لەسەر سنوورگەلێکی دیاریکراو بۆ شەڕ رێککەوتوون. کانت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە سوپا و یەگانە ئامادە رەزمیەکان پێویستە هەڵبوەشێنرێنەوە، چونکە بە هەڕەشەیەکی بەردەوام بۆ سەر ئاشتی بە ئەژمار دێن. ئەو هێرش دەکاتە سەر سیستمی بەهای نەتەوەیی، چونکە بەڕادەی پێویست یارمەتی مادی نەتەوە دەدات تا کەرەستەکانی شەڕ دابینبکات. کانت دەخوازێ لەمپەرەکانی سەر رێگای سەرهەڵدانی شەڕ بدۆزێتەوە. چونکە شەڕ داهاتووی ئاشتی دەکاتە شتێکی نەلواو. هێگلیش بە جۆرێك خوازیاری"... پاراستنی ئەگەری ئاشتیە. بە چەشنێك کە دەبێ رێز لە سەفیرەکانی وڵاتان بگیردرێت و نابێ شەڕ بە هیچ نرخێك تەنانەت لە نێو دامەزراوە نێوخۆییەکانیشدا رووبدات. ئەو هەروەها داواکاری ئاشتی لە ئاستی ژیانی تایبەتی و بنەماڵەیی و تاکەکەسەکانیشدا دەبێت. بەم چەشنە بە دڵنیاییەوە هێگل شەڕگەلێکی وەك شەڕی یەکەم و دووەمی جیهانی مەحکووم دەکرد. چونکە ئەم شەڕانە لە ئاستی خەباتی نێوان دوو سوپا چوونەتە سەرتر و بوونەتە شەڕگەلێکی هەمەکی و بەرینگیر کە شوێنی ژیانی هەموو نەتەوەکانی کردووە بە گۆڕەپانی شەڕ و بوونی ئەوانی خستۆتە مەترسیەوە.

سەرەڕای ئەو هێرشە توندەی کە هێگل دەیکاتە سەر تیۆری کانت لەمەڕ بەجیهانیبوونی ئەقڵانیەتی رۆژئاوایی، بەڵام ئەو بوونی بنەمایەکی جیهانی بۆ ئازادی رەتنەکردۆتەوە و نکۆڵی لێنەکردووە. بۆ تێگەیشتنی دروست لە تیۆری هێگل لەمەڕ یاسای جیهانی، دەبێ سەرنج لە چەمکی رۆحی جیهانی ئەو بدەین. بە بۆچوونی هێگل دەوڵەتەکان سەربەخۆ و کۆیەکی گشتی ئازادن کە هەمەکیەتە تایبەتەکەیان لە پەیوەندیە بەرامبەرەکانیاندا بیچمدەگرێت. لەم پەیوەندیە بەرامبەرەدا رۆحی دەوڵەتە یەکەکان خاوەن چیەتیەکی گەنگەشەییانەیە کە لە ئاکامدا رۆحێکی جیهانی لێ لەدایك دەبێت کە ئازاد لە هەموو سنووردارییەکانە. هێگل تایبەتبوونی دەوڵەتە سەربەخۆ جۆربەجۆرەکان (و هەروەها ئەو تاکانەی کە پێکیاندێنن) وەك بنیاتنەرانی بەکۆمەڵی ئەم رۆحە جیهانیە وێنا دەکات. ئەوان پێکەوە گشتێکی گەورەتر پێکدێنن کە لە ئامێزی خۆیدا، بەرەو قۆناخێکی بەرزتر لە مێژووی جیهان پێشڤەیان دەبات. بەم چەشنە بە رای هێگل، گەیشتن بە قۆناخێك کە لەودا بەجیهانیبوون زاڵبێت بەسەر تایبەتبووندا بەستراوەتەوە بە تایبەتمەندیە پێشینەکانی دەوڵەتە سەربەخۆکان. بەجیهانیکردنی ئەقڵانیەتی کانتی بەهۆی ناچارکردنی نەتەوەکان بۆ گەیشتنی هەرچی خێراتر بەم قۆناخە باترە دەبێتە هۆی لەنێوچوونی ئەم تایبەتبوونە. هەر بۆیە هەر چەشنە هیوایەك بە بنەمای هەقیقی جیهانی بۆ ئازادی دەبێتە بێهیوایی. هێگل لە روونکردنەوەی پتری ئەم

رۆحــە جیهانیــەدا دەبێــژێت کــە ئــەم رۆحــە بەگشتی لە لایەن نەتەوەیەکەوە پێکدێت کە لە مێژووی جیهانی سەردەمی خۆیدا سەربەخۆ و زاڵ بووە. بەڵام ئەم نەتەوەیەش لە کۆتاییدا روو لـە کزبـوون و رووخـان دێنێـت و دەبـێ "...لـە رەورەوەی مێـژووی جیهانیدا جێی خـۆی بدات بـە نەتەوەیـەکی دیکـە." بـەم چەشـنە ئەگەرچـی هێگل بیاڤی ئاڵمانی بە بەرزترین بیاڤ دەزانێت، بەڵام هاوکات لە ئاکامدا گواستنەوەی ئەم بیاڤە بۆ نەتەوەیەکی دیکە بە نەلواو نازانێت.

دژایەتی هێگل لەگەڵ ئەم تیـۆرەی کانتدا لـەم بـارەوە کـە بـەجیهانیکردنی ئەقڵانیـەتی رۆژئـاوایی هـەموو مرۆڤایـەتی ئازاد دەکـات، بـە تــــەنیا رووبەڕووبوونەوەیـــەکی زانگـــۆیی مێژووناسـانە نیـە. لـە راسـتیدا هەوڵێکـە بـۆ وەڵامـدەربوون لـە هەمبـەر دەسـپێکی سـەدەی بیسـت و یەکەمـدا. حکوومەتـە رۆژئاواییـەکان سەرتاسـەری ئـەقڵی کانتیـان وەك تاقـە بنـەمای رەوایـەتی بـۆ گەشـەی یاسـا قـەبووڵکردووە و تیـۆری بەجیهانیکردنی ئەم یاسایەیان کردۆتـە تایبەتمەنــدی و بــەردی بناغــەی سیاســەتە دەرەکیەکانی خۆیان. بە بۆچوونی هێگل ئازادی لــە دەوڵــەتێکی ســەربەخۆدا وەدیــدێت کــە نوێنــەری بــەهاکان و باوەڕەکــانی ئــەقڵی هاووڵاتیـانی بێـت. بـەم پێیـە فیدراسـیۆنی دەوڵەتـەکانی کـانتیش وەك سـەپاندنێك دێتـە پێشچـاو کـە ئـازادی دەخاتـە مەترسـیەوە. هـەر بـەم شـێوەیەش هێـرش دەکاتـە سـەر ئـەم گریمانەیـەی کانـت کـە تەنانـەت ئەگـەر ئاشـتی سەقامگرتوو شتێکی گونجاو و باش بێت ئەو هـەر پێـی باشـترە کـە روانگـە یەکـەکانی هـەموو نەتەوەیــەك لــە پرۆســەی دووبـارە ژیانــەوەی ئاکاریدا بکەونە رکەبەرییەوە. سەرئەنجام هێگل بـەم باوەڕە دەگات کـە ئەم روانگە تایبەتانـە لە پەیوەنـدی لەگـەڵ یـەکتردا رۆحێکـی جیهـانی پێکـدێنن و پاشـان ئـەم رۆحـە جیهانیـە بەسـەر تایبـەتبوونی ئەوانـدا زاڵـدەبێت. بـەم چەشـنە، هێگــل هــەوڵ دەدات لــە دژوازی کــانتی لــە ســـــەپاندنی ئەقڵانیـــــەتی رۆژئـــــاوایی بەسەر جیهاندا دووری بکات، هەرچەند خۆی لە بیری بەجیهانیبوونێك لەسەر بنەمای ئەقڵدایە. ئـەو لـەم کـارەدا بـەڵێنی هیـوای پێناسـەیەکی جیهـانی راسـتەقینە لـە ئـازادی و لـە رێگـای ئیرادەی جیهانیـەوە دەدات. بەڵێنێك کە لەپاش تێپـەڕینی 200 سـاڵ هێشـتا بـێ شـێوێن و پرکێشەیە.

**سەرچاوە:**

فارسی وتاربێژیەك لە دانیشگای فەلسەفەی زانکۆی تورینتۆ، اسفند 1379.

# ئیسلام لە فەرەنسا

**هاشم سالّح**

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

(ئیسلام لە فەرەنسا)*، رەنگە گرنگترین کتێبێك بێت تا ئێستا لە فەرەنسادا دەرچووبێت‌و باسی ئیسلام و موسڵمانان بکات لەو وڵاتەدا. "ئیڤ شارل زرکا"ی فەیلەسوف سەرپەرشتی کتێبەکەی کردووە. "زرکا" بەڕێوەبەری بەشە لە سەنتەری نەتەوەیی فەرەنسا بۆ توێژینەوەی زانستی، هەروەها مامۆستای فەلسەفەی سیاسی نوێ و هاوچەرخیشە لە زانکۆی سۆربۆن-پاریسی یەکەم. لەم ماوەی دوایشدا کتێبێکی بە ناونیشانی (تۆلیرانسی سەخت-2004) لە پاریس بەچاپ گەیاند. ئەم کتێبەی ئێستا لەبەردەستی ئێمەدایەو دەمانەوێت قسەو باسی لەبارەوە بکەین (ئیسلام لە فەرەنسا)، لە حەوت سەد لاپەڕەی قەوارە گەورە زیاترەو دەیان توێژەری فەرەنسی و عەرەبی و ئیسلامی تێیدا بەشداربوون. لەوانە: (روشدی عەلیلی، محەمەد ئەرکۆن، فەتحی بن سەلامە، ئەلیزابیس بادینتەر، عەبدە فیلالی ئەنساری، مەکسیم رۆنسۆن- کە بەم دواییانە کۆچی دوایی کرد-، ئۆلیڤێی روا، جیلّ کیبلّ، مالك شبل، دۆمێنیك ئۆرڤوا، ماکس گالۆ، جاکلین شابی، ئەلفرێد لویس دۆبریمار، بێرنار ستازی، برۆنۆ ئیتیان، کریستیان جامبێ و ..... چەند کەسێکی دیکە).

بە کورتیەکەی هەموو ئەوانەی لە دوورو نزیکەوە پەیوەندیان بە هەلومەرجی وڵاتانی ئیسلامی و باس و خواسی ئیسلامیەوە هەیە، لەم کتێبەدا بەشدار بوون. زۆربەی زۆریشی یان بەشێوەی گفتوگۆیە یاخود بە نوسینی وتاری ئاساییە. ئەو پرسیارەی ئەم کتێبە لە سەرەتاوە دەیکات ئەوەیە: ژمارەی موسڵمانان لە فەرەنسادا چەندە؟). وەکی ئاشکرایە ئەم پرسیارە لەم ماوانەی دوایدا بۆتە کێشەیەکی

سیاسی و هەندێك ژمارەكە زۆر گەورە دەكەن و هەندێكی دیكەش كەمی دەكەنەوە. هەروەها ئەمانەش پەیوەندی بە هۆكاری سیاسی و هەڵبژاردنەوە هەیە. هەندێك دەڵێن ژمارەی موسڵمانان لەو وڵاتەدا دەگاتە پێنج تا شەش ملیۆن كەس، بەڵام هەندێكی تر پێیان وایە ژمارەكە زۆر لەوە كەمترە.

كەواتە دەبێت ژمارەی راستەقینەیان چەند بێت؟ بەپێی دوایین ئامار كە لە ساڵی 1999 دا كرا، دەریدەخات ژمارەی حەقیقی موسڵمانان لە فەرەنسادا (سێ ملیۆن و شەش سەدو پەنجا هەزار) كەسە. بەڵام ئەم ژمارەیە ئەو فەرەنسیانە ناگرێتەوە كە بوون بە ئیسلام و موسڵمان بونی خۆیان ئاشكرا كردووە. هەروەها ئەو كەسانەش ناگرێتەوە كە سەر بە كەمینە بچوكەكانن. بەم پێیە رەنگە ژمارەی گشتیان بگاتە چوار ملیۆن كەس و بەم شێوەیەی لای خوارەوە دابەش بوون:

-جەزائیرییەكان، ملیۆنێك و چوار هەزار كەسن.

-تونسیەكان، چوار سەدو حەڤدە هەزار كەسن.

-وڵاتانی ئەفریقایی، سێ سەدو سی و نۆ هەزار كەسن.

-توركەكان، سێ سەدو سیانزە هەزار كەسن.

"جیل كیبل" كە لە كتێبەكەدا چاوپێكەوتنێكی لەگەڵدا كراوە دەڵێت: (هەنوكە لە فەرەنسادا 5٪ بۆ 8٪ ی دانیشتوانەكەی خەڵكانی بە رەگەز ئیسلامین. بەڵام دابەشكردنی خەڵك لەسەر بنەمای مەزهەبی، شتێكە لە فەرەنسادا قەدەغەیە، لەبەرئەوەی عەلمانییەت ئایین وەك مەسەلەیەكی شەخسی سەیردەكات و دەوڵەت بۆی نییە دەخالەتی تیا بكات. هاوڵاتی لە فەرەنسا هاوڵاتییە، ئیتر سەر بە هەر ئایین و مەزهەبێك بێت. لە فەرەنسا لەبەرئەوەی دەوڵەتێكی عەلمانییە، هاوڵاتیبوون و ئینتمای ئایینی تەواو لێكدی جیا كراونەتەوە و ئەمەش بە پێچەوانەی جیهانی عەرەبی و ئیسلامییەوەیە كە تا ئێستاش چەمكی هاوڵاتیبوون، بە مانا مۆدێرنەكەی تیایاندا نەرسكاوەو دروست نەبووە).

هەر لەو دیمانەیەدا "كیبڵ" ئەو هەڵوێستەی وەزیری ناوخۆی پێشوی فەرەنسا "نیكۆلا ساركوزی"، بەلاوە سەیرە كە رازیبووە ئامادەی ئەو كۆنفرانسە بێت كە فیدراسیۆنە ئیسلامییەكانی فەرەنسا سازیان دابوو. لەمبارەیە پرسیارێك دەكات و دەڵێت: (چی رووی دەدا گەر وەزیری ناوخۆ ئامادەی كۆنفراسێكی سیاسی بەرەی نیشتمانی بوایە كە جان ماری لۆپنی رابەری راستڕەوە توندڕەوەكانی فەرەنسا سەركردایەتی دەكات؟). سەرەڕای ئەوەش "ساركوزی" موسڵمانە عەلمانی و لیبرالییەكانی توشی شۆككرد، كاتێك فێندەمێنتالیستەكانی بەرئەوان خست و ئەوانی بە شایستەتر زانی. موسڵمانە لیبرالەكانی فەرەنسا كە ئەو هەڵوێستەیان بینی، لەبەر خۆیانەوە دەیانوت: (گەر ئێمەش ریشمان لێبەردایەتەوەو حیجابمان بپۆشیایە، ئەوا دەوڵەت بایەخی زیاتری پێدەداین!). ئەم قسانەی "جیل كیبل" پێمان دەڵێت: (پێویستە دەوڵەتی فەرەنسی بایەخ بەو موسڵمانە لیبراڵانە بدات كە لەگەڵ عەلمانییەت و مۆدێرنەو سەردەمەكەدا كۆكن، لەبەرئەوەی

ژمارەیـان زۆر لـەوە زیـاترە کـە جـەنابی وەزیـر مەزەندەی دەکات).

لەلایــەکی تــرەوە خۆرهەڵاتناســی مــەزن "مەکسـیم رۆنسـۆن" لـە وتارێکیـدا بـە نـاوی: (تـاعونی مەزهەبییـەوە)، فەرەنسـا لـەو پەتایـە وریـا دەکاتـەوە کـە خەریکـە لەسـەر خاکەکـەی بڵاودەبێتـــەوەو بڵاوبوونـــەوەو تەشـــەنە سەندنیشـی بـە بۆچـونی ئـەو، دەبێتـە مایـەی ئـەوەی لـە داهـاتودا یەکیـەتی نیشـتمانی ئـەو وڵاتـە بخاتـە مەترسـییەوە. سسـتمی عـەلمانی فەرەنسـی لەسـەر بنـەمای ئـاییني و رەگـەزی مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکدا ناکات، بـەڵکو بـەو پێیـە لەگەڵیاندا دەجولێتـەوە کـە هـاوڵاتین و لەبـەردەم یاســادا چــون یــەکن و پێویســتە هــەر بــەو شێوەیەش بمێننەوە. تۆ لە فەرەنسادا بەرلەوەی مەسیحی یـان موسـڵمان یـاخود یـەهودی بیـت، فەرەنســایت و ئینتمــای نەتــەوەیی (یــاخود ئینتمای رەگەزنامـە) بەسـەر ئینتمـای ئـاییني و مەزهەبیــــدا زاڵ دەبێـــت، چـــونکە ئەمانـــە مەســەلەیەکی شەخســی و تایبــەتین. بــەمجۆرە پێکهاتـەی یەکیـەتی نیشـتمانی لـە فەرەنسـادا دوای شۆڕشــی $1798$ دروســت بــوو، بەمــەش فەرەنسـا بەسـەر دابەشـبوونی مەزهـەبی نێـوان کاتۆلیك و پرۆتستانتەکاندا زاڵ بوو.

پاشــان "رۆدنســۆن" هــەر لــە درێــژەی قسـەکانیدا دەڵێت: (من بۆ خۆم ماوەیـەکی زۆر لـە لوبنانـدا ژیـاوم و دەزانم پـەتای مەزهـەبی چییەو چۆن چۆنی دەبێت بە خۆرەو کۆمەڵگە وێراندەکات و دەبێتـە مایـەی شـەڕی نـاوخۆیی. لـە لوبنانـدا بتـەوێت و نەتـەوێت مەسـیحیت، لەبەرئەوەی لە بنەماڵەیـەکی مەسیحیدا هاتویتە دنیـــاوە. موسڵمانیشـــیت، لەبەرئـــەوەی خانەوادەکـەت خانەوادەیـەکی ئیسـلامیە. ئـیتر هـەرگیز بـۆت نییـە لـەم چوارچـێوە مەزهەبییـە بێیتەدەر، تەنانەت ئەگەر ویستی شتێکی واشت هــەبێت. لــەو وڵاتــەدا تــۆ تەنانــەت ئەگــەر کۆمۆنیست و لیبرالی و عـەلمانیش بیـت، خـەڵك هەر لەسەر بنەمای ئەوەی تۆ سونی یان مارۆنی یــان شــیعە یــان درزیــت، ســەیرت دەکــەن و مامەڵــەت لەتەکـدا دەکـەن. واتـە لـە لوبنانـدا مەسەلەی ئینتمای مەزهەبی، لە هاتنە دنیاتەوە تا مردنت بەدواتەوەیەو لێت نابێتەوە).

"مەکسیم رۆدنسۆن" بۆئەوەی ئەم کێشەیە بۆ فەرەنسیاییەکان رونتر بکاتـەوە، لەبەرئـەوەی هەنوکە ئەوان بە کێشەیەکی وا نامۆن و سەیرە بەلایانـەوە، ئـەوا دەڵێـت: (مەزنـدەی شـتێکی وا بکەن گەر جۆرج مارشێ لوبنانی بوایە، یاخود ئـەو سسـتمە مەزهەبیـەی لوبنـان لـە فەرەنسـادا بوایـە. دەزانـن چـی دەقـەوما؟ خـەڵك ئـەو کـات دەیـانزانی مارشـێ نوێنـەری زۆرینـەی کاتۆلیك مەزهەبەکانـە، ئەگەرچـی ئـەو رابـەری پـارتی کۆمۆنیستەو دوورو نزیك پەیوەندی بە ئاینزای کاتۆلیکییەوە نییە! واتە مارشێ لەبەرئەوەی لە بنەماڵـەیـەکی کـاتۆلیکی فەرەنسـی بـووە، ئـەوا ئینتیمـای مەزهەبیهـەر لێنـەدەبووەوە تـا مـردن، ئەگەرچـی مولحـدیش بێـت. ئەمـەش وا دەکـات ئینتیمـــا مەزهەبیەکـــەی بەســـەر ئینتیمـــا کۆمۆنیستیەکەیدا زاڵبێت).

هــەروەها ئەگــەر بــە پێــی پێودانگــەکانی کۆمەڵگـەی لوبنـانی یـاخود هـەر کۆمەڵگەیـەکی دیکە بێت کە لەسەر بنەمای مەزهەبی دروست بووبێت، ئەوا "فرانسوا میتران" هەر لە "میشال

ڕۆکار"ی دەبردەوە، لەبەرئەوەی ڕۆکار سەر بە کەمینەی پرۆتستانت مەزهەبەکانە. ئایا ئێمە ئەم پێودانگانەمان بۆ فەرەنسا دەوێت؟ ئایا ئەمە هاوڵاتیبونی ڕاست و دروستە؟ یان ئایا فەرەنسا بە درێژایی چەند سەدەیەك خەباتیکرد لە پێناو ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو سستەمە مەزهەبیە کۆنەی، بەر لە بەرپابوونی شۆڕش لە ئارەدا بوو؟. پاشان "ڕۆدنسۆن" دەپرسێت: هەموو ئەمانە چی دەگەیەنێت؟ ئەوە دەگەیەنێت کە هاوڵاتی لوبنانی، بەر لەوەی لوبنانی بێت مارۆنی یان شیعی یان سونی یاخود درزییە. بەمجۆرەش ئینتمای مەزهەبی بەسەر ئینتمای نەتەوەیی و ئینتمای ڕەگەنامەدا زاڵ دەبێت. بۆ نمونە دەوڵەتی لوبنانی لەو وڵاتەدا ناتوانێت ئەندازیارێکی مارۆنی دابمەزرێنێت، گەر یەکسەر بە دوای ئەودا ئەندازیارێکی سونە مەزهەبیش دانەمەزرێنێت. تەنانەت ئەگەر ئەو ئەندازیارەش، خاوەنی هیچ توانا و لێهاتویەکیش نەبێت! ئەمەش بۆ ئەوە دەکەن تا هاوسەنگ مەزهەبی لە وڵاتدا ڕابگرن، لەبەرئەوەی دەوڵەتی لوبنانی لەسەر ئەو بنەمایە دروست بووە. ئاخۆ ئێمە ئەمەمان بۆ فەرەنسا دەوێت؟ گەروابێت و ئەمە ڕوبدات، ئەوا مانای کۆتایهاتنی پێشکەوتن و شارستانیەتی فەرەنسا دەبێت). "ڕۆدنسۆن" لەسەر قسەکانی بەردەوامە و دەڵێت: (لە لوبنان ئەندامانی پەرلەمان و وەزیرەکانیش، هەر لەسەر بنەمای مەزهەبی دیاریدەکرێن و هەر ئاینزایە و بەشی تایبەتی خۆی هەیە. من کاتێك لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا، لەو وڵاتە بووم مەزهەبگەرایی خەفەبوو، واتە پێکەو ژیان و هەڵکردن لەگەڵ یەکدا مومکین بوو. بەڵام چەند ساڵێك دوای ئەوە ئاگری مەزهەبگەرایی تەنیەوەو تەرو وشکی پێکەوە سوتاندو بووە مایەی وێرانبوونی لوبنان. کەواتە وریابە فەرەنسا!).

بەڵام توێژەری ناسراوی بواری ئیسلامی سیاسی یاخود فێندەمێنتالیزم، "ئولیڤێ ڕوا" دەپرسێت و دەڵێت: (ئایا ئیسلام لە ئایینیەکانی دیکە جیاوازترە؟ ئایا لە ناو ئەو ئایینانەی کە لە فەرەنسادا هەن، هەر بە تەنها ئیسلام کێشە دەنێتەوە؟). لە وەڵامدا دەڵێت: بێگومان نا. پێویستە بزانین کە سستەمی عەلمانی لە بنەڕەتدا دژی ئایینی مەسیحی دروست بوو، دوای ئەوەی جەنگێکی بێئامانی لە دژی ئاینزای کاتۆلیکی بەرپا کرد کە ئاینزای زۆرینەی فەرەنسییەکانە، بەڵام فەرەنساییەکان یادەوەرییان کزەو بە هۆی باڵادەستی سستەمی عەلمانی بەسەریانەوە بە درێژایی سەدەیەك، هەموو ئەو شتانەیان بیرچۆتەوە. بەڵام لە نەوەکانی پێشو بپرسن لە ڕابردودا چی ڕویداوە و مەسەلەی چەسپاندنی عەلمانییەتیش چەند دژوار بووە؟ لەو نەوەیە بپرسن عەلمانییەت چ پەرچەکردارێکی لەلای پیاوانی ئایینی و فێندەمێنتالستە مەسیحیەکان دروستکرد، بە تایبەتیش کاتۆلیك مەزهەبەکان! ئەوانە لە سەرەتادا عەلمانییەتیان بە هەموو شێوەیەك ڕەتکردەوەو پێیان وابوو، هاتنی عەلمانییەت بە مانای کۆتایهاتنی ئایینە. کە ئەمانەتان کرد، ئەوسا لە پەرچەکرداری تورەی فێندەمێنتالیزمە ئیسلامییەکان لە ئێستادا تێدەگەن. کەواتە

هــەموو ئاینێــك بــە بــێ هــەلاّودێرد، بەرامبــەر عەلمانییــەت و دیموکراسـی و ئـازادی بـیروڕاو مافەکانی مرۆڤ دو دڵ و نیگەرانە و ئەمەش هـەر بە تەنها ئاییني ئیسلام ناگرێتەوە. لـە کاردینـاڵ "ڕاتـزنجیر" بپرسـین کـە بەرپرسـی کاروبـاری ئاییني لـە ڤاتیکـان[**] ، ئـەوا لـە وەلاّمـدا پێتـان دەڵێـت: (حەقیقـەت یـەك حەقیقەتـە و ئـەویش تـەنها لـە ئـاییني مەسـیحیدا هەیـە). گـەر ئـەو پرسـیارە لـە شـێخی ئەزهــەریش بکـەن، ئـەوا هـەمان وەلاّمتـان دەداتــەوە، بـەلاّم ئیسـلام لـە جێگــەی مەسـیحیەت دادەنێـت. لـە گـەورە حاخامەکانی جولەکەش بپرسن، هـەمان شتان پێدەڵێن. کەواتە فێندەمێنتالیزمی ئاییني، هـەر هەمووی یەکێکە و جیاوازی لە نێوانیاندا نییە.

هـەموو فێندەمێنتالسـتێکی ئیمانـدار پێـت دەڵێــت: (یاســای ئیلاهــی لەســەرو یاســای مرۆڤەوەیـە). هـەر لەبـەر ئـەوە فێندەمێنتالستی ئیســلامی یاســاکانی جمهــوری فەرەنســی ڕەتدەکاتـەوە و پابەنـدی شـەریعەتی ئیسـلامی دەبێت. کاتۆلیك مەزهەبێکیش بەر لە سەد ساڵ لە ئێستا، واتە بەر لەوەی عەقلی گەشە بکات و عەلمانیـەت پەسـەند بکـات، واتـە ڕازی بێـت بـە جیاکردنەوەی کایەی سیاسی لە کایەی ئاییني، هـــەر هـــەمان شـــتی دەکـــرد. کەواتـــە پێویسـتە جیـاوازی بکـەین لـە نێـوان یاسـای دەوڵـەتێکی عـەلماني لەگـەڵ یاسـای ئاسمانیـدا، ئـەویش لەبـەر بـوني چـەندان مەزهـەب و ئـاییني جیاجیا. ئەمە لە کاتێکدا یاساکاني جمهوریەتی فەرەنسـا یەکشـتە و وەکیـەکیش بەسـەر هـەموو کەسێکدا جێبەجێ دەبێت کە لەسەر خاکی ئەو وڵاتەدا بژی.

وەکی "ڕوا" دەڵێت: (ئێمە ناتوانین یاسایەك بـۆ جولەکـە و یاسـایەکی دی بـۆ مەسـیحی و یـەکێکی تـر بـۆ موسـڵمانان و ئـەوی دیکـە بـۆ بودیەك دابنێین. ئێمە کار بە یاسایەك دەکەین کـە بـۆ هـەموان بێـت). ئـەو فێندەمێنتالسـتە ئیسلامیانەی لـە فەرنسا نیشتەجێن، لەوانـەش "تـاریق ڕەمــەزان" خـەریکن لـەوە تێدەگـەن. "تــاریق ڕەمــەزان" لای خۆیــەوە داوای لـــە موسڵمانانی ئـەو وڵاتـە کـرد، ڕێـز لـە یاساکانی دەوڵــەتی فەرەنســی بگــرن و دەســتبەرداری کارکردن بە شـەریعەتی ئیسلامی بن. "ئولیڤێ ڕوا" هــەر لــە درێــژەی قســەکانیدا دەڵێــت: (ســەروەختێك نیکــۆلا ســارکوزی گرنگــی بــە فیدراسـیۆنە ئسـوڵیەکانی نـاو فەرەنسـادا، بـە تایبـەتی فیدراسـیۆنی نەتـەوەیی موسـڵمانانی فەرەنسا *FNMF*، لەگەڵ فیدراسیۆنی ڕێکخراوە ئیســلامیەکان لــە فەرەنســا *Uolf*، ڕوبــەڕوی ڕەخنەیەکی زۆر بووەوە.. ئەم دوو ڕێکخراوە لە ئیخـوان موسـلمینەوە نـزیکن و نوێنەرایـەتی توێــژێکی بــەرفراوانی موسـلمانانی فەرەنسـا دەکـەن و دوو ڕێکخـراوی زۆر سیاسین. لێرەوە ناکرێـــت دەوڵـــەت گرنگیـــان پێنـــەدات و فەرامۆشـیان بکـات. سـەرەڕای ئـەوەی ئـەم بڕیارەی سارکوزیش باگراوندی سیاسی خـۆی هەیـە. سـارکوزی سـەروەختێك بڕیاریـدا ئـەو ڕێکخراوانە بەشداری ئەو گفتوگۆیانە بکەن کە لەمــەڕ ڕێکخســتنی کاروبارەکــانی ڕەوەنــدی ئیسـلامی لـە فەرەنسـا لـە ئـارەدا بـوو، ئـەوا دەیویسـت بـە تیرێـك دوو نیشـانە بپێکێـت، یەکــەمیان کەســە تونــدڕەوەکانی نــاو ئــەو ڕێکخراوانـە کـۆنترۆڵ بکـات و دووەمیشیان ئەو

ڕێکخراوانە بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی و جیهانی ئیسلامیدا بەکاربهێنێت. کەواتە سارکوزی دەزانێت چی دەکات و بەو ئەندازەیە گەمژە و هەڵەشە نییە وەکی هەندێك پێیان وابوو. سەرەنجامیش ئەوە کە ئاراستەی ئەو ڕێکخراوانە دەکات، نەك ئەوان جڵەوی ئەویان کردبێت. سەرەڕای ئەوەش ئەمە تاکە ڕێگایەکە بۆ گۆڕینی عەقڵیەتی فێندەمێنتالستەکان و بۆ ئەوەی وایان لێبێت لە مۆدێرنە تێبگەن و بەشێوەیەکی شێلگیرانەتر مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. هەر کاتێك ئەم ڕێکخراوانە بخەیتە پلە و پایەی بەرپرسیارێتی، ئەوا نارەزاییان لە دژی حکومەتی فەرەنسی کەمتر دەبێتەوە و میانڕەو تر دەبن و زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەن). بەمجۆرە "ئولیڤیێ ڕوا" داکۆکی لە هەڵوێستی "نیکۆلا سارکوزی" دەکات، بە پێچەوانەی "جیلێ کیبل"ە وە کە ڕەخنەی لێدەگرێت.

ئێستا دێینە سەر وتارێکی زۆر گرنگی ناو ئەم کتێبە کە ڕۆژنامە نوسی سوێسرایی "سیلڤان بیسۆن" نوسیویەتی. "بیسۆن" لە ڕۆژنامەی (لوتان) کار دەکات لە شاری جنێف. وتارەکەی بەم ناونیشانەیە: (بنەماڵەی ڕەمەزان و پێگەیان لە سستمی فێندەمێنتالیزمی نێو دەوڵەتیدا). ئەڵبەتە مەبەستی نوسەریش بنەماڵەی "تاریق ڕەمەزان"ە. سەرەتا "بیسۆن" دەڵێت: (سەعید ڕەمەزانی باوکی تاریق، ساڵی 1961 سەنتەرێکی ئیسلامی لە شاری جنێڤ دامەزراند. ئەمەش دەبێتە یەکەمین سەنتەری ئیسلامی لە ئەوروپادا. سەعید ڕەمەزان لە ناوەڕاستی پەنجاکانی سەدەی ڕابردودا و دوای دەرچونی لە زیندانی عەبدولناسر، ڕودەکاتە وەڵاتی عەرەبستانی سعودیە. لەوێ کۆمەکێکی گەورە دەکرێت و دوای ئەوە بەرەو سویسرا دەچێت و لەوێ ئەو سەنتەرە دەکاتەوە، لە پێناو بەگژاچونەوەی ئەو فەلسەفە ماتریالیزمە بێباوەڕیەی، خۆرئاوای تەنیوەتەوە – ئەڵبەتە ئەمە بە بۆچونی ئەو–. ئەمەش مانای وایە سەعید ڕەمەزان هەر لە سەرەتاوە چۆتە شەڕێکی سەرتاسەریەوە، نەك هەر بە تەنها لەگەڵ کۆمۆنیزمدا، بەڵکو لەگەڵ لیبرالیزمیشدا. نەك هەر لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتدا، بەڵکو هاوکات لەگەڵ خۆرئاوای دیموکراسی و عەلمانیشدا. لە دووەمین ساڵی دامەزراندنی ئەو سەنتەرەدا سەعید ڕەمەزان، بڕگە سەرەکیەکانی ئەو پرۆژەیە دیاریدەکات کە دواتر ڕابیتەی جیهانی ئیسلامی لێدەکەوێتەوە و ئەم ڕابیتەیەش عەرەبستانی سعودیە کۆمەکی دەکات و هەر خۆشی ڕێبەرایەتی دەکات. بەڵام لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا، کێشە لە نێوان سەعید ڕەمەزان و عەرەبستانی سعودیەدا دروست دەبێت، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی ئەو وڵاتە هەموو کۆمەکە داراییەکانی بۆ ئەو سەنتەرە لە ژنێڤ رابگرێت). هەندێك پێیان وایە ئەم کێشانە نەبووە مایەی پچڕانی پەیوەندی یەکجارەکی لە نێوانیاندا. بۆ نمونە پارساڵ "تاریق ڕەمەزان" لە باڵیۆزخانەی سعودیە لە شاری پاریس بینراوە، هەروەها "تاریق" پەیوەندی لەگەڵ "نادیە کرموس"دا هەیە کە نوێنەری ڕابیتەی جیهانی ئیسلامیە لە سویسرا.

بەڵام ئاخۆ ئەم "سەعید ڕەمەزان"ە کێیە؟

"سەعید ڕەمەزان" زاوای "حەسەن بەننا"ی دامەزرێنەری گروپی ئیخوان موسلمینە لە میسرو یەکێکە لە دوژمنە سەر سەختەکانی "جەمال عەبدولناسر". لە تەمەنی چواردەساڵیدا پەیوەندی بە ریزەکانی ئیخوان موسلمینەوە کردووە و پاشان بۆتە سکرتێری "حەسەن بەننا" و ئەویش "وەفا"ی کچی خۆی داوەتێ. لە ڕاستیدا سەنتەری جنێڤ بۆتە شوێنکاری بنەماڵەی "ڕەمەزان". لەلایەك "هانی ڕەمەزان" سەرۆکی سەنتەرەکەیە و سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن "ئەیمەن ڕەمەزان"ە و ئەندامەکانیشی بریتین لە هەریەك لە: (وەفا ڕەمەزان و ئەروا ڕەمەزان، لەگەڵ تاریق و بیلال و یاسر ڕەمەزان. لە ئێستاشدا تاریق ڕەمەزان لە هەموویان بەناوبانگترە و میدیاکانی خۆرئاوای بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە).

"تاریق ڕەمەزان" و براکانی مەشروعیەتی ئایدۆلۆژیان لە سێ سەرچاوەوە وەردەگرن: "سەعید ڕەمەزان"ی باوکیان کە بە درێژایی ژیانی خۆی دژایەتی "عەبدولناسر"ی کرد، لەگەڵ رابیتەی جیهانی ئیسلامی کە مەڵبەندەکەی لە شاری (جدەی) عەرەبستانی سعودیەیە، هەروەها شێخ "یوسف قەرزاوی" کە لە رێی بەرنامە بەناوبانگەکەی (شەریعە و ژیان) لە کەناڵی جەزیرەوە، کاریگەریەکی گەورەی لەسەر جەماوەری عەرەبی ئیسلامی هەیە.

لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا، "تاریق ڕەمەزان" رابیتەی موسڵمانانی سویسرای کردەوە کە داوا دەکات قوتابخانەی ئیسلامی تایبەت لەو وڵاتەدا بکرێتەوەو تیایدا بە شێوازی ئیخوان موسلمین پەیامی ئیسلامی بە خوێندکاران بوترێتەوە. لە بەیاننامەی دامەزراندنی ئەو رابیتەیەدا "تاریق ڕەمەزان" دەڵێت: (ئامانجی رابیتەکەمان نیشاندان و ناساندنی رۆڵی شارستانێتی ئاینی ئیسلامە و بۆ ئەم مەبەستەش داوا لە دەسەڵاتدارانی سویسرا دەکات بەشێوەیەکی رەسمی لە دوای مەسیحیەتەوە، ئیسلام وەك دووەم ئایین لەو وڵاتەدا بناسێنن). بەڵام کێشەکە وەکو "سیلڤیان بیسۆن"ی رۆژنامەنوس دەڵێت، لەوەدایە کە سویسرا وڵاتێکی عەلمانییە و ئیعتراف بە هیچ ئاینێکی رەسمی دەوڵەت ناکات، ئەگەر چی سەدان ساڵە لەو وڵاتەدا مەسیحیەت باڵادەستە.

دوای هێرش و پەلامارەکانی 11 سێپتەمبەر، "تاریق ڕەمەزان" داوای کرد لە ساڵی داهاتوودا، واتە لە ئەیلولی 2002دا کۆنگرەیەکی گشتی ساز بکرێت بۆ تاوتوێکردنی ئەو رووداوە گەورە و بۆ ئەوەی موسڵمانە فێندەمێنتالستەکان بزانن چۆن چۆنی ڕووبەڕووی قۆناغی داهاتوو دەبنەوە کە بێگومان قۆناغێکی سەخت و دژوارە. ئەو کۆبوونەوەیە گەیشتە ئەم شتانەی لای خوارەوە:

یەکەم/ پێویستە موسڵمانان پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەو لایەن و ناوەندانەدا تۆکمە بکەن لە خۆرئاوا کە نەیاری ئیسرائیلن، ئەویش بۆ ئەوەی کەلێنێك بخەنە پەیوەندیەکانی نێوان ئەوروپا و ئیسرائیل.

دووەم/ پشتیوانیکردنی خەباتی چەکداری فەلەستینیەکان، تەنانەت کارە خۆکوژیەکان و تەقاندنەوەی سەیارە بۆمب ڕێژکراوەکانیش.

سێیەم/ دروستکردنی کەلێن لە پەیوەندی نێوان ئەوروپا و ئەمریکا، لە پێناو دوور خستنەوەی ئەوروپا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

"سیلڤیان بیسۆن" پێیوایە شێخ "یوسف قەرزاوی" بۆتە مامۆستای هەموان، لەوانەش "تاریق رەمەزان" و "هانی رەمەزان" و هەموو ئەونەوە لاوە ئسولیەی دەیانەوێت خۆیان لە بەرگی ریفۆرمیستدا نیشان بدەن! وەکو ئاشکرایە "یوسف قەرزاوی" بە ئاشکرا ئیدانەی هێرش و پەلامارەکانی 11 سێپتەمبەری کرد، بەڵام ئەو کردەوە تیرۆرستیانە بەرەوا دەزانێت کە لە ئیسرائیلدا ئەنجامدەدرێت و هاوڵاتی ئاسایی بەردەکەوێت. "قەرزاوی" وەکی "تاریق رەمەزان" و براکانی مەشروعیەتی ئایینی خۆی لە "حەسەن بەننا"وە وەردەگرێت. هەریەك لە " یوسف قەرزاوی" و "تاریق رەمەزان" پێکەوە بەشداری کۆڕو کۆنفرانسەکان دەکەن و هەردووکیشیان سەر بە باڵی ریفۆرمخوازانن، وەکی هەندێ پێیان وایە، بەڵام هەندێکی دی وای بۆدەچن کە ئەم ریفۆرمخوازیە تەنها روپۆشێکەو پەردەپۆشی نیەتی راستەقینەی خۆیان و خەسڵەتی رادیکالیی بیرکردنەوەیانی پێدەکەن. چونکە دواجار هەردووکیان دوو کەسی فێندەمێنتالستن و دژی هەر تازەکردنەوەیەکی راست و دروستی فیکری ئیسلامیین، وەکی ئەوەی لە فیکری مەسیحی ئەوروپیدا رویدا. ئەوانەی لە وڵاتی ئیسپانیادا لێکۆڵینەوە لەگەڵ گومانلێکراوەکانی سەر بە تۆڕی قاعیدە دەکەن، پێیان وایە شێخ "یوسف قەرزاوی" پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ یەکێك لە ئەندامە گرنگەکانی رێکخراوی قاعیدەدا هەبووە، بە ناوی "ئەحمەد ئیبراهیم"ەوە کە دەسەڵاتدارانی ئیسپانیا لە بەهاری ساڵی 2002دا دەستگیریانکرد.

تا دەوروبەری ساڵی 2002 "قەرزاوی" پشکی دارایی لە بانکی (تەقوا)دا هەبووە، ئەم بانکەش لەلایەن حکومەتی ئەمریکییەوە خراوەتە لیستی رەشەوە، بە گومانی ئەوەی یارمەتی دارایی پێشکەش بە ریکخراوە تیرۆریستیەکان دەکات. دوان لە بەرێوەبەرانی ئەم بانکە لە وڵاتی سویسرا نیشتەجێن و دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتەش تاوانباریان کردن بەوەی باربوی رێکخراوەگەلێکی تیرۆریستی دەکەن. یەکێکیان ناوی "یوسف نەدا"یەو دانی بەوەدا ناوە کە بۆ ساڵانێکی زۆر رۆڵی وەزیری دەرەوەی گروپی ئیخوان موسلمین گێڕاوە لە ئەوروپاو جیهاندا. هەرچۆنێك بێت، بەڵام خەڵك بیروبۆچونی جیاجیایان لەسەر "تاریق رەمەزان" هەیە. هەندێك دەڵێن: (ریفۆرمیستێکی میانڕەوە)و هەندێکی دیش پێیان وایە: (لەژێر پەردەی ئەو میانڕەوی و چاکسازیەدا، رادیکالێکی توندڕەو خۆی مەڵاس داوە). ئەو هەنوکە لە خۆرئاوا دەژی و ناتوانێت لەوە زیاتر پرکێشی بکات. لەبەرئەوە تۆمەتی دووفاقێتی تا ئێستاش بەدواوەیەتی.

لێرە بەدواوە دێینە سەر ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ پرۆفیسۆر "ئەلفرێد لویس دۆبریمار"دا کراوە. ئەم توێژەرە ئەکادیمیە دەڵێت: (لەسەرەتای سەدەی نۆزدەو سەرکەوتنی مۆدێرنەی زانستی و فەلسەفیەوە، هەڵوێستێکی نوێ لە تێکستە ئایینیەکان هاتە ئارا بە بەراورد

بە سەردەمانی پێشوو. واتە زانایانی بواری زمان و مێژوو، وەکی تێکستێکی ئەدەبی یاخود وەك دیکۆمێنتێکی مێژوویی کەوتنە تاوتوێکردنیان. زانای ئەو بوارانە پێیان وایە ئەو تێکستە ئایینیانە، وەك هەر تێکستێکی گریکی یان رۆمانی لە پیت و وشەو برگەو رستە پێکهاتووەو جیاوازی لەگەڵ ئەواندا نییە. بەمجۆرە زاناکانی ئەوروپا کەوتنە لێکۆڵینەوەی تەورات و ئینجیل و میتۆدەکانی مێژووناس و زمانناسی مۆدێرنیان بەسەردا پراکتیزە دەکردن. لەم هەوڵەشیاندا بە گەلێك دەرەنجامی سەیر گەیشتن، بەڵام جیاواز بوو لەگەڵ بۆچوون و بیروباوەڕی ئیمانداران، کارێك کە بووە مایەی دروستبوونی پەرچەکرداری توند لە ناوەندە یەهودی و مەسیحیە ئسوڵیەکاندا. پاشان هەمان میتۆدیان بەسەر قورئان و تێکستە ئیسلامیەکاندا پراکتیزە کردو، بەهەمان ئەو دەرەنجامە گرنگ و سەرسوڕهێنەرانە گەیشتن. بەڵام لە جیهانی ئیسلامیشدا رووبەروی پەرچەکرداری توندبوونەوە، لەلایەن موسڵمانە تەقلیدیەکانەوە کە خۆرهەڵاتناسانیان بە هەوڵی تێکدان و شێواندنی ئیسلام و پەلاماری پێغەمبەری ئیسلام و... هتد، تاوانبار کرد).

لە راستیدا خەسڵەتی توێژینەوەی مێژوویی ئەوەیە پەردە لەسەر شتەکان هەڵدەماڵێت و روی راستەقینەیان ئاشکرا دەکات. واتە پێت دەڵێت: (پێش هەزار یان دوو هەزار ساڵ لە ئێستا چی رویداوە. نەك وەك ئەوەی تۆ باوەڕدار پێت خۆشە، بەڵکو وەکو ئەوەی چۆن رویداوە! بەم پێیە توێژینەوەیەکی لەمجۆرە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕە کۆنانەدا بەریەك دەکەوێت کە سەدان ساڵە لە مێشك و دڵی خەڵکدا رەگی داکوتاوەو بۆتە راستییەکی حاشا هەڵنەگر. لەبەرئەوە ئەو میتۆدە ئەقڵانیەی خۆرهەڵاتناسان بەسەر قورئان و مێژووی ئیسلامدا پراکتیزەی دەکەن، دەبێتە مایەی توڕەیی و ناڕەزایی موسڵمانان، بەڵام نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت کە هەمان شتیش لەناو جولەکەو مەسیحیەتدا رویداوە. وێنەی مێژوویی جیاوازە لەو وێنە ئایدیالیەی ئیمانداران لەمەڕ کەلەپوورو ئایینی خۆیان پێشکەشی دەکەن).

مەسیحیەکان لە ئەوروپا کێشەی خۆیان لەگەڵ رەخنەی مێژوویی و زانستی مۆدێرندا یەکلایکردەوەو ئیتر وەکی جاران، ئەو زانایانە تاوانبار ناکەن کە میتۆدو رێبازی نوێ بەسەر ئینجیل و مێژووی سەرەتایی مەسیحیەتدا پراکتیزە دەکات. بەڵام تا ئێستاش موسڵمانان لەسەر هەڵوێستی تەقلیدی رابردوویان بەردەوامن، هەر لەبەر ئەوەشە کە زۆر بە توندی سەرکۆنەی خۆرهەڵاتناسان دەکەن، نەك هەر ئەوەندەش بگرە تەنانەت ئەو توێژەرە موسڵمانانەش تاوانبار دەکەن کە رازی دەبن بەوەی رەخنەی مێژوویی بەسەر ئایین و کەلەپووری ئیسلامدا پراکتیزە بکەن. شایەنی باسە موسڵمانان تا ئێستا خۆیان لەگەڵ رابردودا یەکلایی نەکردۆتەوە، بەڵام بێگومان رۆژێك دێت ئەو کارە دەکەن، دوای ئەوەی هۆشیاری مێژوویی و زانستی لەناویاندا بڵاو دەبێتەوەو بەسەر هۆشیاری میتۆلۆژی و ئسولی کۆندا زاڵ دەبێت.

لەلایەکی ترەوە مێژوونوس و ڕۆماننوسی بەناوبانگی فەرەنسایی (بەرەگەز ئیتالی) "ماکس گالۆ" بە وتارێك بەشداری لەم کتێبەدا دەکات کە بەم ناونیشانەیە: (عەلمانیەت بەسەر هەموو ئاییینەکاندا زاڵ بوو). تیایدا دەڵێت: (عەلمانیەت ڕێگە بە مرۆۋ دەدات باوەڕ بە هەر ئاییینێك بێنێت کە خۆی دەیەوێت یاخود بۆی هەیە هیچ ئاییینێکی نەبێت! هەروەها ڕێی پێدەدات گەرویستی بوو ڕێورەسمی ئاییینی خۆی جێبەجێ بکات، گەر نەشی ویست ئەوا ئازادە. بەڵام ئایین ئەم ئازادیە ناداتە مرۆۋ و ناچاری دەکات تەنها باوەڕ بەو ئایینە بهێنێت کە لەسەری لەدایك بووە و دەبێت پێی خۆش بێت یان نا، ڕێورەسمەکانی بەجێ بهێنێت. لەبەرئەوە دەڵێم: عەلمانییەت لەسەرو ئاییینەکانەوەیە، لەبەرئەوەی ڕێز لە ئازادی و کەرامەتی مرۆۋ دەگرێت). پاشان "ماکس گالۆ" هێرش دەکاتەوە سەر"نیکۆلا سارکوزی"، لەبەرئەوەی بەشداری کۆنگرەی موسڵمانە فێندەمێنتالیستەکانی فەرەنسای کردووە لە (بورجێ)و لەوێدا وتارێکی بەناوبانگی پێشکەشکردووە، لەکاتێکدا لە هۆڵەکەدا ژنانی حیجاب پۆشیان لە پیاوە ڕیشدارەکان جیاکردبوەوە. "گالۆ" دەڵێت: (ئەمە لەگەڵ شان و شەوکەتی وەزیری جمهوری فەرەنسادا ناگونجێت کە باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاو هەیەو ڕێگە بە جیاکردنەوەیان نادات بەم شێوە سەیرو سەمەرەیە).

لەلایەکی ترەوە "ماکس گالۆ" ڕەخنە لە چەپی فەرەنسیش دەگرێت، لەبەرئەوەی بەڕادەیەك پێیان لەسەر پلورالیزم و جیاوازی داگرت کە هەموو مرۆۋێك بۆی هەیە لە فەرەنسادا بە بیانووی مافی جیاوازبوونەوە، چی دەوێت بیکات. بۆ نموونە بە پاساوی ڕای جیاوازەوە، تۆ بۆت هەیە عەلمانییەت ڕەتکەیتەوەو داکۆکی لە حیجاب و فرەژنی بکەیت!! هەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: (هەندێ ڕەفتارو هەڵسوکەوت هەیە نابێت لەو وڵاتانەی ڕێزی مافەکانی مرۆۋ و هاوڵاتیبوون دەگرن، ڕێگەیان پێبدرێت. ئێمە لە ئەوروپا زۆرمان بەدەست فێندەمێنتالیزمی مەسیحیەتەوە چەشت، کەواتە نابێت بهێڵین فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی لە وڵاتەکەماندا تەشەنە بکات. سەروەختێك ئەو دیکۆمێنتە تیۆلۆژییە دەخوێنینەوە کە قەشە سان بێرنار لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نووسیویەتی، هەستدەکەین قسەکانی بن لادن دەخوێنینەوە!. قەشە بێرنار دەڵێت: کوشتنی کافران-واتە ئەوانەی مەسیحی نین-، بەجێهێنانی فەرمانی یەزدانەو کارێکە زۆرتر لە خوامان نزیك دەکاتەوە! بۆچی؟ لەبەرئەوەی کوشتنی کافر بەمانای کوشتنی خراپەکاری و ڕیشەکێشکردنی تاوان دێت لەسەر زەوی.... ئێ خۆ بن لادنیش هەر ئەوە دەڵێت. ئایا دەبێت لە فەرەنسادا ڕێگە ئەم قسانە بدەین؟). پاشان چەندین هۆشیاری دەدات و دەڵێت: (وریا بن لە گەڕانەوە بەرەو دواوە وریا بن دەستبەری عەلمانییەت و مۆدێرنە بن، چونکە ئەوانە شانازی ئەوروپاو فەرەنسان. هەروەها بەئاگا بن و نەکەن سستمی مەزهەبی پەیڕەو بکەن، چونکە نامانەوێت فەرەنسا ببێتە مەڵبەندی کۆمەڵێك ئاینزای ناکۆك بەیەك).

دواجار "ماکس گالۆ" بەم قسانە کۆتایی پێدێنێت و دەڵێت: (ئێمە جمهوریەتی تاکە کەس و هاوڵاتیانی ئازادمان دەوێت، نەك جمهوریەتی مەزهەب و ئایینەکان. بێگومان هەموو کەسێك خۆی ئازادە چی دەکات و مافی ئەوەی هەیە باوەڕ بهێنێت یان نا، ڕێورەسمی ئایینی جێبەجێ بکات یاخود نەیکات. بەڵام لەسەر ئاستی گشتی پێویستە وەکی هاوڵاتیەك ڕەفتار بکات، نەك وەك موسڵمان یان مەسیحی یاخود بودایی و جولەکە. ئێمە لە فەرەنسادا هاوڵاتی فەرەنسایمان هەیە کە هەموویان لەبەردەم دامودەزگاکانی دەوڵەتدا وەك یەکن و بەپێی بنەماکانی جارنامەی بەناوبانگی شۆڕشی فەرەنسی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، نەك بەپێی پرانسیپەکانی ڤاتیکان و کڵێسای کاتۆلیکی. ئێمە مل بە شەریعەتی مەسیحی نادەین، ئەمەش واتای مۆدێرنەو عەلمانییەت و مافەکانی مرۆڤ دەگەیەنێت و سەرلەبەر لەگەڵ سستمی ئسوڵی کۆندا ناکۆکە، چونکە ئەم سستمە بەردەوام لەڕێی ئەوەوە سەیرت دەکات کە تۆ سەر بە چ ئایین و ئاینزایەکیت، ئەمەش ئەو سستمەیە کە تا ساتەوەختی ئێستا لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا باڵادەستە).

## پەراوێزەکان:

* *Yves charles Zaraka (sous la direction de), L Islam en France, Paris,p.u.f, 2004*.

**لە ئێستادا پاپای ڤاتیکانە، بەناوی پاپا بندیکتۆسی شانزەوە.

## سەرچاوە:

د. هاشم صالح: معضلة الاصولية الاسلامية –دار الطليعة، بيروت –الطبعة الاولى، 2006.

# جۆن ستیوارت میل و ئەندێشەی دادپەروەری

بەهرام موحی
لە فارسییەوە: رەزا مەنوچەهری

جۆن ستیوارت میل یەکێکە لە بیرمەندەکانی سەدەی نۆزدەیەمی ئینگلتەرا و دیارترین نوێنەری تێزی لیبرالی سودگەری واتە (*Utilitarism*) یوتیلیتاریزمە. ئەو تێزە پێوەرەکانی بواری ئەخلاق، سیاسەت و ئابوری لە سوددا دەبینێتەوە. بنیاتنەرانی ئەو رێبازە جێرمی بێنتهام (*Jermy bentham*) و جەیمز میل (*james mill*)ن. جەمیز میل کە یەکێکە لە بنیاتنەرانی ئەو رێبازە باوکی جۆن ستیوارت میلە. لە تێزی ئەو بیرمەندانەدا کاری چاکە و سودمەندی وەکیەك سەیر دەکرێت، چونکە سودمەندی ئەو شتە بوو کە لە ئاستێکی بەرزدا بەختەوەری پێکدەهێنا. کەواتە بە پێی تێزەکەی ئەوان دەبێت ئامانجی هەوڵە مرۆییەکان هێنانەدی زۆرترین رادەی بەختەوەری بێت بۆ زۆرترین رێژەی تاکەکانی کۆمەڵگا. سود بناغەی هەموو فەزیلەتەکانە و بەهاکانمان بە ئاراستەکردنیان بەرەو چێژوەرگرتن دەستنیشان دەکرێن، کەواتە مومکین نییە ئاکارێك لەسەر بنەمای ئەرك و ئایدیالی کەمالی مرۆیی دامەزرابێت.

جۆن ستیوارت میل کە لە رووی فیکرییەوە لە نێو قوتابخانەی "سودگەریدا" پەروەردە کراوەو گەشەی کردووە، پاشان گۆڕانکاری لە تێزە سەرەتاییەکانی ئەو قوتابخانەیەدا دروستکرد و بابەتی دادپەروەری کۆمەڵایەتی کرد بە یەکێك لە گرنگترین باسە ئابوری و سیاسیەکانی ئەو قوتابخانەیە. دەبێت ئەوە بە یاد بێنینەوە کە کۆمەڵگای ئینگلتەرا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، واتە هاوکات لەگەڵ بڵاوبوونەوەو لە چاپدانی گرنگترین نوسینەکانی (ستیوارت میل)دا، پێشکەوتوترین کۆمەڵگای پیشەسازی جیهان بوو.

میل لە نوسینەکەی خۆیدا بەناونیشانی (یوتیلیتاریزم) واتە (سودگەری) کە لە 1861دا بلاوکرایەوە باسی بابەتی دادپەروەریی تێداکردووە. میل لە سەرەتادا ئاماژە بەوە دەکات کە نوسینەکەی تێگەیشتنی باشتر، پێزانینی زیاتر و بە ویژدانانەتر لە پێناو تیۆری (سودگەری) و (بەختەوەری) و سەلماندنیاندا نوسیوە. میل بەختەوەری هەر تاکێك بە دیارییەك بۆ خودی ئەو تاکە دەزانێت و لێرەوە بەو ئەنجامە دەگات کە بەختەوەری کۆمەڵ بەخشیشێکە (ناز و خۆشیەك) بۆ تێکڕایی مرۆڤایەتی. زیادبوونی سود، بەختەوەری و چێژ بە پێوەری ئاکاری بۆ رەفتاری مرۆڤ دەژمێرێت.

بەلام میل لەو بڕوایەدایە کە تەنها چەندایەتی ئەو سود و خۆشبەختییە دیاریکەر نییە، بەڵکو چۆنایەتی و پێکهاتەکەشی گرنگە. میل لەو بڕوایەدایە مرۆڤ هەڵگری هەستی ئەخلاقییە، گەرچی ئەو هەستە سروشتییە بەلام لەگەڵ مرۆڤدا لەدایك نابێت، بۆیە دەبێت لە رێگەی پەروەردەکردنەوە گەشەیان پێبدرێت. ستیوارت میل دادپەروەری لە ریزی ئەو هەستانەدا دادەنێت و لەسەر بنەمای "یەك هەستی لەگەڵ هاورەگەزەکاندا" هەڵدەسەنگێنێت. کاتێك میل لە بەشی پێنجەمی نوسینەکەیدا باس لە لێکدانەوەی پەیوەندی نێوان دادپەروەری و سود دەکات، بە بڕوای زۆربەی فەیلەسوفەکان ئەو هەستە بەهێز و وێنا رونەی چەمکی دادپەروەری بەخێرایی و بەشێوەیەکی خۆڕسك لە زیهنی مرۆڤدا دروستدەکات، ئاماژەیە بۆ خەسڵەتێکی دەرونی واقیع و بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی بابەتی دادپەروەرانە دەبێ بەشێوەیەکی رەها لە سروشتدا بوونی هەبێت، شتێکی خۆبەخۆ و جیاواز لە مەڕ شێوە مەسەلەیەکی سودمەندی یان وەك ئایدیایەك لە بەرامبەریدا.

بەلام لە دوایدا چ بوونی هەستی سروشتیی دادپەروەری قبوڵبکەین، یان بەدوا پێوەری بزانین بۆ قبوڵکردنی هەڵسوکەوتی دروست، ئەوە لە ئەنجامدا هەردوو شێواز بۆ تێگەیشتن لە کردار و راستیەکان پەیوەندییەکی چڕیان لەگەڵ یەکدی هەیە.

میل ئەوە بەیاد دێنێتەوە کە ئاکار ناسان، ئەرکە ئاکاریەکان بەسەر دوو گروپدا دابەشدەکەن.

یەکەم: ئەرکی ئەخلاقیانەی ناتەواو

دووەم: ئەرکی ئەخلاقیانەی تەواو

گروپی یەکەم بریتیە لەو ئەرکانەی کە کارکردن پێیان خراوەتە ئەستۆی خودی تاك. ئەو جۆرە ئەرکانە وەك دەستکراوەیی و چاکەکاری، ئەگەرچی ئەو جۆرە فەزیلەتانە بە ئەرکی ئەخلاقی دەژمێردرێن، بەلام بەشێوەیەکی دیاریکراو کەس ناڵێت کە دەبێت لە کوێ و بەرانبەر بە کێ کاریان پێبکرێت.

گروپی دووەم بریتیە لەو ئەرکە ئەخلاقییە تەواوانە کە دەبێت هەمیشە بۆ هەموان کاریان پێبکرێت. ستیوارت میل دادپەروەری لە ریزی گروپی دووەمدا دادەنێت و لە روانگەی ئەودا جیاکاریکردن لە نێوان تاکەکاندا بە یەکێك لە دیاردە نادادپەروەریەکان دەزانرێت.

میل لە درێژەی راڤەکەیدا جیاوازی نێوان دادپەروەری و دەستکراوەبوون و چاکەکاری، بەمشێوەیە روووندەکاتەوە.

داپەروەری تەنها بەو مانایە نایەت کە دەبێت ئەو کردەوەیەی دروست و رەوایە جێبەجێ بکرێت و خۆمان لەو کردەوەیە بە دوور بگرین کە نادروست و نارەوایە، بەڵکو دادپەروەری ئەو شتەیە کە هەر تاکێك دەتوانێت لە رووماندا بوەستێت و وەك ماڤی ئەخلاقیی خۆی داوای دادپەروەری بکات، بەلاّم لەلایەکی دیکەوە کەس ناتوانێت بە داوایەکی یاسایی لە بواری دەستکراوە بوون و چاکەکار بووندا رووبەڕوومان بێتەوە.

لەسەر بنەمای ئەو روونکردنەوانە میل بەو ئەنجامە دەگات کە پێناسەیەکی بەمجۆرە بۆ دادپەروەری پێشکەش بکات. دادپەروەری ناوێکە (ناونیشانێکە) بۆ کۆمەڵێك رێسای ئەخلاقی کە راستەوخۆ پەیوەندییان بەو رێساو کردار و هەڵسوکەوتانەوە هەیە کە بۆ ئاسودەیی مرۆڤایەتی چارەنوسسازن. لەمرووەوەیە کە بێ شەرت و مەرج پابەندبوون پێیان ئەرك و پەیمانێکی هەمیشەییە. میل "بانگەشەی ماڤ هەر تاکێك لە بەرانبەر خەڵکانی دیکەدا" بە پابەندبوونێکی لەو شێوەیە دەردەبڕێت و وێناکردنی خوو و سروشتی چەمکی دادپەروەری لەو شێوەپابەند بووندا دەبینێتەوە. بەپێی روانگەی میل لە تانوپۆی هەستکردن بە دادپەروەریدا نەك تەنها ئاوەز، بەڵکو بەردەوام توخمێکی پاڵنان بۆ قەرەبووکردنەوە لە (مرۆڤدا) بوونی هەیە. ئەو (توخمە) پاڵنەرە رەوابوونی خۆی لە گرنگیی زۆر شازی ئەو سودمەندبوونەدا دەبینێتەوە کە لەو نێوانەدا بەدەست دێت. ئەو سودمەندبوونەی کە لێرەدا باسی لێدەکرێت حەزلێکردنی مرۆڤە بۆ دابینکردنی ئاسایش. لە روانگەی هەموو مرۆڤەکاندا ئاسایش بە بەراورد لەگەڵ حەزەکانی دیکەدا چارەنوسسازتر دەبینرێت. مرۆڤ دەتوانێت چاو لە زۆربەی ناز و خۆشیەکانی جیهان بپۆشێت، یان لەگەڵ شتی دیکەدا بیانگۆڕێتەوە، بەلاّم قەت ناتوانێت چاو لە ئاسایش بپۆشێت، چونکە مرۆڤ لە رێگەی ئاسایشەوە، یان بەدابینکردنی ئاسایش دەتوانێت لە چارەرەشی رزگاری بێت.

کەواتە ئەو یاسا ئەخلاقیانەی کە زیان گەیاندنی مرۆڤەکان بە یەکدی یاساغ دەکەن، گرنگییان زۆرترە بۆ ئاسودەیی مرۆڤایەتی بە بەراوردکردن لەگەڵ ئەو یاسایانەدا کە بۆ هەڵسوکەوتکردنن و تەنها بۆ یەکێك لە خانەکانی ژیان رەچاو کراوە، چونکە رەچاوکردنی تێکرای ئەو یاسایانە دەتوانێت ئاشتی دابینبکات.

ئەگەر پەیڕەویکردن لەو خالاّنە نەبێت بە رێسا و سەرپێچیکردن لەو خالاّنە نەبێت بەشتێکی ئاوارتە، ئەوە لەو کاتەدا هەر مرۆڤێك لە بوونی مرۆڤێکی دیکەدا دوژمنەکەی خۆی دەبینێتەوە (یان هەر مرۆڤێکی دیکە بە دوژمنی خۆی دەزانێت). لە بنەمادا ئەرکە پەیوەندیدارەکانی کرداری دادپەروەریش لەو بنەما (دەستورە) ئەخلاقیانەوە دروستبوون.

لە درێژەدا جۆن ستیوارت میل دێتە سەر بابەتی دادپەروەری لە دادا و دەڵێت ئەو بنەمایە لە دادپەروەریدا بەمجۆرەیە: "هەر

کەسێك شایانی چییە دەبێت ئەوەی بدرێتێ"، واتە دەبێت چاکە بە چاکە و خراپە بە خراپە وەڵامبدرێتەوە شاراوەیە، بەڵکو هاوکات بابەتەکەی هەستێکی بەردەوامی تایبەتە کە لە بەها دانانی مرۆڤدا، دادپەروەری لە سودمەندبوونی رووت بڵندتر دەبینێت. زۆرێك لەو بابەتە سەرەتاییانەی دادپەروەری کە لە جیهاندا بوونیان هەیە (و دەروازەیەکن بۆ دادپەروەری) و وەك سەرچاوە دەگەڕێینەوە سەریان، لە خزمەتی چەسپاندنی ئەو جۆرە بنەمایانەدان کە ئاماژەیان پێکرا. بۆ نمونە هەر تاکێك تەنها لە بەرانبەر ئەو کردەوەیەدا بەرپرسیارە کە بەویستی خۆی جێبەجێی کردبێت یان توانیبێتی بە ویستی خۆی پێش بەو کردەوەیە بگرێت. یان ئەوە دادپەروەرانە نییە کە کەسێك بەبێ دادگایکردن حوکم بدەین. (بڕیاری بەسەردا بسەپێنین). یان دەبێت سزادان لە ئاست ئەو تاوانەدا کە ئەنجامدراوە گونجاوبێت. دەبێت ئەمجۆرە دەستپێکردنانە ببنە رێگر لەوەی کە بنەمای دادپەروەرانەی وەڵامدانەوەی خراپە بە خراپە، خراپ بەکار بهێنرێت. لەمڕووەوە ستیوارت میل ئەو ئەنجامە بەدەست دەهێنێت، دەکرێ لەوە تێبگەین کە بێلایەنی بەرزترین فەزیلەتی (کارچاکی) دادپەروەرییە، چونکە بێلایەنی پێشمەرجێکی پێویستە بۆ بەدیهێنانی ئەرکە پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بە دادپەروەرییەوە.

میل لە روانگەی خۆیەوە و لە بەشێکی دیکەی بیرکردنەوەکانیدا و بە ئیلهام وەرگرتن لە چەمکی ئەرەستویی "دادپەروەری دابەشکارانە" دەست بە شیکردنەوەی ئەم چەمکە دەکات. میل لەو بڕوایەدایە دەبێت کۆمەڵگا لەگەڵ تێکڕای ئەو کەسانەدا کە لە ئاستێکی تەواو یەکساندا خزمەتی کۆمەڵگەیان کردووە بە شێوەیەکی رەها و یەکسان هەڵسوکەوتی باشیان لەگەڵدا بکات، چونکە ئەوە بەرزترین بنەمای گشتی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دابەشکارانەیە. دەبێت هەموو دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و هەوڵی هەموو هاوڵاتیان لە بڵندترین ئاستی گونجاودا لەسەر بنەمای گشتی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دابەشکارانە بێت. ئەو ئەرکە ئەخلاقییە مەزنە ریشەیەکی قوڵی هەیە، چونکە گوزارەیەك نییە کە لە بنەما لاوەکییەکانەوە وەرگیرابێت، بەڵکو راستەوخۆ لە بەرزترین بنەمای ئەخلاقییەوە هەڵقوڵاوە و بەشێکە لە مانای بنەڕەتی سود، یان لە مانایەکی دیکەدا گەورەترین بەختەوەری لە خۆی دەگرێت.

میل پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو مرۆڤەکان ئەو مافەیان هەیە هەڵسوکەوتی یەکسانیان بەرانبەر بکرێت، تەنها لە کاتێکدا ئەوە ناکرێت کە بەرژەوەندیی گشتی و فەرمی ناسراوی ناو کۆمەڵگا پێچەوانەکەی بە پێویست بزانێت. کەواتە هەر جۆرە نایەکسانیەکی کۆمەڵایەتی کە سودمەندییەکەی بۆ کۆمەڵگا هەرس نەکرێت، نەك دەبێتە خاڵێکی نەگونجاو، بەڵکو لە هەمان کاتدا دەبێت بە نادادپەروەری و شێوەی دیاردەیەکی زۆرە ملێیانە لە خۆدەگرێت و لە دوایدا مرۆڤ سەرسوڕما دەمێنێت لەوەی کە چۆن توانیویەتی ئەوانە قبوڵ بکات.

میل بەو ئەنجامە دەگات کە دادپەروەری ناونیشانێکە بۆ داخوازییە دیاریکراوە ئەخلاقییەکان، ئەگەر بەشێوەیەکی هەمەکی داخوازییە دیاریکراوە ئەخلاقییەکان لەبەرچاو بگرین، لەریزبەندی پەیوەندیدار بە سودمەندبوونی کۆمەڵایەتییەوە، جێگایەکی بەرز داگیر دەکەن. ئیدی لەمرووەوەیە کە لە ئاستێکی بەرزیشدا پێبەندبوون لە لای مرۆڤ دروستدەکەن. دادپەروەری ناونیشانێکی گونجاوە بۆ بوارێك لە سودمەندبوونی کۆمەڵایەتی کە لە بوارەکانی دی (جگە لە هەندێك بابەتی دیاریکراو) گرنگتر، ناچارانەتر و بەپەلەترە.

دەکرێ لە کۆبەندی بیرو بۆچوونەکانی ستیوارت میلدا سەبارەت بە دادپەروەری بگوترێ کە مەبەستی لە ناوەڕۆکی ئەم چەمکە بانگەشەی ماڤ هەر تاکێکە لە بەرامبەر ئەوانی دیدا و هەروەها بنەمایەکی یاسایی و ئەخلاقی، بەپێی ئەم بنەمایە دەبێ ئەو شتەی کە شایستەی هەر کەسێکە پێی ببەخشرێت.

لەم مانایەدا میل دادپەروەری لە هەڵسوکەوتی یەکسان بەرانبەر بە هەمووان و دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان و ناز و خۆشییە مادییەکان، بە سەرنجدان لە جیاوازی نێوان تاکەکان پێناسەدەکات. بە بڕوای میل خەسڵەتی پێبەندبوون بە دادپەروەرییەوە لەو رووەوە وەرگیراون کە سودبەخشە و بەختەوەری مەزنی گشتی دروست دەکات.

میل لەو بڕوایەدایە هەر تاکێك بەو سودەی کە دەیگەیەنێت بە کۆمەڵگا لە بنەڕەتدا کۆی سودی کۆمەڵایەتی دروست دەکەن و لەو رێگەیەوە دادپەروەری کۆمەڵایەتی زیاد دەکات. بەڵام نایەکسانی کۆمەڵایەتی لە هەندێك هەلومەرجی دیاریکراوی مێژوویدا دەتوانێت بۆ کۆمەڵگا سودبەخش بێت. لە هەلومەرجێکی لەو شێوەیەدا هەڵسوکەوتی یەکسان بەرامبەر هەمووان رووبەرووی هەندێك سنوردانان دەبێتەوە، بەڵام هەمیشە دژ بەیەك بوونی حەزە جیاوازەکان و ناکۆکی چینایەتی لە مێژوودا بەردەوام بێ هۆ بوون و دواجار بەسەریدا زاڵبوون.

میل لەو بڕوایەدایە ناکۆکییەکانی سیستەمی ئابوری سەرمایەداری لە رێگەی ریفۆرمەوە چارەسەر دەکرێت. بەمجۆرە میل لە نوسینەکانیدا پشتگیری لە ریفۆرمی رێکوپێك و بە بەرنامە لە ناو سیستەمی ئابوری سەرمایەداریدا دەکات. میل خوازیاری ئەوەیە کرێکاران لە ژیانی پەروەردەیی و راهێنانی کۆمەڵگەدا بەشدار بن. میل نایەکسانی بونیادی لە سیستەمێکدا کە لەسەر بنەمای ئابوری سەرمایەداری دروستبووە تاکوو ئەو جێگایە قبوڵ دەکات کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بتوانن سود لە موڵکیەتی تایبەت وەربگرن. میل لە پێناو بەرگریکردن لە ئازادی تاك و بۆ پشکوتنی کەسایەتی تاك و هەروەها یەکگرتوویی ئازادیخوازانەی کرێکاران پشتیوانی لە پێکهێنانی یەکێتی، رێکخراوی هەرەوەزی و دروستکردنی سەندیکا دەکات.

هەڵبەت لە روانگەیەکی جۆن ستیوارت میلەوە ئازادی تاك لە پێش هەموو شتێکی دیکەوە ئازادی ویژدان و ئازادی دەربڕینە. میل لە دروستبوونی دیکتاتۆری لە بواری گشتیدا

دەترسێت و بەسەرنجدانە ئەو بابەتانەی کە باسکران دەتوانین لە ترسەکەی میل تێبگەین.

میل لەو بڕوایەدایە کە دەبێت هەر تاکێك لە دووی بەرژەوەندیی خۆی بێت، بەڵام بە مەرجێك زیان بە بەرژەوەندی خەڵکانی دیکە نەگەیەنێت. میل بە سەرنجدانە سودگەری بوونی موڵکایەتی تایبەت تاکو ئەو کاتە پاساوی بۆ دەهێنێتەوە کە بوونی ئەو تاکە کەسانە نەخاتە بەر مەترسی کە جگە لە هێزی کار شتێکی دیکەیان لەبەردەستدا نییە. دەبێت بەختەوەری بۆ هەر تاکێك هاوئاست بە بەختەوەری تاکێکی دیکە ڕەچاو بکرێت، چونکە کاتێك کەسێك خوازیاری بەختەوەری وەکیەك (یەکسان) بێت، دەبێت ئەوە بەو مانایە بێت کە بۆ گەیشتن بە بەختەوەری لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بەشێوەیەکی یەکسان دەستی بە ئامرازەکانی گەیشتن بە بەختەوەری ڕابگات. ئەوە تەنها لە کاتێکدا مەیسەر نابێت کە هەلومەرجی تایبەتی ژیانی مرۆیی و بەرژەوەندی گشتی بەسەرماندا بسەپێندرێت.

ئەم بنەمایە هەڵگری ئەنجامە کۆمەڵایەتیەکانە و خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتی بە (لیبرالیزم)ەکەی میل دەبەخشێت. لەمڕووەوەیە کە جۆن ستیوارت میل بە نێوبژیوانی ڕێبازی سیاسی لیبرالیزم و سۆسیالیزم دەزانرێت، یان لە مانایەکی دیکەدا بە هەڵکەوتوترین نوێنەری هزری "سۆسیال لیبرالیزم" دادەنرێت.

## سەرچاوە:

سایتی (*Philosophers.atspace.com*)

ئەم بابەتە لە دوێنێپەوێلە بلاوبووەتەوە.

# بەرەو هابرماس، هابرماس فەیلەسوفی پێگەیشتن

خوێندنەوەی عەبدولا ئەلوتێری
لە عەرەبییەوە: موحسین ئەدیب

**بەرچاو ڕوونیەک:**

ئەوەندەی من بزانم ئەو کتێبانەی هابرماس کە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی بریتین لە 6 کتێب (گوتاری فەلسەفەی مۆدێرنێتی )کە فاتیمە جیوشی وەریگێڕاوەو لە ساڵی 1995دا وەزارەتی ڕۆشنبیری سوریا لە دیمەشق بەچاپی گەیاندووە. ( فەلسەفەی ئەڵمانی و تەسەوفی یەهودی) نەزیر جاهیل لە ساڵی 1995وەریگێڕاوەو سەنتەری ڕۆشنبیری عەرەبی لە چاپی داوە.. (زانین و بەرژەوەندی) حەسەن سەقر وەریگێڕاوەو دەزگای بلاوکردنەوەی جەمەل ساڵی 2001بەچاپی گەیاندووە. (مۆدێرنیتەو گوتارە سیاسیەکەی) جۆرج تامر وەریگێڕاوەو خانەی نەهار لە ساڵی 2002بەچاپی گەیاندووە..(و زانست و تەکنیك وەك ئایدۆلۆژیا) حەسەن سەقر وەریگێڕاوەو دەزگای بلاوکردنەوەی جەمەل ساڵی 2003 بەچاپی گەیاندووە. (ئایندەی سروشتی مرۆڤایەتی بەرەو جینالۆجیای لیبرالیزم) جۆرج کەتورە وەریگێڕاوەو کتێبخانەی شەرقیە ساڵی 2006 بەچاپی گەیاندووە. ئەمەش مانای ئەوەیە کتێبە گرنگەکەی هابرماس کە بریتیە لە (کردەی پەیوەندی یان تیۆرەی کردەی پەیوەندی کە ساڵی 1981 لە دوو بەرگی گەورەدا بەچاپ گەیەنراوە تا ئێستا وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی) بۆیە هیوادارم دەزگاکانی چاپ کار لەسەر وەرگێڕانی بکەن چونکە کتێبخانەی عەرەبی پێدەوڵەمەند دەبێت.

**هابرماس بۆ ؟**

لێرەدا سود لە وەلامێکی دکتۆر بورهان غلیۆن وەردەگرم کە سەبارەت بە ڕەگەزە بنەڕەتیەکانی گرنگی دان بە بیری هابرماس و پێناسەکردنی لە ژینگەی جیهانی عەرەبیدا نوسیویەتی. ئەو وەلامەشی لە پێشەکی کتێبێکی حەسەن موسەدەق (تیۆرەی

رەخنەگرانەی پەیوەندی)دا نوسیوە و تیایدا ئاماژە بۆ 3 رەگەز دەکات.

**یەکەم:** ئەو سروشتە ئاراستە ئامێزیەی کە فەلسەفەی هابرماس پێیدەناسرێتەوە و کۆششکردنی بەردەوام بۆ پێکەوە بەستنەوەی تیۆر و پراکتیك.

**دووەم:** ئەو تیۆرە رەخنەیەی هابرماس تەبەنی کردوەو سەرلەنوێ بنیاتی ناوەتەوە. تیورەیەك کە لە خوێندنەوەی کاریگەرە نێگەتیڤەکانی فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم و زانستگەریەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەو فەلسەفەیەی کە لە روانگەی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە گۆرا بە بەهانەیەکی ئایدۆلۆژی بۆ عەقلانیەتی تایبەت بە سەرمایەداری. واتە بۆ بەهانە هێنانەوە بۆ ئەو سیستمە ئامادەیەی کە لەسەر دیسپلینی عەقلانی لە پێناو گشتاندنی کۆنترۆڵ و زۆرکردنی بەرهەمی سەرمایەدا بنیات نراوە، هاوکات فەلسەفەیەکە کە بەرەو قەیرانی مۆدێرنەی بردین.

**سێهەم:** بریتیە لە چەمکی بواری گشتی. بەرای هابرماس ئەم چەمکە کە داهێنراوی کانتی فەیلەسوفی ئەڵمانیایە، کلیلی ممارەسەکردنی دیموکراسیە کە لە حەفتاکانی سەدەی رابردوەوە بەکارهێنانی ئەم چەمکەی گشتی کرد. هابرماس بواری گشتی وەك بازنەی پێکەوە بەستنی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت پێناسەی دەکات. واتە نێوان بازنەی بەرژەوەندیە تایبەتیە جۆراوجۆرەکان و لێکدژەکان و بازنەی دەسەڵاتی یەکگرتوو و ئەبستراکت . بوارێکە کە تیایدا تاکەکان بۆ دروستکردنی رایەکی گشتی کۆدەبنەوەو بە هۆو لەرێگەی ئەمەشەوە دەگۆرێن و دەبن بە هاولاتی گەلێك کە یەك بیرورا و بەها و ئامانج کۆیاندەکاتەوە. ئاڵوێری عەقلانی بۆچونەکان سەبارەت بەو مەسەلانەی کە تایبەتن بە بەرژەوەندی گشتیەوە، زەمینەی دروستکردنی رایەکی گشتی دەسازێنێت.

### هابرماس.. کورتەیەکی مێژوویی:

لە شاری دوسڵدۆرف *Dussldorf* لەدایك بوەو لە زانکۆکەشیدا خوێندویەتی، لە ساڵی 1953دا و سەبارەت بە (ململانێی نێوان رەهاو مێژوو لە بیری شلنج) پلەی دکتۆرای بەدەست هێناوەو ئەمەش ناچاری کردوە لە فەلسەفەی ئایدیالستی ئەڵمانی هەر لە کانتەوە بۆ هیگڵ و بیریارەکانی دیکەی رۆشنگەری بکۆڵێتەوە. لە نێوان ساڵانی 1956-1959دا لە پەیمانگای لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی زانکۆی فرانکفۆرتدا بووەتە یاریدەدەری ئەدۆرنۆی مامۆستای ، لە نێوان ساڵانی 1964-1971بووەتە مامۆستای پەیمانگای ماکس بلانك لە سترانبۆگ، پاشان بەرێوبەری و لە ساڵی 1972 دا گەراوەتەوە بۆ زانکۆی فرانکفۆرت.

### هابرماس و قوتابخانەی فرانکفۆرت:

هابرماس بەیەکێك لە کەسە دیارەکانی نەوەی دووەمی قوتابخانەکە (ئەلبێرت ڤیلمەر، کلاوس ئۆف، ئەلفرید شمیت ، ئیکسیل هۆنیس)دەژمێردرێت. بەڵام بەهۆی

دورکەوتنــــەوەی هابرمـــاس لـــە هەنـــدێك لـــە گوتـــەزاکانی مارکســـیزمی کلاســـیکی ئـــەو قوتابخانەیە، پێویستە ئەم مەسەلەیە بە رەهایی وەرنـــەگرین. بـــەڵام دڵنیـــاین لـــەوەی کـــە لـــە جەوهەری ئەو قوتابخانەیەوە نزیکە کە خۆی لە رەخنەو تیۆرەی رەخنەییدا بەرجەستە دەکات. عیســـام عەبـــدوڵا لـــە (رەهـــان مۆدێرنـــە و پۆســـتمۆدێرنە)دا دەڵێـــت (ئەگـــەر هابرمـــاس ماوەی چەند ساڵێك لە سەر دەستی ئەدۆرنۆ خوێندبێتی و ئەگەر بەشێوەیەکی گشتی چەند خەســـڵەتێکی هاوبـــەش لـــە نیـــوان خـــۆی و پێشینەکانی خۆیدا هەبێت، بەو پێیەی کە میراتگرێکی شەرعی هاوچەرخی قوتابخانەی فرانکفۆرتـــە، ئـــەوا ئـــەو قوتابخانەیـــەی بـــە ئاراستەیەکی جیاوازدا بردووە. لە کاتێکدا روانگـــەی بنـــەرەتیی ئـــەدۆرنۆو هۆرکهایمـــەر و مارکۆزە بریتی بێت لە : گرنگی پێدانێکی لە رادبەدەر بە ئازادی مرۆڤ ئەگەرچی بوونی ئەو ئازادیـــە لـــە ئـــەرزی واقیعـــدا هـــیچ ئەگـــەرێکی جێبەجێکردنیشـــی نـــەبێت، ئەوا هابرماس لە لایەك زیاتر لە فەیلەسوفێکی دیکەی دیاری ئەو قوتابخانەیە جەختی لەسەر راڤەکردنی کردەو بونیـــــــادی کۆمەڵایـــــــەتی کردوەتـــــــەوە، لەلایـــەکی دیکـــەوە بـــەرگری کردنـــی لـــە (پرۆژەی مۆدێرنە) بەتایبەت بیرۆکەکانی عەقڵی هەمەکی و ئەخلاقی هەمەکی – کلی، بەڵگەشی بۆئەوەی کە پرۆژەی مۆدێرنە تەواو نەبووە کارێکی کردوە لە هەڵوێستێکی تەواو ناکۆك بە ئـــادرنۆ و هۆرکهایمـــەردا رابوەســـتێت کـــە هەڵوێستێکی رەخنەگرانەیان بەرامبەر بە عەقڵی رۆشنگەری هەیە.

## هابرمـــــاس زەمینـــــەی پێگەیشـــــتن و گەشەکردنی بیر:

هابرماس کاتێك باس لە پەنجاکان دەکات ئاماژە بەوە دەکات لە تەنیشت رەوتی کانتیزمی نوێوە پێنج رەوتی دیکەی فەلسەفی هەبون کە بریتیبـــون لـــە :رەوتـــی فینۆمینۆلـــۆژی کـــە هۆسرەڵ و هایدگەر نوێنەرایەتیان دەکرد و لە لایەکـــەوە ســـەرقاڵی دروســـتکردنی لـــۆژیکی موتەعالی بوون کە سەرلەنوێ پەیوەندی نێوان خودی بناس و بابەتی ناسیندا رێکبخاتەوە و لەلایـــەکی دیکـــەوە ســـەرقاڵی بنیاتنانـــەوەی ئەنتۆلۆژیایـــەکی تـــازەبووەوە کـــە لـــە روانگـــەی کێشەو مەسەلە گرنگە هەنوکەییەکانیەوە چاو بە بارودۆخی مرۆڤدا بخشێنێتەوە. رەوتی دووەم رەوتێکە فەلسەفەی ژیان بەرجەستە دەکات کە یاسبرز و لیت سبرنگر نوێنەرایەتی دەکەن و فەلسەفەیەك بووە رەهەندگەلێکی هاوبەشی لەگەڵ فەلسەفەی دلتای هەبووە کە ئاوێتەی وجودیەت و هیگلیزمی نوێ بووبوو. رەوتی سێهەم: ئەنسرۆپۆلۆژیایەکی فەلسەفی لەگەڵ شیلەر و وبلیسنەر و کاسیرەر. رەوتی چوارەم: فەلسەفەیەکی کۆمەڵایەتی رەخنەیی کە هەوڵیدەدا نوێنەرایەتی فەلسەفەی مارکس و هیگل بکات بە شێوازی تایبەتی خۆی، هەریەك لـە جـۆرج لۆکـاش ، ئارنسـت بلـوخ ، کـارل کـــورش، ڤاڵتـــەر بنیـــامین و هۆرکهایمـــەر نوێنەرایەتیان دەکرد.

هابرماس لە ماوەیەکی کەمدا لە ئەڵمانیا لە رێگـای کتێبـی (بیرکردنـەوە لەگـەڵ هایدگـەردا دژی هایدگـەر) ناوبـانگی پەیـداکرد کـە تیایـدا

بەتوندی رەخنەی لە فەیلەسوفی گەورەی ئەو قۆناغەی ئەڵمانیا، "فەیلەسوفی بوون" مارتن هایدگەر گرتووە. بەتایبەت لە رووی کاریگەری سیاسی و پەیوەندیەکانی بە نازیزمەوە. هابرماس زۆر بەزوویی هەستا بە رەخنەگرتنێکی گشتگیر بۆ بیری پۆزەتیڤیزم کە ئەو کات لەگەڵ گەشەسەندنی سەرمایەداری و دەسکەوتە زانستیە یەك بەدوای یەکەکاندا پەرەی سەندبوو. لەو قۆناغەدا کتێبە گرنگەکانی سەرەتای (گۆڕانی بونیادیانەی بواری گشتی-1962)و (تیورە و پراکتیك-1963) و (لەبارەی لۆژیکی زانستە کۆمەلایەتیەکان-1970) و (زانین و گرنگیپێدانەکانی مرۆڤ - 1971). لەم کتێبانەدا هابرماس فەلسەفەی پۆزەتڤیزم بەتایبەت لای هەریەك لە ئارنست ماخ ، تۆماس کۆن، رودۆلف کارناب بەوە تۆمەتبار دەکات کە گرنگی پێدانە تیۆرییەکانی زانستیان وەك ئامرازێك بۆ ئازادکردنی مرۆڤ لە پێداویستیەکانی سروشت و بونیادی کۆمەلایەتی پشتگوێ خستوە. هابرماس دەڵێت (بەپێی خوێندنەوەی سامی خەشەبە) عەقڵ لای فەیلەسوفانی رۆشنگەری چەکی جەنگێك بووە دژی وەهم و خورافات و گومڕایی ، خراپە هاوتای هەڵە بووە، لە کاتێکدا خێر بریتیبووە لە راستی و ئازادکردنی مرۆڤ و هەمو ئەو شتانەی کە دەبنە مایەی خێر بۆ مرۆڤ. لەبەر ئەوە پراکتیك پەیوەست بووە بە تیۆرە یان بە فەلسەفاندن یان بە لێکۆڵینەوەی زانستی پەتیەوە . بەلام لەگەڵ گەشەسەندنی زانست و تەکنەلۆژیا و هەلایسانی ریکخستنی بیرۆکراتیانەی کۆمەڵگادا، ئەو پەیوەندیە مۆرکێکی شەڕانگێز و نامرۆیی وەرگرت، عەقڵیش مۆرکێکی کردەیی وەرگرت، عەقلانیەت بوو بە ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی ئەوپەڕی توانایی دەزگاکانی کۆمەڵگا کە ئەو بیرۆکراتیەتە ئیدارەی دەکات، بەمشێوەیەش عەقڵ رۆڵی ئازاکردنی لە دەست دا و چیدی جەوهەری خۆی وەك ئامرازێکی ئاشکراکردنی حەقیقەت یان وەك سەرچاوەیەك بۆ ماناکان و بەهاکان دۆڕاند و نەیتوانی ئەو رۆڵە ببینێت. ئەمەش لە کاتێکدا کە پۆزەتیڤیزمی وەك فەلسەفەیەکی باوو بلاو جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە وەزیفەی عەقڵ بریتیە لە پێشکەشکردنی وەسفێکی وێنەیی و بابەتی بۆ جیهان و مەعریفە وەك ئەوەی کە هەن، نەك رەخنە لێگرتنیان.

لە قۆناغی دووەمدا قۆناغی دەرکەوتنی بیری تایبەت دوای دەربازبوونی لە مارکسیزمی کلاسیکی وکاریگەری مامۆستایان ئەدۆرنۆو هۆرکایمەر. لەم قۆناغەدا هابرماس لە بەرامبەر نەزعە ناعەقلانیەکاندا وەك بەرگری کارێك لە (عەقلی رۆشنگەری) وەك بناغەیەك بۆ مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنە دەرکەوت، ئەمەش لە کتێبی (قەیرانی رەوایەتی-1973)دا بەرجەستە دەبێت کە تیایدا وتوێژی لەگەڵ دوا کارەکانی مارکس و کارەکانی ئەدۆرنۆو بیریارانی هەڵوەشانەوە گەرایی و پۆست مۆدێرنی وەك دریدا و فۆکۆو فرانسوا لیوتاردا کردوە. لێرەدا هابرماس بڕوایوایە ئایندەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کە وەك کۆمەڵگای کۆن لەسەر بنەمای پەیوەندیکردن بەشێوە جیاوازیەکانیەوە

بونیادنراوە، زامنی ئەوە دەکات پرۆسەو کەناڵەکانی پەیوەندیکردن لە هەر جۆرە کۆنترۆڵێك ئازاد بن. لەم کۆمەڵگایەدا تیۆرەو پراکتیك و مەعریفەو بەرژەوەندی بەشێوەیەکی ڕەوا و سروشتی و تەواوکاری و هاوشێوەدەبن و تاك مافی خۆی لە بونیادی سیاسی وەردەگرێتەوە و عەقڵ لە پراکتیك ئازاد دەبێت و لە بواری گەڕان بە شوێن ڕاستیدا مومارەسەی ئازادی خۆی دەکات. لە کتێبێکی دیکەیدا (پەیوەندی و دروستبوونی کۆمەڵگا - 1976) بیرۆکەی خۆی سەبارەت بە پەیوەندی بەشێوە جیاوازەکانیەوە، وەك ئامرازێك بۆ بونیادنانەوەی مەعریفە، نەك بەتەنها بۆ ئاڵوگۆڕ، تەواو و بەتەواوی بەرجەستەی کرد. لە ساڵی 1981دا دوو بەرگی گەورەی لەچاپ دا (تیورەی کرداری پەیوەندی)، تیایدا گرنگی گەڕاندەوە بۆ بەها و پێوەرە کۆمەڵایەتیەکان: هابرماس بەپشت بەستن بە بیرۆکەکانی کولبیرج و جان بیاجیە، توانی گەشە بە تیۆرەی (توانستی ئەخلاقی) وەك ناوەڕۆکێك بۆ پەیوەندیکردن بدات، وە بە پشتبەستن بە چۆمسکی تیۆرەی توانستی زمانەوانی دارشت، لە وتوێژکردن و ڕەتکردنەوەی بیری ماکس ڤێبەریشدا، پرنسیپی جوێکردنەوەی نێوان سروشتی تەکنیکی زانست و پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی و نێوان سروشتی پێوانەیی فۆرمەڵەکرد.

لە ساڵی 1985 هابرماس قۆناغی سێهەمی لە ڕەخنەگرتنی مۆدێرنەی مێژوییدا دەست پێکرد، واتە مۆدێرنە وەك ئەوەی بە کردەیی بەرجەستە بوو، نەك مۆدێرنەی فەلسەفی و پۆستمۆدێرنە. ڕونیشی کردوەتەوە چۆن نەمانی هاوسەنگی لە نێوان بەها مەعنەویەکان و بەها مادیەکاندا وایکرد کە عەقڵانیەتی ڕۆشنگەری بگۆڕێت بە حاڵەتێکی ناتەندروست. بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە هابرماس دژی پرۆژەی ڕۆشنگەری و مۆدێرنەیە؟ لەم بڕگەیەی خوارەوەدا تاوتوێی ئەم مەسەلەیە دەکەین.

### تیۆرەی کردەی پەیوەندیکردن

تیۆرەی کرداری پەیوەندیکردن گەورەترین دەسکەوتی هابرماسە. لەو تیۆرەدا وەك ئیان کریبی خاوەنی کتێبی (تیۆرەی کۆمەڵایەتی) دەڵێت، هابرماس بەمەبەستی فراوانکردنی بنەمای تیۆرەی ڕەخنەیی بە ئاڕاستەی فەلسەفەی زماندا کار دەکات و لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەش کردوە کە کریب لەم چەند خاڵەدا کورتیان دەکاتەوە:

1. بانگەشە بۆ ئازادبوون لە فەلسەفەی ئاگایی (فلسفة الوعی) دەکات، واتە ئەو فەلسەفەیەی وادەبینێت پەیوەندی نێوان زمان و کردار، وەك پەیوەندی نێوان خود و بابەت وایە. بینینی جیهان بەو شێوەیە وامان لێدەکات ببینە کۆیلەی عەقڵئامێری (الاداتی)و ئەو تەوژمە ڕەشبینیەی کە باڵی بە سەر ئەدۆرنۆو ئەوانی دیکەدا کێشابوو. دەربازبون و ئازادبوون لەم هەڵوێستەوە سەرچاوە ناگرن.
2. دیڤید راسمسن بەم شێوەیە قۆناغی دووەم کورت دەکاتەوە: دەشێت کردار دوو وێنە لە خۆبگرێت، کرداری ستراتیژی و کرداری

پەیوەنـدیکردن. یەکـەمیان بریتیـە لـە کـرداری ئامانجخوازی عەقلانی و کرداری پەیوەندیکردن بریتیە لەو کردارەی کە ئامانجی تێگەیشتنە لە شـتەکان، کـرداری پەیوەنـدیکردن کردارێکـی ئـامێری نیـەو بەمشـێوەیەی خـوارەوە(هـەر لێکتێگەیشتنێك کە لە ڕێگای پەیوەندیکردنەوە پێیدەگەین بنەمایـەکی عـەقلانی هەیە: چونکە ناکرێـت لێکتێگەیشـتن لەلایـەن هـیچ لایەکـەوە بەسـەر لایەنەکـەی دیکـەدا بسـەپێنرێت، ئیـدی ئـەو سـەپاندنە ئـامرازی بێـت لـە ڕێگـای دەسـتێوەردانێکی راسـتەوخۆوە بێـت لـە هەڵوێستەکەدا، یـان سـتراتیژی بێـت لـە ڕێگـای دروسـتکردنی کاریگـەری لەسـەر بڕیـاری کەسـی نـەیار) لـە دووتـوێی ئـەم کـردارەدا جۆرێـك لـە بانگەشـەکردنی راسـتگۆیی هەسـت پێـدەکرێت و ئـەم راسـتگۆییەش لـە روی پرنسـیپەوە قـابیلی رەخنـە لێگرتنـە، بـۆ نمونـە ئـەو کەسـەی ئـەو کـردارەی رووبەڕودەبێتـەوە دەتوانێت بە بەڵێ یان بە نەخێر و چۆنی دەوێت وا وەلاّ م بداتـەوە. بـەم مانایـە کردارەکـانی پەیوەنـدیکردن کردارگەلێکی بنـەڕەتین وناشێت بـۆ چـەند کردارێکـی مەبەسـتگەر کورتیـان بکەینـەوەو ئەگـەر ئـەو کردارانـە مەبەسـتگەربونایە، ئـەوا مـرۆۆ بەشـێوەیەکی دیـاریکراو دەگەڕایـەوە بـۆ ئیشـکالیەتی فەلسەفەی ئاگایی.

3. پێشخسـتن و گرنگیـدان بـە کـرداری پەیوەنـدیکردن ئـەم دەرئەنجامانـەی لێدەکەوێتەوە:

**یەکـەم:** عەقلانیـەت بـەو مانایـە نمونەیـەك نیە لە ئاسمانەوە وەریبگرین، بەڵکو عەقلانیـەت لـە نـاو زمانماندایـە. گـرنگترین تایبەتمەندیشـی کە هابرماس لە وتووێژیدا لەگەڵ هەوادارەکانی پۆسـت مۆدێرنـەدا جـەختی لەسـەر دەکاتـەوە، بریتیـە لـەوەی ئـەو عەقلانیەتـە پێویسـتی بـە سیسـتەمێکی کۆمەڵایـەتی دیموکراتیـە کـە هـەموان بگرێتـەوەو کـەس پشـتگوێ نـەخات، ئامـانجی بریتـی نیـە لـە هـەژمون کـردن، بـەڵکو بریتیە لە لێکتێگەیشتن.

**دووەم:** جۆرێـك لـە سیسـتمی ئـەخلاقی هەیە کە هابرماس دەیەوێت ئاشکرای بکات و ئـەویش بریتیـە لـە ئـەخلاقی هەمـەکی (الاخـلاق الکلیـة)و زۆرجـاریش بـەو سیسـتمە ئەخلاقیـە دەوترێت ئەخلاقی ڕێوشوێن گرتنەبەر (الاخلاق الاجرائیة) کە مەبەستی شیتەڵکردنی ناوەڕۆکی پێوەرەکـان نیـە، ئەوەنـدەی مەبەسـتی گەیشـتنە بـەو پێوەرانـە. گەیشـتن بـەو پێوەرانـەش لـە ڕێگـای گفتوگۆیـەکی ئـازادی عەقلانیـەوە دێتـە دی و تیایـدا لـە دەرئەنجامـەکانی هـەر پێوەرێـك لەو پێوەرە ئەخلاقیانە لە روانگەی تایبەتمەندیە هەمەکیکـەوە دەکۆڵێتـەوە. واتـە ئایـا پەسـەندکردن و رەزامەنـدی لـە ڕێگـای قەناعـەت پێکردنـەوە دێـت یـان لـە ڕێگـای هێـزو توندوتیژیـەوە؟ بـەلاّم نـاوەڕۆکی پێوەرەکـان بەڕای کریب پشت بە بارودۆخی تایبەتی هەر کۆمەڵگایەك دەبەستێت.

**سـێهەم:** بیرۆکـەی بـوونی کۆمەڵگایـەکی دیموکراسی راستەقینە کە تیایدا هـەلی یەکسان بۆ گەیشتن بە ئامرازەکانی عەقڵ فەراهەم دەکات وەك بەشـداریکردن لـە دیالۆگـداو تیایـدا هـەموو تاکێـك گـوێی لێبگیرێـت و ئـازادی تـەواوی لـە وەرگرتنی بڕیاردا هەبێت.

**هابرماس و پرۆژەی مۆدێرنە:**

هابرماس لە ژێر ناونیشانی (مۆدێرنە.. پرۆژەیەکی تەواونەکراوە) لە کەنیسەی دێرینی قەشە پۆڵس و لە ساڵی 1980و بەو بۆنەیەوە کە شاری فرانکفۆرت خەڵاتی ئادرنۆیان پێشکەش کردبوو، وانەیەکی پێشکەشکرد. بۆ روونکردنەوەی دیدگای هابرماس هەوڵدەدەم پشت بە دەقی ئەو وانەیە ببەستم. هابرماس رەوتەکانی پۆست رۆشنگەری یان پۆست مۆدێرنە وا وەسف دەکات کە بریتین لە رەوتگەلێکی کۆنسێرڤاتیڤی نوێ کە دژی پرۆژەی مۆدێرنە وەستاونەتەوە. لێرەوە پرسی گەورەی ئەو وانەیە خۆی بەرجەستە دەکات، ئایا سەردەمی مۆدێرنە بەسەرچوو؟ وەك ئەوەی پۆست مۆدێرنەکان بانگەشەی بۆ دەکەن؟ یان پۆست مۆدێرنە کە چەند دەنگێکی جیاواز گوزارشتی لێدەکەن، هیچ نیە جگە لە تاکە دەنگێك؟ ئایا (پۆست مۆدێرنە) هیچ نیە جگە لە دروشمێك کە ناراستەوخۆ و بەبێ ئەوەی هەستی پێبکرێت، ئەو بۆچونە کۆنانەمان بۆ دەگوازێتەوە کە هەر لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەوە دژی نوێگەری رۆشنبیری لەئارادابوون؟

هابرماس بەنوێگەرێك لە قەڵەم دەدرێت کە هاوکاری رۆحی ئەم سەردەمە دەکات تا گوزارشتێکی بابەتی لەخۆی بکا، ئەو سەردەمەی کە خۆی نوێ دەکاتەوە. هێمای جیاکەرەوەی ئەم جۆرە ئاسەوارە ئەوەیە کە تازەبوونەوەی چەشنەکان (تازەییە کۆنەکان) تێدەپەرێنێ و پوچەڵیان دەکاتەوە. ئەوەی کە لەگەڵ مۆدەدا بژی، ئەوا بە تێپەرینی کاتیش خودی مۆدەکە دەبێتە مۆدەیەکی کۆن، نوێگەر پەیوەندیەکی نهێنی بە کلاسیکیەتەوە هەیە. هەر لە کۆنیشەوە ئەو شتەی بە درێژایی چەرخەکان بەردەوام بووبێت بە کلاسیکیی لە قەڵەم دراوە. نوێگەریی بە مانای کتومتی ووشەکە شەرعیەتی خۆی لە دەسەڵاتی سەردەمێکی بەسەرچوو وەرناگرێت، بەڵکو بەتەنها لە هەنووکەیەکەوە کە تێپەری شەرعیەت وەردەگرێت. هەڵگەرانەوەی کارلێکەکانی ئێستا بۆ کارلێکەکانی دوێنێش، هەڵگەرانەوەیەکی بەکاربەر و بەرهەمهێنە لەهەمانکاتدا. ئەو هەڵگەرانەوەیە بریتیە لە خودی مۆدێرنە کە کلاسیکیەتی خۆی دەهێنێتە ئاراوە و لێرەشەوەیە قسەکردن لەسەر مۆدیرنەی کلاسیکی شتێکی بەڵگەنەویستە .

بەڵام هۆی چیە وەك لاساییکردنەوەی پۆست مۆدێرنەکان قسە بە رۆشنبیرانی مۆدێرنە دەکرێت. لێرەدا هابرماس دەڵێت: ئەمە بە پلەی یەکەم بۆ فاکتەرە دەرونیەکان ناگەرێتەوە، بەڵکو بۆ لاوازی ئەو شیکردنەوانە دەگەرێتەوە کە باڵی بەسەر کۆنسەرڤاتیڤە نوێکاندا کێشاوە. کۆنسەرڤاتیڤە نوێیەکان دەرئەنجامە جارسکارەکان کە زادەی نوێکردنەوەی کەم تا زۆری کۆمەڵگەو کۆمەڵگان، دەخەنە پاڵ مۆدێرنەی رۆشنبیری. کۆنسێرڤاتیڤە نوێیەکان پەیوەندیی نێوان پرۆسەکانی نوێکردنەوە دەشارنەوە کە لەلایەکەوە پێشوازیی لێدەکەن و لەلایەکی تریشەوە بێزارن لە فاکتەری قەیرانەکان..، هەروەها هۆکارە کۆمەڵایەتییەستراکتۆریەکانی ئەو گۆرانکاریانە ئاشکرا ناکەن کە پەیوەندییان

بە هەڵوێستوەرگرتنەوە هەیە لەئاست کاردا، هەروەها نەریتەکانی بەرخۆری، ئاستی داخوازیەکان، چۆنیەتی بەسەربردنی کاتی بەتاڵ. ئەوانە تەنها ئەوەندە دەتوانن کە ئەو شتەی ناونراوە ڕێچکەی چێژ، ئامادەبوونێکی نوقستان بۆ هاوشوناسی و شوێنکەوتن، نێرسیسیەت و پاشگەزبوونەوە لە کێرکێ لەدەوری سێنتەرو دەسکەوتەکان..، بگەڕێننەوە بۆ ئەو رۆشنبیرییەی کە ناکرێ دەستوەرداتە ئەو پرۆسانە تەنها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نەبێ. لەکاتێکی وەهاشدا خودی ئەو رۆشنبیرانەی کە هەستدەکەن هێشتا پابەندن بە پرۆژەی مۆدێرنەوە چوونەتە جێگەی ئەو فاکتەرانەوە کە شینەکراونەتەوە.

مۆدێرنێتی بەتایبەت لە بونیادە ناوخۆییە پێکگەیشتنیەکەیدا رووبەڕوی گرفت دەبێتەوە کە لە دەرئەنجامی نوێبونەوەی کۆمەڵایەتیدا بەردەوام لەگەڵ فۆرمەڵەکردنەوەی ژیانی فراژوبودا لە ژێر فشاری حەتمی گەشەکردنی ئابوری و دەسکەوتەکانی ڕێکخستنی رەسمی.

بۆیە مۆدێرنیتەی ئەمرۆ پێویستی بە عەقلانیەتێکی پێگەیشتنکاریە کە پرۆژەی مۆدێرنیتە سەرلەنوێ بخاتەوە گەڕ. پرۆژەی مۆدێرنێتی لە ڕێگای خۆی لایدا کاتێک کە مرۆڤی پشتگوێ خست و بویە هۆی شێواندنی

بەڵام پێویستە لەسەر ئێمە مۆدێرنێتی بخەینەوە سەر سکەی خۆی و هەمواری بکەینەوە، چونکە پرۆژەی مۆدێرنێتی هەرگیز نابێت پشتگوێ بخرێت چونکە ئەلتەرناتیڤەکەی بریتی دەبێت لە کۆنسێرڤەتیڤێکی نوێ کە مرۆڤ زۆر بۆ دواوە دەگێرێتەوە. با کار لە سەر رزگارکردن و هەموارکردن و چارەسەرکردنی پرۆژەی مۆدێرنیتی بکەین و وازی لێنەهێنین چونکە پرۆژەیەکە هێشتا تەواو نەبوەو سودێکی زۆریشی پێگەیاندوین و بیرمان نەچێت شتە پۆزەتیڤەکانی ئەم سەردەمە، ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی، مافەکانی مرۆڤ بەرهەمی ئەو پرۆژەیەن و دەشێت بۆچونی هابرماسیش لەم گوزارشتەدا کورت و پوخت بکەینەوە.

### سەرچاوە:

في الطريق إلى هابرماس: هابرماس فيلسوف التواصل، جميع الحقوق محفوظة لمؤسسة اليمامة الصحفية 2007 تصميم وتطوير وتنفيذ إدارة الحاسب الالي – قسم الإنترنت.

# خودا لە ئایینە یەکتاپەرستیەکاندا

شجاع الدین شفا
لە فارسییەوە: محەمەد کەریم

**(2-2)**

داواکاریی تەواوی یەهوە سەبارەت بە قەومە هەڵبژاردەکەی ئەوە نییە کە خۆشیان بوێت، بەڵکو ئەوەیە کە لێی بترسن. لە کتێبی ملاکی پەیامبەردا لە زمانی خوداوە هاتووە دەڵێ من لەگەڵ ئێوەدا پەیمانێکم بەستووە کە گەلالەنامەی ژیان و رزگاری ئێوەیە، لەگەڵ ئەم گەلالەنامەیەدا ترس لە خۆشم هاتووە، بۆ ئەوەی لە من بترسی و لە بەرامبەر ناوی مندا هەراسان بیت (باب چهارم، 2). بە قسەی فون رود پسپۆری ناوداری کتێبی پیرۆز، بەلای یەهوەوە بنەمای هەموو خواپەرستییەکان ترسە لەو نەك عەشق بۆ ئەو یان عەشق بۆ مرۆڤایەتی یان هەوڵدان لە رێگەی گەیشتندا بە کەمال و خوداپەرستی. باشترین جولەکە لە روانگەی یەهوەوە کەسێکە کە زیاتر لێی بترسێ، و نزیکترین موجتەهیدانی مەزهەبی لای ئەو ئەوانەن کە هەرچی زیاتر سڵکردنەوەیان لە یەهوە لە خاوەن باوەڕان گەیاندبێ. لە (سفر خروج)دا، خودی یەهوە ئەوە دەگێڕێتەوە کە "ئەو کاتەی قەومی (یەهود) لە خودا ترسان و باوەڕیان بە بەندەی ئەو (موسا) هێنا" سروودێك سەبارەت بە شانازییکردن بە خۆیەوە دەخاتە سەر زاری موسا و بەنی ئیسرائیل کە لە بەندی یانزەیدا هاتووە: "لە نێوان خودایاندا کێ هەیە وەکو تۆ ئەی یەهوە کە بەقەد تۆ ترسناك بێت و وەکو تۆ سامی هەبێ؟" لە ئەنسکلۆپیدیای کتێبی پیرۆزدا، یەکێك لە جێی متمانەترین بڵاوکراوە تەوراتیەکان، بەرهەمێك بووە کە ونبووە و بە شیعر نووسراوە بە ناوی (شەڕەکانی یەهوە) ئەم دەقە بەشێك بووە لە

ئەدەبیاتی تەوراتی و تیایدا یەهوە بە نازناوی خـــودای ترســـناك، فیرعـــەون شـــكێن و تێكشكێنەری فەلەستینی و ئەدۆمی و موئابی و كەنعانییـــەكان دەستنیشـــانكراوە. لـــە كتـــێبی (ملاكی) پەیامبەردا كە پێشان باسكرا، خودا لە ڕێگەی پەیامبەرەكەی خۆیەوە بە تووڕەییەوە هاوار دەكات "كوڕ لە باوكی خۆی و نۆكەر لە ئاغای خۆی دەترسێ. ئەگەر من باوكم ترس لە من چی بەسەرهاتووە؟ ئەگەر من ئاغام سامی من بۆ كوێ چووە؟ پێتان وایە من نازانم كە ئێوە بەناوی قوربانییەوە نانی گڵاو لە مەزبەحەكەی مندا دادەنێن، لەگەڵ ئەوەشدا كە بەرخێكتان لەناو ڕانەكەتاندا هەیە بەرخێكی عەیبدارم بۆ سەردەبڕن؟ بۆچی نازانن كە من پاشایەكی گەورەم و ناوی من لە نێو نەتەوەكاندا ناوێكی سامناكە" (ملاكی نبی، باب اول، 6). دوا ڕستەكانی تەورات بەڵێنی نەخۆشی و پەتاو مردن و ئاگرە بۆ ئەو كەسانەی كە بە بیستنی ناوی یەهوە نەترسن و بەندی كۆتایی پەیمانی كۆن ئەوەیە كە "ئێستا من ئیلیای پەیامبەر بەر لە هاتنی ڕۆژی مەزن و ترسناكی خودا دەنێرم بۆ لاتان تا دڵی باوكان و كوڕەكان هەڵگێڕێتەوە، نەبا من ڕقم هەستێ و نەفرەت لە زەوی بكەم (ملاكی نبی، باب چهارم، 5 و 6).

لە چەند جێگایەكی تری تەوراتدا، یەهوە ڕۆڵی وەها نائەخلاقی دەبینێ كە نەك تەنها لە ڕووی یاســـاییەوە وەكـــو كـــڵاو لەســـەرنان تاوانێكەو قابیلی لێ پێچینەوەیە، بەڵكو لەگەڵ نـاوەڕۆكی دە فەرمانـە نەناسـراوەكەی خـودی خۆشیدا ناكۆكە كە یەكێكیان (دزی مەكە)یە. لە كاتێكدا لە میسر بە موسا دەڵێت بەم زوانە هەموو كوڕە گەورەكانی خێزانە میسرییەكان بە دەستی خۆی دەكوژێ و پاشان ئەوە دەخاتە دڵـــی فیرعەونـــەوە كـــە مۆڵـــەتی دەرچـــوونی جولەكەكان لە وڵاتەكەی بدات، ڕێنمایی موسا دەكـــات كـــە بەرلـــەوە جولەكـــەكان هانبـــدات هەرچەندە بتوانن قاپ و قاچاغی ئالتوون و زیو بە ئەمانەت لە دراوسێ میسرییەكانیان وەربگرن بۆئەوەی پاشان لەگەڵ خۆیاندا ببیەن. دەقی نووسینەكەی تەورات لەم بارەیەوە ئاوایە ".. ئێستا بە گوێی قەومەكەی خۆتدا بچرپێنە كە هەموو پیاوو ژنێك شمەكی ئالتوون و زیو لە دراوسێكەیان داوا بكەن (سفر خروج، باب یـــازدهم، 2). بـــەنی ئیســـرائیل كاریـــان بـــە فەرمانەكـــەی موســـا كـــرد و شمـــەكی ئـــالتوون و زیویـــان لـــە میســـرییەكان خواســـت و خـــودا لەبەرچـــاوی میســـرییەكان خۆشەویســـتی كـــردن ، بۆیـــە هەرچـــیەكیان داواكـرد پێیـان دان، جولەكـەكان بـە تـەواوی میسـرییەكانیان تـاڵانكرد" (هـەمان سەرچـاوە، باب دوازدهم، 35 و 36).

ســەبارەت بــە شــەڕی جولەكــەكان لەگــەڵ هــەردوو قــەومی عــەمون و موئابــدا كــە تیایــدا موئابییەكان لەسەر حەقن، یەهوە بە بۆسەنانەوە تەواوی خەڵكی ئەم دوو قەومە لەناو دەبات و دوای ئـەوە جولەكـەكان ئاگـادار دەكاتـەوە كـە هــەتا ســێ ڕۆژ پــارەو جــل و بــەرگ و شــتە گرانبـــەهاكانیان تـــاڵان بكـــەن و لـــە ڕۆژی چواردەمدا خودا بە پاكژو نەزیە ناوبەرن:

".. ئەوسا یەهوە شافات پاشای ئیسرائیل لەناو جەماعەتی یەهودادا لە مالی خودا لە بەردەمی سەحنە تازەكەدا وەستاو وتی: ئەی

یەهوە ئەی خودای باوکانی ئێمە، مەگەر تۆ لە ئاسمان خودانیت و هێز و توانات لەبەردەستدا نییە؟ ئایا تۆ خودای ئێمە نیت کە تەواوی دانیشتوانی ئەم وڵاتەت لەوێ دەرکرد بۆ ئەوەی بۆ هەتا هەتایە بیبەخشی بە ئیبراهیمی کوڕی خۆشەویستی خۆت؟ بەڵام ئێستا بەنی عەمون و بەنی موئاب هاتوون بۆ ئەوەی لە موڵکی تۆ کە خستوتەتە بەردەستی ئێمە دەرمانکەن. ئەی خودای ئێمە، ئایا تۆ فەرمانیان بۆ دەرناکەی؟ ئەوسا رۆحی خودا چووە ناو جەستەی یەحزئیلی کوڕی زەکەریای کوڕی بنایا کوڕی یەعیئیل کوڕی متنیای لاوی -یەوە کە لەناو جەماعەتەکەدا بوو، ئەویش وتی ئەی تەواوی یەهودا ئەی یەهو شافات پاشا گوێبگرن خودا پێتان دەڵێت لەو گروپە زۆرە مەترسن لەبەرئەوەی شەڕ شەڕی ئێوە نییە بەڵکو شەڕی منەکە خودای ئیسرائیلم. سبەینێ دابەزن بۆ لایان بەڵام شەڕ مەکەن بەڵکو بوەستن و تەماشای ئەوە بکەن کە خودای ئێوە بۆ رزگاربوونتان دەیکات، خودا بۆسەی بۆ بەنی عەمون و بەنی موئان نایەوە و لە ناوی بردن، هەر کە ئیسرائیلیەکان گەیشتنە دیدەوانگاکانی بیابان بینیان لاشەکان لە زەویدا کەوتوون و کەس دەرباز نەبووە. ئەوسا یەهو شافات پاشا لەگەڵ هەموو قەومی (ئیسرائیل)دا بەرەو شرەخۆری و تالانی ملیاننا و ئەوەندەیان پارەو جل و بەرگ و شتی گرانبەها هەڵگرت کە نەیاندەتوانی بیانبەن، هەتا سێ رۆژ سەرقالی تالانی بوون، پاشان رۆژی چوارەم لە دۆڵی (برکە) کۆبوونەوەو لەوێ خودایان بە پاکژ و نەزیە ناوبرد" (تواریخ ایام، کتاب دوم، باب بیستم 5-26).

مەسەلەی شێوەی یەهوە لە رازەکانی کتێبی پیرۆزە، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە خودی خۆی لە کێوی سینا بە موسا دەڵێت کەس ناتوانێ من ببینێ و بە زیندوویی بمێنێتەوە، لە هەمان کتێبی پیرۆزدا لە چەند جێگایەکدا پەیامبەرانی و کەسانی دی لە وێنەی خودادا یان لە وێنەی نەناسدا یەهوە دەبینن نەك تەنها نامرن، بەڵکو خۆشیان بە دوور و درێژی ئەم دیدارانە لە تەوراتدا دەگێڕنەوە:

لە دیداری موسادا لەگەڵ یەهوە لە کێوی سینا موسا داوای لێدەکات کە "سیمای خۆی بە موسا نیشان بدات" بەڵام خودا بە موسا دەڵێت "تۆ ناتوانی روخساری من ببینی لەبەرئەوەی هیچ مرۆڤێ ناتوانێ من ببینێ و بە زیندوویی بمێنێتەوە" (سفر خروج، باب سی و سوم، 18-20) لەگەڵ ئەوەشدا تەورات ئەوەش دەڵێت کە ئەو توانایە بە موسا درا کە دوای ڕەتبوونی خودا بە بەردەمیدا شوێنی دانیشتنەکەی ببینێ (هەمان سەرچاوە، 19-23). سەرەڕای هەموو ئەمانە لە (کتێبی دەرچوون سفر خروج)دا هاتووە کە خودا رووبەڕوو قسەی لەگەڵ موسا دەکرد "وەکو کەسێك کە لەگەڵ هاوڕێی خۆیدا قسە بکات" بەر لەوەش بەپێی حیکایەتی تەورات خودا لەگەڵ ئیبراهیمی پەیامبەریدا نانی خواردبوو (سفرپیدایش، باب هجدهم، 1-8)، هەروەها لەگەڵ یەعقوبدا زۆرانی گرتبوو (سفر پیدایش، باب سی و دوم، 31)، بە دوای موساشدا رایکردبوو بۆ ئەوەی بیکوژێ (سفر خروج، باب

چـوارم، 24) لـه کتـێبی دووەمـی سـەموئیلدا وەسفێکی وردی یەهوە لە زمانی داودەوە کراوە کە بـەپێی ئـەوە یـەهوە لەسـەروو هەورەکانـەوە دێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، لە کاتێکدا دوکەڵ لـە لووتیـەوە بەرزدەبێتـەوە و لـە دەمیـەوە ئـاگر دێتـە دەرێ و لـە هەیبـەتی زەوی دەلەرێتـەوە: "ئەوسا زەوی لەریەوەو پایەکانی ئاسمان هاتنە لەرزە، لە لووتیەوە دوکەڵ بەرزبۆوە و ئاگر لە دەمیـــەوە هاتـــە دەرێ و پشـــکۆکان تیایـــدا گەشـــانەوەو ئاسمـــانی لارکـــردەوە و هاتـــە خـوارەوە، تاریکیـەکی ئەنگوسـتە چـاو لـە ژێـر پێیەکانیـــدا بـــوو، لـــە درەوشـــانەوەی ئـــەو پشـــکۆکانی ئاگرەکـــە گەشـــانەوەو بروســـکە پرشـنگیدا. پاشـان قـوڵایی دەریـا دەرکـەوت و پایەکانی خانووی ئاوەدان ئاشکرا بوو و خودا لە بەرزترین بەرزاییەوە نێردراوی منی وەرگرت" (کتـاب دوم سموئیـل، بـاب بیسـت و دوم، 8-17). حزقیـال-ی پەیامبـەریش لـە کتێبەکـەی خۆیدا باس لـەوە دەکات کە یەهوەی خودا بە چاو دەبینێ کە لەسەر تـەختێکی پاشایی وەك یاقوت دانیشتووە "لـە سـەروو ئاسۆوە تارمایی تـەختێکی یـاقوتی شـینم بـینی و لەسـەر ئـەو تەختـە روخسـارێکی وەك هـی مـرۆڤم بـینی، لـە کەمـــەر بـــەرەو ژووریـــەوە وەکـــو کـــانزا بەدرەوشـــاوەیی بینـــیم، لـــە چـــواردەوری و ناخیشی پرشنگی ئاگرم بینی کە وەکو دیمـەنی پەلکەزێرینـە وا بـوو لـە رۆژی بارانـدا کـە لـە هـەوردا بێـت، زانـیم کـە ئـەو دیمەنـە شـکۆی یەهوەیـە و کـە بینـیم بـە دەماکـەوتم و ئەوسـا گوێم لە دەنگێ بوو کە پێیوتم: ئەی کوڕی مرۆڤ، هەسـتە سـەرپێ بۆئـەوەی قسـەت لەگـەڵ بکـەم" (کتـــاب حزقیـــال نـــبی، بـــاب اول، 26-28). ئەشعیای پەیامبەریش یەهوە لە نێوان فریشتە باڵدارەکاندا دەبینێ "ئەو کاتە خودام بینی کە لەسەر کورسیە شکۆدارەکەی خۆی دانیشتبوو ژمارەیـــەك (ســـرافین - ئیســـرافیل) لەســـەرو سـەریەوە وەسـتابوون کـە هەریەکـەیان شـەش باڵی هەبوو، هەریەکەیان ئەوی تری بانگدەکردو دەیوت (قەدوس قەدوس) یـەهوەی صبایوت کە تـەواوی زەوی سیخنانە لـە شـکۆی. پایـەکانی خانووەکە بە دەنگی ئەو دەلـەرزی وماڵەکە پڕ بـوو لـە دوکـەڵ. پاشـان وتم وەی لـەمن کـە تیاچووم، لەبەرئەوەی چاوانم یەهوەی صبایوت پاشایان دیووە" (کتاب اشعیاء نبی، باب ششم، 1-5). یـەهو شـافات پاشـای یـەهودا لەگـەڵ ئەوەشدا کە پەیامبـەر نییە، بۆ ئەخاب پاشای ئیسـرائیلی دەگێڕێتـەوە کـە یـەهوەی لەسـەر کورسی دیوە و ئەوەی دیووە کە ئەو کەسێکی نـاردووە بـۆ ئـەوەی ئـەخاب فریوبـدات و وای لێبکـات کـە هێـرش بکاتـە سـەر (جـەلعاد) بـۆ ئـەوەی لـەوێ تێـك بشـکێ: "یـەهو شـافات بـە ئـــەخابی وت بەراســـتی خـــودام لەســـەر کورسیەکەی بینی و تـەواوی لەشکری ئاسمان لای راست و چەپییەوە وەستابوون و خودا وتـی کـێ دەتـوانێ بچـێت ئـەخاب فریـو بـدات و بـۆ ئـەوەی هێـرش بکاتـە سـەر (رامـوت جـەلعاد) و بکـەوێ؟ رۆحـی گـڵاوی شـەیتان لـە بـەردەمی خـودادا وتـی مـن ئـەم کـارە دەکـەم و لـە زاری هەموو پەیامبەرەکانیدا رۆحی درۆ دەبم. پاشان خودا فەرمووی برۆ وا بکە. بەڵام ئاگاداربە کە ئێستا خودا گیانی درۆی خستۆتە ناخی هەموو ئەم پەیامبەرانەی تۆوە" (کتاب اول پادشاهان،

باب دوازدهم، 19–23، کتاب دوم تواریخ ایام، باب هجدهم 18–22). ئەشعیائی پەیامبەر رایدەگەیەنێ کە یەهوە لە کێوی سەهیون نیشتەجێیە (کتاب اشیعاء، باب هشتم، 18). حەزقیال-ی پەیامبەر خودی یەهوە لەناو پەرستگای ئۆرشەلیمدا دەبینێ کە بە حەزقیال دەڵێت بە نیازە بۆ هەمیشە لەو شوێنەدا نیشتەجێ بێت "پاشان خودای مەزن لەو دەرگایەوە کە رووی لە خۆرهەڵات بوو هاتە ناو پەرستگاکەوە، منی هەڵگرت و هێنامی بۆ سەحنی ناوەوە، دەنگێکم بیست کە لە نێو بیناکەوە قسەی لەگەڵ دەکردم، گوێم لێبوو پیاوێك کە لە تەنیشتمەوە وتی ئەی کوڕی مرۆڤ، ئەمەیە تەختی خودایی من و جێگای پێم کە بە نیازم تیایدا و لەناو بەنی ئیسرائیلدا بۆ هەتا هەتایە نیشتەجێ بم" (کتاب حزقیال نبی، باب چهل و سوم، 4–7). زەکەریای پەیامبەر لە زمانی خوداوە گوێی لێدەبێ کە دەڵێ: "ئێستا گەڕاومەتەوە بۆ سەهیۆن و پاش ئەوە لە نێو ئۆرشەلیمدا نیشتەجێ دەبم" (کتاب زکریا، باب هشتم، 3).

بەپێی گێڕانەوەی تەورات داودی پاشا و پەیامبەر بە نیازە خانوویەك لە ئۆرشەلیم بۆ خودا دروست بکات بۆ ئەوەی لە داهاتووداماڵێکی دیاریکراوی هەبێ و سەرگەردان نەبێت، بەڵام قسەی خودا بۆ ناتال دێتە خوارەوە و پێی دەڵێت "بڕۆ بە داودی بەندەی من بڵێ خودا دەفەرموێ پێویست ناکات تۆ خانوویەك بۆ دانیشتنی من دروست بکەی، چونکە لەو رۆژەوە کە بەنی ئیسرائیلم هێناوەتە دەرەوە هەتا ئەمڕۆ لە خانوویەکدا نیشتەجێ نەبووم. بەڵکو لە چادرێکەوە بۆ چادرێکی تر و لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر رۆیشتووم، ئایا لەم ماوەیەدا بەیەکێ لە هەڵبژاردەکانی ئیسرائیلم وتووە بۆچی خانوویەکت لە دار سەروو ئازاد بۆ من دروست نەکرد؟" (کتاب اول تواریخ ایام، باب هفدهم، 3–6). لەگەڵ ئەوەشدا سلێمانی جێنشینی داود سەرەنجام ئەم کارە دەکات و خودا لە بێ خانەو لانەیی دەردەهێنێ: "..پاشان سلێمان بینای ماڵی خودای تەواوکرد.. و خودا لە شەودا خۆی نیشانی سلێمان داو وتی: ئێستا داواکەی تۆم قبوڵکرد و ئەم جێگایەم بۆ نیشتەجێ بوونی جێگیریی خۆم هەڵبژارد. ئێستا ئەگەر ئاسمان دابخەم تا باران نەبارێ و ئەگەر فەرمانبدەم کوللە بەروبوومی زەوی بخۆن و ئەگەر کۆلێرا بنێرم بۆ قەومەکەی لەگەڵ ئەوەشدا قەومەکەم خاکی بن و دوعا بکەن لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا داوای حوزوری من بکەن. ئەوسا من داوایان لە ئاسمان وەڵام دەدەمەوەو لە ئێستا بەدواوە گوێم لەو دوعایە دەبێت کە لەم جێگەیەدا و بە حوزوری خۆم دەکرێ" (کتاب دوم تواریخ ایام، باب هفتم، 11–16).

سەرەڕای هەموو ئەم قسە دووبارانەی تەورات، ئینجیلی یوحەننا رایگەیاند کە هیچ مرۆڤێك هەتا ئێستا خودای نەدیووە (یوحنا، باب اول، 18 و باب چهارم12) پاولوسی پەیامبەریش لەنامەی یەکەمی خۆیدا بۆ قەرنتییەکان (باب سیزدهم 2) جەخت لەوە دەکاتەوە کە بینینی خودا رووبەڕوو تەنها لە ژیانی ئەودنیادا کاری کردەیەو هەرکەسێ لەم دنیایەدا ئیدیعای ئەوە بکات درۆی کردووە[11].

له زۆر جێگای جیاجیادا یەهوە سەبارەت بە پەیوەندی قەومی یەهود لەگەڵ دراوسێ نایەهودیدا، بە ئاشکرا هەڵوێستی وەردەگرێ کە لە رۆژگاری ئەمرۆدا بە *Apartheid* (رەگەزپەرستی) ناودەبرێ. تەنانەت جارێك تووڕەبوونی لەسەر ئەوەی قەومی ئیسرائیل ژنیان لە غەیری یەهودی هێناوە (عەزرا)ی پەیامبەری جێگەی متمانەی لە ناڕەحەتیدا دەگەیەنێتە کەناری مەرگ:

"... لەبەرئەوەی لەوە ئاگادار بووم کە قەومی ئیسرائیل خۆیان لە خەڵکی ولاتەکانی جیا نەکردۆتەوە بەڵکو لە کچانی ئەوان ژنیان بۆ خۆیان و کوڕەکانیان هێناوەو منالی پیرۆزی خۆیان لەگەڵ پیسی و گلاویی نەتەوەکانی تردا تێکەڵ کردووە چاکی جبە و بەرگی خۆم لێ کرد بەلاداو مووی سەرو ریشی خۆم هەڵکەند و تا کاتی شێو بە سەرسوڕمانەوە دانیشتم، لە کاتی شێودا لە زەلیلکردنی خۆم راست بوومەوەو بە جلوبەرگی دڕاوەوە بە چۆکا هاتم و دەستم بۆ یەهوەی خودای خۆم درێژ کرد و وتم ئەی خودا، من خەجالەتم کە دەستبەرداری فەرمانەکانی تۆ بووم کە فەرمووتە ئەو زەویەی کە ئێوە (بەنی ئیسرائیل) دەچن بۆ دەستبەسەراگرتنی زەویەکە کە بەگلاوی نەتەوەی ولاتان گلاو بووەو ئەوانە بە پیسی و گلاوی خۆیان ئەمسەر تا ئەوسەر پڕیان کردووە، کەواتە کچانی خۆتان مەدەن بە کوڕەکانی ئەوان و کچانی ئەوان بۆ کوڕەکانتان مەهێنن و هەرگیز بەختیاری و سەلامەتیان بۆ داوا مەکەن بۆ ئەوەی خۆتان ئەم زەویە بخۆن و بۆ هەتا هەتایە بیکەنە میراتی کوڕەکانتان.. کەواتە عەزرا بە گریانەوە لەبەردەم مالی خودادا روخساری خستبووە سەر زەوی و عەشاماتێکی زۆر لە ژن و پیاوو منالانی ئیسرائیل هۆن هۆن دەگریان، (شکنیا)ی کوڕی یەحیائیل بە عەزرای وت کەواتە با ئێستا لەگەڵ خودای خۆماندا پەیمان ببەستین کە ئەم ژنانە و منالەکانیان لە خۆمان دووربخەینەوە.. پاشان لە رۆژی سێیەمدا کە رۆژی بیستی مانگی نۆ بوو هەموو پیاوانی یەهوداو بنیامین لە ئۆرشەلیم کۆبوونەوەو لە ترسی خودا و بە هۆی بارانی زۆرەوە دەلەرزین. ئەوسا عەزاری کاهین هەستاو پێی وتن ئێوە خیانەتتان کردووە و ژنی بیانیتان هێناوەو تاوانی ئیسرائیلتان زیاد کردووە.. کەواتە تەواوی ئەو کەسانەی لە شارەکانمان ژنی بێگانەیان هێناوە لە کاتی دیاریکراودا بێن و پیرو داوەرانی هەر شارە لەگەڵیان بێن بۆ ئەوەی تووڕە بوونی زۆری خودای ئێمە لەم بارەیەوە لەسەرمان هەڵگیرێ. پاشان لە رۆژی یەکەمی مانگی (دە)دا بۆ پشکنینی ئەم مەسەلەیە دانیشتن و تا رۆژی یەکەمی مانگی یەك کاری هەموو ئەو پیاوانەیان تەواو کرد کە ژنی بێگانەیان هێنابوو" (کتاب عزرا، باب نهم و دهم).

لە کاتێکی تردا خودا بە تەواوی ئەو پەیامبەرانە نائومێد دەکات کە چەندان جار خۆی وەحی بۆ ناردون و بەکەنالی پەیوەندی خۆی زانیون لەگەڵ قەومە هەڵبژاردەکەی خۆیداو هەموو بە درۆزن و فریودەر لە قەڵەم دەدات:

"من ئەم پەیامبەرانەم نەناردووە، بەلام ئەوان ئیدیعای پەیامی منیان کردووە. من قسەم

لەگەڵ نەکردون، بەڵام بەناوی منەوە دەستیان داوەتە پەیامبەریێتی.. قسەی ئەم پەیامبەرە درۆزنانەم بیستووە کە بەخەڵکیان دەوت یەهوە بە ئاشکرا یان لە دنیای خەوندا وای بە من وت.. هەتاکەی ئەم پەیامبەرانەی کە بە درۆ پەیامبەریێتی دەکەن شەرم ناکەن و بەسەر خۆیانی ناهێنن کە جگە لە پەیامبەری فریودەر هیچ شتێکی دیکە نین و بە گێڕانەوەی ئەو خەونانەی کە هەریەکەیان بۆ دراوسێی خۆیانی دەگێڕنەوە کاریێ دەکەن کە ناوی من لەبیری قەومەکەم ببەنەوە، هەروەکو چۆن باوکیان ناوی منیان لە یادی (بعل) بردەوە. ئەو پایامبەرەی بە ئاشکرا یان لە خەوندا منی دیووە بۆچی بەراستی خەونەکەی خۆی بەیان ناکات؟ ئەوەی کە قسەی منی پێیە بۆچی بە راستی قسەکەی من تەرجومە ناکات؟ ئاخر کا ئیشی بە گەنم چییە؟ ئێستا من دژی ئەو پەیامبەرانەم کە قسەی من لە یەکتری دەدزن و بە درۆ بڵاوی دەکەنەوە کە گوایە من وتوومە. من دژی ئەوانەم کە بە خەونی درۆ پەیامبەریێتی دەکەن و قەومەکەی من بە درۆ گومڕا دەکەن، چونکە من هیچ کام لەوانەم نەناردووە و ئەرکم پێنەسپاردون. لەبەرئەوەی قەومەکەی من دەپرسن وەحی خودا چییە؟ کەواتە پێیان بڵێ کام وەحی؟ ئەگەر بڵێن وەحی یەهوە، کەواتە من کە یەهوەم دەڵێم بە ئێوەم وتبوو ئیدیعای وەحی یەهوە دەکەن. بۆیە ئێستا هەمووتان فەرامۆش دەکەم و نەنگی و عاری هەمیشەیی و ریسوایییەکتان بۆ دەنێرم کە لەیادناکریێ (کتاب ارمیاء نبی، باب بیست و سوم، 21-40)[12]

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، شاکاری شاکارەکانی "یەهوەی خودا" شتێکی غەیری هەموو ئەمانەیە. شتێکە کە نەك تەنها لە مێژووی مەزهەبەکاندا، بەڵکو لە مێژووی جیهاندا بەشێوەیەکی گشتی، دیاردەیەکی تایبەتی و تاکە.

هەروەکو پێشان وتمان، لە کاتی کۆچی ئیبراهیمدا لە میزوپۆتامیاوە بۆ خاکی کەنعان خودا خۆی نیشاندەدا و پێی دەڵێت "دەمەویێ لەگەڵ تۆدا پەیمانیێ ببەستم کە منالی تۆ زۆر زۆر بکەم و تۆ بکەم بە باوکی گەلیێ نەتەوە و زۆر بەردارت بکەم و چەندان نەتەوە لە تۆ بخەمەوە و پاشایان لە تۆ بکەونەوە هەتا کاتی تۆو دوای تۆ و منالی تۆ خودا بم و زەوی غوربەتی تۆ یەعنی تەواوی زەوی کەنعان بکەم بە موڵکی هەمیشەیی تۆ و منالەکانت، بەو مەرجەی تۆش پەیمانەکە ببەیتەسەر کە لە دوای تۆ گۆشتی زیادەی زەکەری هەرنێرێك سونەت بکریێ (سفر پیدایش، باب هفدهم).

بەر لە هەمووانیش خودی ئیبراهیم لە تەمەنی 99 ساڵیدا خەتەنە دەکریێ. بەڵام وێڕای ئەو کێشەیە کە بۆچی زەکەری کوڕەکانی ئیسرائیل پەیوەندییەکی وەها چارەنووسسازی بە دامودەزگای خوداییەوە هەبووە، ئەم کێشەیەی تریش لە ئارادا بووە کە ئەو خاکەی کە خودا لە دەریای قەلزەمەوە هەتا دەریای فەلەستین و لە بیابانی سیناوە هەتا رووباری فورات بەشێوەیەکی سەربەخۆ و بۆ هەمیشە بە منالەکانی ئیبراهیمی بەخشیووە خاکێکی بێخاوەن و چۆڵەوانی نەبووە بەڵکو شوێنی نیشتەجێبوونی حەوت قەومی گەورە و دەیان

قەومی بچوکتر بووە کە ناوی هەموو ئەمانە ڕێك لە تەوراتدا هاتووە. لە هەلومەرجێکی وا بەپێی لۆجیك دەبوو بەر لە جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ئەو پەیماننامەیە ڕێوشوێنێکی باش و پەسەند بۆ گوێزانەوەی ئەو خەڵکەی کە بە هەرحال ئەوانیش بەندەی خودا بوون دابنرایە بۆئەوەی مالەکە بەشێوەیەکی بەویژدانانە و ڕەوا بۆ خاوەن موڵکە تازەکان چۆڵبکرایە. بەلام ڕێگەچارەی دەستنیشانکراوی یەهوە هەرگیز ئەمە نییە. ڕێگە چارەیەکی چاوەڕوان نەکراوی دیکەیە کە کتێبێکی تەواو لە کتێبەکانی تەوراتی بۆ تەرخان کراوە کە 34 باب و 800 بەندی لەخۆ گرتووە و بە وردی دەقە بە دەقەی ئەم مەسەلەیەی باس کردووە "پاشان موسا بە فەرمانی خودا دوانزە هەزار کەسی نارد بۆ شەڕی (مەدیان) و ئەوانیش هەموو پیاوەکانی مەدیانیان کوشت و ژن و منالەکانیان دیل کردنو هەرچی ئاژەڵ و موڵك و مالیان هەبوو هەموویان تالان کرد و خانووەکانیان سووتاندن پاشان دیل و تالانییەکانیان برد بۆ لای موسا و ئەلعازاری کاهین، موسا لە سەرانی لەشکرەکە تووڕە بوو کە بۆچی ژن و منالەکانیان بە زیندوویی هێشتۆتەوە، و وتی کەواتە ئێستا لە ناو منالەکاندا هەموو نێرینەکان بکوژن و هەر ژنێکیش کە پیاوێکی ناسیبێ بیکوژن، بەلام هەر کچێك کە پیاوێکی نەناسیووەو لەگەڵ پیاودا جووت نەبووە بۆ خۆتان بیهێڵنەوە" (سفر اعداد، باب سی و یکم، 1-18).

لە دوای مردنی موسا، خودا پەیوەندیی لەگەڵ سەرۆکی سوپاکەی موسا (یوشع کوڕی نون) دەکات و بەرنامەی جەنگی خۆی بۆ باس دەکات و وردەکاریی جێبەجێکردنی دەستنیشان دەکات: "... خودا لە دوای مردنی موسا رووی لە بەندەی خۆی یوشعی کوڕی نون کرد و پێیوت موسای بەندەی من مردووە، کەواتە هەستە و لە چەمی ئوردن بپەڕەرەوە، من هەروەکو بەڵێنم بە موسا داوە هەر شوێنێ کە تۆ پێی تێبخەیت پێت دەبەخشم، لە بیابانی لوبنانەوە هەتا رووباری فورات و تەواوی خاکی حتیەکان هەتا دەریای گەورە بەرەو خۆرهەلات، تۆ تەواوی ئەم قەومانە لە ناودەبەی کە تەسلیمی دەستی تۆیان دەکەم، نەبادا رەحمیان پێبکەی، چونکە یەهوەی خودات بەلەرزەیەکی گەورە پەرێشانیان دەکات بۆئەوەی بە دەستی تۆ لە ناو بچن و پاشاکانیان تەسلیمی دەستی تۆ دەکەم بۆئەوەی تەفرو تونایان بکەیت و ناویان لەسەر زەوی بسڕیتەوە. لێیان مەترسە لەبەرئەوەی یەهوەی خودای تۆ خودایەکی مەزنو ترسناکە" (سفر تثنیە، باب هفتم، 16-25) "خودا بە یوشعی وت ئەوا ئەریحا و پاشاکەی و پیاوە شەڕکەرەکانیم تەسلیمی دەستی تۆ کرد. کەواتە بۆ ئەوەی کە شارەکەت بە تەواوی داگیر کردبێ هەر گیانلەبەرێ کە لە شارەکەدایە لە پیاووژن و گەنج و پیر و مانگا و مەڕ و کەر هەموویان بە دەمی شمشێر لەناوبەرەو گیانلەبەری تیا مەهێڵەرەوە. تەواوی ئالتوون و زیوو قاپ و قاچاغی مس و ئاسن کە بە تالان دەستت دەکەویَ بە منی دەبەخشی. یوشع شارەکەی بە هەموو شتەکانییەوە سووتاند جگە لە رەحابی سۆزانی کە بە زیندوویی هێشتیەوە" (صحیفە یوشع، باب ششم، 2-25).

".. پاشان خودا بە یوشعی وت ئەوا موڵکی عای و هەموو قەومەکەی ئەوم دایە دەست تۆ. کەواتە هەموو پیاوە شەڕکەرەکانی خۆت بەرەو بڕۆ بۆ عای.. هەرکە شارەکەت داگیر کرد دوایی بیسووتێنە. شارەکە سووتاو یوشع و تەواوی ئیسرائیل پیاوانی عاییان کوشت بە جۆرێ کە کەسیان لێدەرنەچوو، چونکە یوشع دەستی هەڵنەگرت هەتا تەواوی دانیشتوانی عای لەناوبرد، بەڵام ئاژەڵ و تاڵانیەکانی ئیسرائیل بۆ خۆی برد بەپێی قسەی خودا کە بە یوشعی وتبوو. پاشان یوشع عای سووتاند و کردی بە وێرانە کە تا ئەمڕۆ ماوە" (صحیفە یوشع، باب هشتم، 22-25).

لە داگیرکردنی شاری عایدا وەکو هەمیشە بە فەرمانی یەهوە هەموو ئینسانەکان و ئاژەڵەکانی شار تەنانەت سەگ و پشیلەکانیش قەتڵو عام دەکرێن و خودی شارەکەش کاول دەکرێ. بەمپێیە یەهوە بە عیلمی خودایی خۆی هەست دەکات کە هێشتا شتێ ماوەو لەناو نەبراوەو یوشعی پەیامبەر لەبەر ئەم قسورکردنە دەداتە بەر گلەیی و گازندە. یوشع لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی فراوان هەستدەکات کە یەکێ لە جولەکەکان بەناوی عخانی کوڕی کرمی کوڕی زیدی کوڕی زارح شووشەیەك ئالتوون و دوو سەد پارچە زیوی لەناو نەبردووە و بۆ خۆی هەڵگرتووە. عخان بۆ خۆی دان بەم گوناهەدا دەنێ و ئالتوون و زیوەکە دەگەڕێنێتەوە، بەڵام بە فەرمانی یەهوە خۆی و ژن و منال و کەس و کاری و خزمەتکار و کەرو مەڕەکانی دەبەن بۆ دۆڵی ئاخور و لەوێ هەموویان بەردباران دەکەن و پاشان دەیانسووتێنن. (صحیفە یوشع بن نون، باب هفتم، 18-25).

".. پاشان خودا بە یوشعی وت: لە (ئەدونیەکان) مەترسە، لەبەرئەوەی ئەوانم دایە دەست تۆ. یوشع تەواوی شەو لە (جەلجال)ەوە ڕەوی کرد و لەپڕ دایبەسەریاندا خودا ئەوانی لەبەردەم ئیسرائیلدا تێکشکاند و لە جەبعون بە کوشتارێکی گەورە لەناوی بردن. لەبەرئەوەی لە بەردەمی ئیسرائیلدا هەڵدەهاتن خودا لە ئاسمانەوە بەردی گەورەی بەسەردا باراندن و مردن، ئەوانەی کە بەتەرزەی بەرد مردن لەوانە زیاتر بوون کە قەومی ئیسرائیل بە بەرد کوشتنی" (صحیفە یوشع، باب دهم، 9-11).

"ئیسرائیلیەکان قەومی موئابیان کوشت کە لەبەردەمیاندا هەڵاتن پاشان شارەکانیان کاول کرد و لەسەر هەر پارچە زەویەکی باش بەردیان هەڵداو لە کەڵکیان خست بۆ نیشتەجێبوون و تەواوی سەرچاوەکانی ئاویان کوێر کردەوەو هەموو دارە بەردارەکانیان بڕیەوە و لە شوێنی دارەکان بەردی قیریان دانا" (کتاب دوم پادشاهان، باب سوم، 24 و 25).

"پاشان یوشع (مەقیدە)ی گرت و بە فەرمانی خودا هەموو خەڵکەکەی بە نووکی شمشێر کوشت و کەسی لێ دەرنەکرد، پاشان بە تەواوی ئیسرائیلەوە شەری لەگەڵ (لینە) کرد و خودا ئەوێشی تەسلیمی ئیسرائیل کرد، پاشان هەموو ئەو کەسانەی کە تیایدا بوون بە نووکی شمشێر کوشت و کەسی نەهێشتەوە، دوای ئەوە چوو بۆ (لاخیش) و بە لەشکرەوە ڕووبەڕوویان بۆوەو شەڕی لەگەڵ کردن و خودا لاخیشی دایە دەست ئیسرائیل کە لە ڕۆژی

دووەمدا داگیرکراو یوشع هەموو ئەوانەی تیایدا بوون بە نووکی شمشێر کوشتنی. ئەوسا هورام پاشای جازر بۆ یارمەتی لاخیش هات و یوشع ئەو و قەومەکەی تێکشکاند، بەرادەیەك کە کەسی بۆ نەهێشتەوە، پاشان چوو بۆ عەجلون و لە هەمان رۆژدا گرتی و بە نووکی شمشێر لێیداو هەموو خەڵکەکەی کوشت لە ماوەی یەك رۆژدا هەروەکو لە لاخیش ئەو کارەی کردبوو. دوایی هێرشی بردە سەر حەبرون و شەڕی لەگەڵ کردن و رۆح لەبەری تیا نەهێشتن، هەروەکو یەهوەی خودای ئیسرائیل فەرمانی پێدا بوو. یوشع تەواوی ئەم پاشا و زەویانەی گرت چونکە یەهوەی خودای ئیسرائیل شەڕی بۆ ئیسرائیل دەکرد."

"شارێ نەبوو کە لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا ئاشتی کردبێ، چونکە لەلایەن خوداوە دڵیان رەق ببوو و خودا دڵڕەقی کردبوون بۆئەوەی رووبەرووی ئیسرائیل ببنەوە و خودا بە تەواوی لەناویان بەرێت و نەبێتە رەحمەت بۆیان، بەڵکو تەفرو توونایان بکات، هەروەکو خودا فەرمانی بە موسا دابوو (صحیفە یوشع، باب های اول تابیست و یکم).

لە دوای ئەمانەوە و لە بابی بیست و دووەوە هەتا بیست و چواری هەمان (صحیفەی یوشع)دا، (76) شاری تر ناوی دێت کە یەك بە یەکیان بە هەمان شێوە و بە فەرمانی یەهوەو بە چاودێری راستەوخۆی ئەوو هەندێ جاریش بە فەرماندەیی یەهوە دەستیان بەسەردا دەگیرێ و قەتڵ و عام و تالان دەکرێن و دەسووتێنرێن.

ئەم قەتڵوعامانە ئەوەندە بەلای یەهوەی خوداو قەومە هەڵبژاردەکەیەوە گرنگن کە تەنانەت جارێك خولانەوەی خۆر لە ئاسمان دەوەستێنێ بۆئەوەی دەرفەتێکی باشتر بۆ شوێنکەوتنی (ئامورییەکان) و کوشتنی هەموویان هەبێ" ئەوسا یوشع لە رۆژێکدا کە خودا ئامورییەکانی لە بەردەمی بەنی ئیسرائیلدا تەسلیم کرد، بە خۆری وت کە لەسەر (جەبعون) بوەستێ، و بە مانگیشی وت کە لەسەر دۆڵی (ئیلون) بوەستێ، پاشان خۆر وەستاو تەقریبەن سەراپای ئەو رۆژە پەلەی لە دابەزین نەکرد، و مانگیش وەستا تا قەومەکە باقی ئامورییەکانیان لەناوبرد" (صحیفە یوشع باب دهم، 12 و 13)[13]

گارلی توێژەری ئیتالیایی ناوەڕۆکی (صحیفە یوشع)ی تەورات بە وەرگرتنێك لە قەسیدە حەماسییەکانی ئاشوورییەکان دەزانێ کە باسی سەرکەوتنە خوێناوییەکانی پاشا ئاشوورییەکان دەکات. نموونەیەکیش لەو قەسیدانە ئێستا لە مۆزەخانەی شوێنەوارناسی بەرلین لەبەردەستدایە:

"بە یارمەتی عەشتار و ئاشوور و خودا گەورەکان و بە فەتوای کاهینە پیرۆزەکان بە لە شکر و عەرەبانە جەنگییەکانی خۆمەوە بە کێوەکاندا تێپەڕیم و بەرەو لای (کینابو) چووم، هێرشم کردە سەر شارو قەڵا سەختەکەی و داگیرم کرد. هەموو ئەوانەم بە شمشێر کوشت کە بەرگریان لە قەڵاکە کرد و سێ هەزار دیلم بە زیندوویی لە ئاگردا سووتاند و تەنانەت یەك کەسیشم نەهێشت تا بەکەڵکی بارمتە بێت. سەردارەکەی دوژمنم بە دەستی خۆم کەوڵکرد و پێستەکەیم بە دیواری شاردا هەڵواسی. ئەوسا بەرەو شاری (تلا) رۆیشتم کە بە چاکی قایم

کرابوو سێ دیواری هەبوو. وەکو هەورە بروسکە هێرشم بۆ برد و سەرەنجام کردمەوە. لە هەمان دەروازەی شاردا سێ هەزار عەسکەرم سەربڕی، پاشان زۆری دیکەم لە ئاگردا سووتاند. دیلێکی زۆریشم گرت کە دەستی هەندێکیان و لووت و گوێی هەندێکی تریانم بڕی و چاوی زۆریانم دەرهێنا. لەلاشەی کوژراوەکان گردم دروست کرد و سەرەکانیانم بە دەرەوەی شاردا هەڵواسی و گەنجان و کچانم بە زیندوویی لە ئاگردا سووتاند. کارێکم کرد کە هەردوو خودای گەورە، ئاشوور و عەشتار، لە من ڕازیبوون" (بەردەنووسی ئاشوور نەزیرپال *Assurnazirpal* پاشای ئاشوور لە سەدەی نۆهەمی پێش زایندا).

بەو حوکمەی مێژوو دووبارە دەبێتەوە لە سالأنی دووەم جەنگی جیهانیشدا هەولێ لەم بابەتە لەلایەن (میللەتێکی بالا)ی ترەوە بە لۆجێکی (فەزای ژیانیی) ئەنجامدرا کە ملیۆنەها کەس لە پۆڵەندەو ڕوسیا و وڵاتەکانی تری ئەورووپای خۆرهەڵات بوون بە قوربانی، بەڵام ئەمجارە پیاوکوژەکان مۆڵەتی یەهوەیان بەدەستەوە نەبوو و خەتەنەش نەکرابوون!

* * *

هەروەکو پێشان وترا لە ئینجیلدا، خودا بەو پێیەی خودای عیسا بێت یان خودای پایولوس قەشەی (سینت پول) کە نووسەری تەقریبەن نیوەی (پەیمانی نوێ)یەو ڕێکخەری راستەقینەی ئایینی مەسیحیەتە، دوو کارەکتەری دژبەیەکی هەیە. لەو بەشەدا کە نوێنەرەوەی مامەڵە فکری و مەزهەبیەکانی پایولوس-ە رزگاری هەر ئینسانێ بە پلەی یەکەم بەپێی پلەی باوەڕی ئەو کەسەیە، و ئەمەش پرەنسیپێکە کە لەلایەن کڵێساشەوە تەئکیدی لێکراوەتەوە، لە کاتێکدا لەو بەشەی تردا کە نوێنەرەوەی بیرو بۆچوونەکانی خودی عیسایە تەنانەت مەسیحی بوون و باوەڕ بە عیساش بۆ رزگاری وەکو مەرجی بنەڕەتی لە قەڵەم نەدراوە، بەڵکو ئەو مەرجە تەنها بە خۆشەویستی کەسانی دی و خۆشویستنیان لە قەڵەم دراوە. چەندین جار لە ئینجیلەکاندا لە زمانی عیساوە گێڕدراوەتەوە کە هەر کەسێ بە خۆشەویستیەوە بژی لە دڵی خودادایە و خوداش لە دڵیدایە. دیسان ئەوە هاتووە کە ئەگەر کەسێ بە دڵپاکی منالأنەوە مەلەکوتی خودا قبوڵ نەکات هەرگیز ڕێگای خودا نادۆزێتەوە( مەتی، باب نوزدهم، 13-15،مرقس، باب دهم، 15، لوقا، باب هجدهم، 16 و 17)، بەڵام لە بەشی (یەهودی) پەیمانی نوێدا دەربارەی شێوەی پەیوەندی مەسیحیەکی باوەڕدار لەگەڵ حکومەتی دەستەی فەرمانڕەوادا هاتووە کە "هەروەکو چۆن بە دڵسۆزی و ڕێزەوە ملکەچی فەرمانەکانی مەسیحی ئاواش ملکەچی فەرمانی فەرمانڕەواکانی خۆت بە، ئەمەش لە ڕێگەی ماستاوچێتیەوە نەکەی، بەڵکو بەو باوەڕەوە بیکە کە وەکو نۆکەرەکانی عیسای مەسیح لەم ڕێگەیەوە ئیرادەی خودا جێبەجێ دەکەی، چونکە فەرمانڕەوایانی جیهان بە ئیرادەی خودا نەبێت بۆ ئەو پلە و پایەیە دەستنیشان ناکرێن" (رسالە پائولوس رسول بە افسیان، باب ششم، 5)، لە کاتێکدا لە چوار ئینجیلەکەدا لە زمانی عیساوە هاتووە کە "کەس ناتوانێ بەندەی دوو

گەورە بێت. ئێوەش یان بەندەی خودابن یان بەندەی ئالتوون" (متی، باب ششم، 24، لوقا، باب دوازدهم22).

دوو توێژەری ناوداری ئەڵمانی (شتاوفیرو ئولریت) دەربارەی ئەم ناکۆکیە نووسیویانە کە ئەگەر مامەڵەی ئینجیل لە نامەکانی پایولوسدا بکەینە بنەما، دەبێ نەک تەنها (نیرۆن)ی سەردەمی خودی ئەو، بەڵکو هەموو جەللادە خاوەن تاجەکانی مێژوو وەکو هەڵبژاردەی خودا بە پیرۆز تەماشا بکەین. لە بەشی "تەوراتی" پەیمانی نوێدا ئەوانەی کە دەبێ رزگاربن لە پێشدا لەلایەن خوداوە دەستنیشان کراون (رسالە پائولوس بەرومیان، باب هشتم، 30)، لە کاتێکدا لە بەشی ئینجیلی پەیمانی نوێدا هەموو کەسێ دەتوانێ بە خۆشەویستی خۆی بکات بە شایستەی مەلەکوتی خوداو لەوێدا نزمترین کەس بە ئاسانی دەگاتە لای مەلەکوتی خودا، مەلا ریاکارەکان چەندەش ئاشنای یاسا و شەرعەکانی کتێبی پیرۆز بن نەک تەنها ناگەنە لای ئەو مەلەکوتە ئاسمانییە، بەڵکو دەرگاکانی قەڵەمڕەوی خودا لەبەردەمی کەسانی تریشدا دادەخەن. (متی، باب بیست و سوم، 34، لوقا، باب یازدهم 52، مرقس باب دوازدهم، 40).

لە بەشی (یەهودی) ئینجیلدا، خودا هەمان ئەو خودا خود سەرو بێڕەحم و ڕەقەیە کە لە تەوراتدا خۆی دەنوێنێ و پاشان دەتوانین لە قورئاندا بە شێوەیەکی ڕەهاتر و بە دەسەڵاتتر بەدی بکەین. لەم بارەیەوە لە ئینجیلدا هاتووە "خودا دەفەرمووێ پشتیوانیم لە یەعقوب کرد چونکە خۆشم دەویست، بەڵام رقم لە (عسو)ی برای بوو کە دوانە بوون و بەیەك سك لەدایك بووبوون. بە فیرعەون دەڵێت بۆیە تۆم خستە ئاگرەوە تا بە هۆی تۆوە دەسەڵاتی خۆم نیشان بدەم و ناوم لە سەرانسەری جیهاندا بڵاوبێتەوە. یەکێ لە ئێوە بە من دەڵێت: کەواتە بۆچی خودا ڕەخنە لە ئێمە دەگرێ، چونکە کێ دەتوانێ ڕێ لە ئیرادەی ئەو بگرێ؟ بەڵام ئەی مرۆڤ تۆ کێی کە وەڵامت لە خودا دەوێ؟ ئایا گۆزە لە گۆزەگەر دەپرسێ بۆچی بەم شێوەیە منت دروست کرد؟ چی دەبێ ئەگەر خودا بە سەبری زۆرەوە بیەوێ تەحەمولی کەسانێ بکات کە لێیان تووڕەیە بەڵام شایانی کوشتن نین، بۆ ئەوەی لەو ڕێگایەوە هەم غەزەبی خۆی نیشان بدات و هەم دەسەڵاتی خۆشی بخاتە ڕوو؟ چی دەبێ ئەگەر خودا بیەوێ مەزنی و شکۆداری خۆی بۆ ئەو کەسانە دەربخات کە لەبەر ڕەحمەتی ئەودان و پێشان و بۆ ئەو شکۆمەندییە ئامادەی کردوون. (رسالە پائولوس رسول بەرومیان، فصل نهم، 22 و 23)[14].

لە جێگایەکی تردا هەمان پایولوس دەڵێت "هیچ مرۆڤێ ناتوانێ خۆبەخۆ خودا بدۆزێتەوە یان مەیلی بکات، چونکە ئەمە پێویستی بەوە هەیە کە خودا پێشان ڕووی لەو کردبێ" ئەمەش ڕاست هەمان مامەڵەیە کە لە دەیان ئایەتی قورئاندا ڕەنگیداوەتەوەو دەتوانرێ بەدیبکرێ. بە پێچەوانەی ئەمەوە لە چەند جێگایەکی جیاجیای بەشی "عیسایی" ئینجیلدا ئەم بۆچوونە ڕەنگیداوەتەوە کە خودی مرۆڤ دەتوانێت بە خۆشەویستی خودا بەلای خۆیدا رابکێشێ. یاسپرێس توێژەرەوەی دیاری

کتێبی پیرۆز لە هەڵسەنگاندنی ئەم دوو مامەڵە جیاوازەی ئینجیلدا سەبارەت بە ڕۆڵی خودا لە ژیانی مرۆڤدا دەنووسێت:

"ئەوەی پایولوس بە تەشبیهی بالاّ و ترسناك دەریبڕیووە هەتا ئەمڕۆ متمانەی خۆی لە بیروباوەڕی مەسیحیەتدا پاراستووە. قەشە ئۆگەستین (سین ئوگەستین) ئەم پرەنسیپی نەبوونی ئیختیار و قەدەری ئەزەلییەی خودای وەکو پرەنسیپێکی راست قبوڵ کردووە. مارتن لوسەر و کالونیش وەکو ئەو ئەم گریمانەیەیان کرد بە ناوکی ئێستای قوتابخانەی مەزهەبی خۆیان. ئەم باوەڕە لەوەدا کورت دەبێتەوە کە ڕزگاریی یان گومڕایی هەمیشەیی هەر مرۆڤێ تەنانەت بەر لە گیرسانی تۆو دروستبوونی دەستنیشان کراوە، بەم پێیە چارەنووسی مرۆڤ پەیوەست نییە بە خودی ئەوەوە، بەڵکو ڕێك پەیوەستە بە تووڕەیی یان ڕەحمەتی خوداوە".

هەروەکو پێشان وترا لە قورئاندا، خودا نە خودای هەزار ڕوخساری تەوراتە، نە خودای دوو کارەکتەری ئینجیل، بەڵکو خودایەکە تا ئەوپەڕی سەربەخۆیە کە لە بنەڕەتدا ئەو پرسیارانەی دەتوانن سەبارەت بە دوو ئاینە یەکتاپەرستیەکەی تر بیکەن، لە بارەی ئەمەوە ناکرێ، چونکە لە دەرەوەی ئەم خودایە لە بنەڕەتدا هیچ واقیع و هیچ ئەگەرێکی تر وجودی نییە. هیچ تەڕو وشکێ نییە کە پێشان لەسەر لەوحی پارێزراوی ئەم خودایە تۆمار نەکرابێ و هیچ گەڵایەك نییە کە بەبێ مۆڵەتی ئەو لە دارەکەی بەربێتەوە. بە فەرمانی ئەو نەبێ هیچ کەسێ نایەتە دنیاوەو بە فەرمانی ئەو نەبێ نامرێ و بەبێ مۆڵەتی ئەو شادی نایەتە ڕێ یان تووشی بەڵا نابێ. هەموو سەربەرزییەك لە خوداوەیەو هەموو سەرشۆڕییەکیش لەوەوەیە. هەرکەسێ ڕزگاربێ ئەو ڕزگاری کردووەو هەرکەسێ گومڕا بێت ئەو گومڕای کردووە. هەر کەسێ مسوڵمان بێت بە خواستی ئەو مسوڵمان بووە و هەرکەسێکیش بە کافری بمێنێتەوە لەبەرئەوەیە کە خودا ئەوی بە کافری ویستووە. خودی ئەوە کە میهر دەخاتە دڵانەوەو پەردە بەسەر گوێ و چاوانی مرۆڤدا دەدات بۆئەوەی بە گوناهباریی بمێنێتەوە. کاتێ دەبێ خەڵکی شارێ لەناو بچن خودا تۆبەکردنیان لە کفر لێ حەرام دەکات. کاتێ دەبێ هەورەتریشقە غەزەبی خۆی بۆ قەومێ بنێرێ خودا کاربەدەستانی ئەو قەومە بەرەو ڕێگای بێ ڕەوشتی دەبات بۆ ئەوەی شایانی سزا بن، و پاش لەناوبردنی ئەو قەومەش قەومی تر دەهێنێتە ئاراوە و ئەوانیش یەك لەدوای یەك لەناودەبات بۆ ئەوەی چارەنووسی هەر قەومێ ببێ بە پەند بۆ کەسانی دی. تەنانەت جلوبەرگی مرۆڤیش بە فەرمانی خودا بۆی دەدورێت مال و چادری مرۆڤیش بە فەرمانی خودا دروست دەکرێ و هەڵدەدرێ. ئەوە خودایە کە لە لق و گەڵای درەختەکان یان لە دامێنی شاخەکان لە بەرامبەر تیشکی خۆردا کەپر بۆ مرۆڤ دروست دەکات. ئەوە خودایە کە باخ و زەویە کشتوکالیەکان دابەش دەکات بۆ کێڵگەی گەنم یان ڕەز و باخی خورما، دیسان ئەوە خودایە کە هەندێ لە میوەکان لە هەندێکی تر باشتر دەکات بۆ خواردن. لە سی و دوو سورەت و زیاتر لە دووسەد ئایەتی قورئاندا

بەشێوەیەکی بەردەوام تەئکید لە هەموو ئەمانە کراوەتەوە:

"خودا بیەوێ هەرکەسێ بەرەو گومڕایی بە کێش بکات دەیکات و بیەوێ ڕێنمانی هەرکەسێ بکات دەیکات" (ابراهیم، 4، الانعام، 125، الرعد 37، الاعراف 155، الفاطر، 8، النحل، 9، السجده، 12، یوسف، 110) "خودا هەر کەسێکی بوێ تێیدەگەیەنێ و نەشیەوێ کەس تێناگەیەنێ" (البقره، 255، 269، 372) "خودا بیەوێ هەرکەسێ موسڵمان بکات دڵی بەلای ئیسلامدا رادەکێشێ و نەشیەوێ کەسێ موسڵمان بێت دڵی لە بەرامبەر ئیماندا ڕەق دەکات" الانعام، 25، 107، 125، الکهف، 57، البقره، 70، یونس، 99 و 100، الجاثیة 33)دا هەرکەسێکی بوێ دەیخاتە ناو ڕەحمەتی خۆیەوەو دەیبەخشێ، هەرکەسێکی بوێ ئەشکەنجەی دەدات" (ال عمران، 74، 129، المائده، 18) "هەرکەسێکی بوێ ئازیزی دەکات و هەرکەسێکی بوێ زەلیلی دەکات، هەرکەسێکی بوێ هەموو شتێکی دەداتێ و هەر کەسێکی نەوێ هەموو شتێکی لێوەردەگرێتەوە". (ال عمران، 26، الاسراء، 21، 30)، "هەرکەسێ کە خودا زەلیلی بکات ئیدی هیچ کەسێ ناتوانێ بەڕێزی بکات" (الحج، 16 و 18) "خودا هەرکەسێکی بوێ دەیخاتە خۆشگوزەرانیەوە هەرکەسێکیشی بوێ دەیخاتە تەنگانەوە" (الرعد، 26، العنکبوت، 62، الروم، 37، سبأ، 39، النور، 21، 38، 46) "ئێمە هەندێ کەسمان بەسەر هەندێکی تردا زال کردووە بۆئەوەی هەندێ لەوان ئەوانی تر بخەنە خزمەتی خۆیانەوە" (الزخرف، 32) "خەیال و ئارەزوویەکی نابەجێ دەکات لەو سیفەتەدا کە خودا بە هەندێکی بەخشیووە بۆ ئەوەی لە هەندێکی تر بالاتر بن" (النساء 32) "بنوارە چۆن هەندێ کەسمان بەسەر هەندێکی تردا بالادەست کردووە، هەڵبەتە لە ڕۆژی دواییدا بالایی زیاتر بە هەندێ دەدەین بەسەر هەندێکی تردا" (الاسراء 21) "کاری خودا وەهایە هەرچی ویستبێ دەیکات" (ال عمران، 40) "لە کاری خودادا ناتوانرێ چەند و چوون بکرێ" (الانبیاء 23) "هیچ ژن و پیاوێکی باوەڕدار بۆیان نییە ڕەخنە لەو کارە بگرن کە خوداو پەیامبەری خودا حوکمی پێدەکەن" (الاحزاب، 36) "هیچ بەڵایەکتان تووش نابێ بە ئیزنی خودا نەبێ" (التغابن، 11) "هەر کەسێ خوازیاری دنیا بێ خۆشگوزەرانی دنیای دەدەینێ – هەڵبەتە بەو مەرجەی ئێمە خۆمان وامان ئیرادە کردبێ – ئەوسا دۆزەخی بە نسیب دەکەین بۆ ئەوەی تیایدا بسووتێ" (الاسراء، 18).

لە چەند جێگایەکی جیاجیای تردا، ئەوە ڕاگەیەنراوە کە کاتی دەقیقی لەدایکبوون و مردنی هەر مرۆڤێك و هەرچی لە نێوان ئەو دوانەدا بەسەری دێت پێشان لە (لەوحەی پارێزراوی) خودادا تۆمارکراوە و بە هیچ جۆرێ قابیلی گۆڕان نییە: "هیچ کەسێ تووشی بەڵا نابێ ئەگەر خودا مەیلی لەسەر نەبێ" (البقره، 102) "گەڵای درەختێ بەبێ ئاگاداری ئێمە ناکەوێتە خوارەوە، هیچ تۆوێك لە ژێر تاریکی زەویدا نییە و هیچ تەڕو وشکی نییە ئەگەر لە (لەوحەی پارێزراوی) ئێمەدا تۆمار نەکرابێ" (الانعام، 59) "مسقالە زەڕەیەك لە ئاسمان و

زەویدا نییە ئەگەر لە (لەوحەی پارێزراوی) ئێمەدا نەنووسرابێ" (سبأ، 30، النمل 74، القمر، 52) "هیچ کەسێ بە فەرمانی خودا نەبێ لەو کاتەدا نامرێ کە ئەجەلی بۆ دیاری کراوە" (ال عمران، 145، الفاطر، 11، الانعام، 2، لقمان، 34) "ئەوانەی کە دەبێ بکوژرێن ئەگەر لە مالی خۆشیاندا بن بەپێی خۆیان دێن بۆ کوشتارگە" (ال عمران، 154) "هەموو کاروبارەکانی دنیا بەر لەوەی رووبدەن و پاش ئەوەش بەپێی ئەمری خودان" (الروم، 4) "هەرچی دێتە رێتان، یان لە خودی خۆتانەوە تووشتان بێت، بەر لەوەی رووبدات لە کتێبی ئەزەلی خودادا بڕیاری لەسەر دراوە" (الحدید 22) "ئێمە خۆمان بۆ هەر پەیامبەرێ چەند دوژمنێکمان لە مرۆڤ وجن و شەیتان راست کردۆتەوە، هەڵبەتە ئەگەر نەمانویستایە وانەدەبوو" (الانعام، 112).

ئاژەڵان تەنها بۆ ئەوە دروست کراون کە بۆ سواری و گوێزانەوە و جل و بەرگ و خواردن مرۆڤ سوودیان لێوەربگرێ و کەشتیش بۆ ئەوە دروست کراوە کە کۆچەران سواری ببێت لەم بارەیەوە سوپاسی خودا بکەن کە نیعمەتی پێداون. هەڵبەتە گیاندارەکانی تری سەر زەوی تەنها بۆ سوودی مرۆڤ دروستکراون:

"هەموو زیندەوەرانی سەر زەویمان بۆ سوودی ئێوەی مرۆڤ دروست کردووە" (البقره، 29) "ئەسپ و هێستر و کەرمان دروست کردووە بۆ ئەوەی سواریان بن" (النحل، 8) "ئاژەڵانمان دروستکردووە بۆ ئەوەی سوود لە موو خورییان وەربگرن و گۆشتیان بخۆن و بارە قورسەکانی ئێوە لە شارێکەوە ببەن بۆ شارێکی تر کە ئێوە بە ناڕەحەتی نەبێ ناتوانن هەڵیان بگرن" (النحل، 7)، بۆ سواری ئێوە کەشتیمان دروست کرد بۆئەوەی سواریان بن و سوپاسی نیعمەتی ئێمە بکەن" (الزخرف، 12)، "ئەگەر بمانەوێ با دەخەین و دەیوەستێنین بۆئەوەی کەشتیەکان لە جوڵە بکەون" (الشوری، 33) "ئێمە بەپێی پێویست لە ئاسمانەوە ئاومان نارد بۆ زەوی و لەسەر زەوی هێشتمانەوە لە کاتێکدا دەمانتوانی لەناوی بەرین، بە بەرەکەتی ئەو ئاوە رەز و دارخورمامان دروست کرد بۆ ئەوەی میوەی خۆراکی خۆتانی لێ بەدەست بێنن. دارێکیشمان رواند کە لە کێوی سیناوە دێت و میوەیەکی پڕ رۆن (زەیتون) دەهێنێتە بەر بۆ مرۆڤ. هەروەها مانگا و مەڕمان دروست کرد بۆئەوەی ئەو شیرە بخۆن کە لە گوانیان دێت و سوودی تری لێوەربگرن و گۆشتیشیان بخۆن، و لە کاتی پێویستیشدا بۆ سواربوون و شت گوێزانەوە بەکاریان بێنن، هەروەکو بە کەشتی سەفەر بکەن" (المؤمنون، 18-22).

سەبارەت بە سادەترین کاروباری رۆژانەش مرۆڤ هەموو دەسەڵاتێکی لێ زەوت کراوەو تەنانەت لە چەند مەسەلەیەکی وەکو شوێنی نیشتەجێبوون و جل و بەرگ و خۆراك و زەرعات و کاردا هیچ رۆڵێك بۆ مرۆڤ لەبەرچاو نەگیراوە "جلوبەرگمان بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی لە سەرماو گەرما بتانپارێزێ، بۆ نیشتەجێبوونی هەمیشەیی خانوومان بۆ دروست کردوون و بۆ نیشتەجێبوونی کاتی چادرمان بۆ دروست کردوون لە پێستی ئاژەڵان بۆئەوەی لە کاتی جووڵەدا بار سووك بن، لە خوری و کوڵك و مووی ئەو ئاژەڵانە کەلوپەلی

ناومــال و شمــەكی جیاوازمــان بــۆ دروســت كردوون (النحل، 80) لە شاخ ودۆڵەكاندا چەند ڕێگایـەكمان بـۆ هاتوچـۆی ئێـوە ئامـادەكردووە (الانبیـاء، 31) بـۆ پاراسـتنی ئێـوە لـە گـەرما لـە درەخـت كـەپرمان بـۆ دروسـت كـردون و شـاخ و ئەشكەوتەكانمان كـردووە بـە لەمپـەر بۆتـان لـە بەرامبــەر تیشــكی خــۆردا (النازعــات، 32)، زەویمــان كــردووە بــە چــەند پارچــەیەكەوە بۆئـەوەی بەشێكی ڕەز بێ و بەشێكی كێڵگـەی دانەوێڵەو بەشێكی تـری دارخورما (الرعد، 3). هەنـدێكیانمان بـۆ خـواردن لـەوانی تـر باشـتر كردووە (الرعد، 4).

چەند ئایەتێكی تر لە قورئان تەئكیدیان لەو مەســەلە سەرســوڕهێنەرە كردۆتــەوە كــە ئــەوە خـودی خودایـە كـە كەسـانێ بـەرەو ڕێـی ڕاسـت دەبات بۆ ئەوەی شایستەی چوونە بەهەشت بن، كەسانێكیش بەرەو گوناهكاری دەبات بۆ ئەوەی شــایانی دۆزەخ بــن، چــونكە بــەڵێنی خــودا پاشگەزبوونەوەی تێدا نییە كە دۆزەخ پڕ بكات لە مرۆڤ و جنۆكە".

"ئێمـە خۆمـان پـەردەمان خستۆتە سـەر دڵـی هەندێ كەس بۆئەوەی لە بیستنی قسـەی حەقدا گوێیان قورس بێت (الانعام، 25، الاسراء، 46، الاعــراف، 100) "مۆرمــان داوە لــە دڵتــان و پەردەمان بۆ گوێ و چاوتان داناوە (البقرە 6 و 7) "ئەگـەر بمانویسـتایە هـەموو خـەڵكمان بـۆ ڕێـی ڕاست ڕێنمـایی دەكرد بەڵام بـەڵێنی ئێمـە پاشگەزبوونەوەی تێدا نییـە كـە جەهەننـەم پـڕ بكــەین لــە مــرۆڤ و جنۆكــە" (الانعــام، 128 و 149، هــود، 118 و 119، الاعــراف، 178 و 179، السـجدە 13، النسـاء، 10 و 14، التوبـە، 68، العلـق، 15) ئەگـەر بمانویسـتایە تـەواوی بەشـەریەتمان بەیـەك نەتـەوە دروسـت دەكـرد، بـەڵام وامـان نـەكرد بـۆ ئـەوەی هـەر كەسـێكمان بوێ بیخەینـە نـاو بازنـەی ڕەحمـەتی خۆمانـەوە (الشـوری، 8) "هـەر كەسـێ خـودا گەیانـدی بـە گـومڕایی، ئیـدی هـیچ كەسـێ نەبێتـە ڕێنمـایی كـەری و هەمیشـە لـە گومڕاییـدا بمێنێتـەوە" (الاعراف، 30 و 186، النسـاء، 143، الزمـر 23 و 36، الرعــد،33، الغــافر، 33، الفــاطر، 8، المدثر،31، الشعراء،4)، ئەگەر خودا بیویستایە ئەوان نەدەبوون بە موشریك، بەڵام ئێمە خۆمان چاوو دڵیانمان لە بینین و بیستنی حەق بەدوور گرتـووە" (الانعـام، 107 و 110). "هـەتا ڕۆژی قیامـەت دوژمنایـەتیمان لـە نێوانیانـدا دروسـت كردووە" (التحریم، 1).

شان بە شانی ئەو یاسایەی كە بەشێوەیەكی فــەردی بەســەر ئینســانەكاندا فەرمانڕەوایــە، یاسایەكی وەك ئەوەش بەسەر ژیانی بە كۆمەڵی قــەوم و میللــەتانی جیهانــدا فەرمانڕەوایــە "بروســكەی غــەزەبی خۆمــان بەســەر هــەر قەومێكدا كە بمانەوێ دەبارێنین" (الرعد، 13) "ئەگـەر بمانـەوێ خـەڵكی ناوچەیەك لەناوبـەرین فـەرمانڕەواكانیان ناچـار دەكـەین كـە ڕێگـای بێڕەوشــتی بگرنــە بــەر بۆئــەوەی شــایانی ســزادان بــن، ئەوسـا تـەفروتونایان دەكـەین. (الاسـراء، 16 و 17) " تۆبـەكردن لـە كفـر بـۆ خــەڵكی ئــەو شــارە حەرامــە كــە پێویســتە تـەفروتونا بكرێن" (الانبیـاء، 95) "لـە ملیانـەوە هــەتا چــەناگەیان زنجــیری ئەشــكەنجەمان تێكردووە و ڕێگەی پێش و دوامان لێگرتوون و پەردەمان داوە بەسەر چاوو دڵیاندا، (یس، 7-

10) "بایەکی قایممان نارد کە حەوت رۆژ و حەوت شەو بەسەریاندا زالبوو، هەموویان پێکەوە وەکو قەدی دارخورمایەکی وشك کەوتنە خاکی لەناوچوونەوە" (الحاقە، 6 و 7) "لە دوایانەوە هەورە بروسکەی ئاگر بەرپابوو لە کاتێکدا نە توانای راکردنیان هەبوو نە یارمەتیدەرو فریادرەسیان دەسکەوت" (الذاریات 44، 45) "بۆ تەفر و توناکردنیان هاوارێکمان لە ئاسمانەوە نارد کە هەموویان وەکو گیا وشك بوون" (القمر، 31) "کورەی ئاگر بەسەریاندا کلپە بکات" (هود، 40) "عەزابی خودا لە شێوەی بایەکی ترسناکدا رووی تێکردن هەر کە رۆژ بۆوە جگە لە مالی کاول هیچ شوێنەوارێکیان لێنەمایەوە" (الاحقاف، 24، 25) "رووناکیمان لە چاوانیان بڕی و وتمان ئیتر عەزابی توورەبوونی ئێمە و تۆڵەکردنەوەمان بچێژن" (القمر37-39) "بومەلەرزەیەکی قورسمان نارد کە لەگەڵ خۆیدا مەرگی راستەقینەی بۆ هێنان (العنکبوت، 37) "بایەکی قاعیی پایزمان بۆ هەڵکردن کە بەر هەرچیەك دەکەوت وەکو ئێسقان دەیرزاند" (الذاریات، 41 و 42) "بەردبارانی عەزابمان بۆ ناردن (الحجر، 73، 74) "سوێند بە ئاسمانی بڵند و سوێند بە رۆژی میعاد، هەموو خاوەن سنوورێکمان کوشت" (البروج، 1-4) "جگە لە نوح و یارانی هەموویانمان لەناو دەریای مەرگدا سوڕاندەوەو دیارە خودای تۆ خودایەکی بەرەحمە (الصافات، 82) " جگە لە خانەوادەکەی لوت قەومی لوتمان بە بەردبارانی عەزاب لەناوبرد، دیارە خودای تۆ بە توانا و میهرەبانە" (الشعراء، 172، 173) "لە دوای لەناوبردنی ئەوان قەومی دیکەمان دروست کرد، ئەوانیشمان یەك لە دوای یەك خستە خاکی لەناوبردنەوە بۆ ئەوەی چارەنووسی هەرقەومیٚ بکەین بە عیبرەت بۆ ئەوانی دی" (المؤمنون 31 و 41) "اصحاب الحجر، پەیامبەرەکانی ئێمەیان بە درۆ خستەوەو بۆ هەڵاتن لە مەترسی لە شاخەکان نیشتەجیٚ بوون، بەڵام ئێمە سەر لە بەیانیەك بە هاواری عەزاب لەسەر ئەو کێوانە تەفروتونامان کردن" (الحجر، 80) "قەومەکەی عاد سەرکەشیان کرد و ئێمە بە بایەکی قایم لە رۆژانی شووmدا عەزابی زیللەتمان پێچەشتن" (الاعراف، 73) "قەومەکەی هود حوشتری سالحیان زویر کرد پاشان بوومەلەرزەیەکمان بۆ ناردن کە لەناو مالەکانیاندا هەموویانی کوشت (الاعراف، 74)، "قەومەکەی شوعەیب-مان وەها تەفروتونا کرد وەك ئەوەی هەرگیز لەسەر زەوی نەبووبن" (هود، 94) "هەروەها یارانی (رس) و زۆر قەوم و تایەفەی ترمان لە سزای کردەوەکانیاندا لەناو برد" (الفرقان، 38) "قارونمان لەگەڵ هەموو ئاوات و مال و حالەکەیدا برد بە ناخی زەویدا" (القصص، 81)[15].

لە چەند جێگایەکدا ئەوە باسکراوە کە ئامانجی خودا لە رووداوە باش و خراپەکان کە بەسەر موسڵمانەکان دێت و تێگەیشتن لە هۆی ئەو رووداوانە بۆ موسڵمانەکان دژوارە، تاقیکردنەوەی رادەی باوەڕی ئەوانە، لە کاتێکدا چەندان جار ئەوە لە قورئاندا هاتووە کە باوەڕ بوون یان باوەڕ نەبوونی خەڵك بە خودا پەیوەستە بە ئیرادەی خوداوە و ئەوان لەم بارەیەوە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە. دەربارەی

هەردوو شەڕی (ئوحد و بەدر) کە یەکەمیان بە شکست و دووەمیان بە سەرکەوتنی موسڵمانان تەواو بوو هاتووە "ئەگەر لە جەنگی ئوحددا زیانتان بەرکەوت و بە پێچەوانەی ئەمەشەوە لە جەنگی (بەدر)دا زیانێکی زۆر بەر دوژمنانتان کەوت، لەبەرئەوەیە کە ئێمە سەرکەوتن و شکست بەو ئاراستەیە لە ناو خەڵك دەسوڕێنینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە کامانەن" (ال عمران، 140) "ئەو ڕۆژەی کە لە شەڕی ئوحددا دوو گروپ ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە ئەو زیانەی بەر ئێوە کەوت بە ئیزنی خودا بوو بۆ ئەوەی بزانێ باوەڕداران کێن و منافقان کێ" (ال عمران، 166).

" لە شەڕی بەدردا خودا یارمەتی ئێوەی دا، لە کاتێکدا جگە لە چەند کەسێکی بێدەسەڵات هیچ نەبوون.. کاتێ تۆ بە موسڵمانانت وت ئایا ئەوەندەتان بەس نییە کە پەروەردگارتان سێ هەزار فریشتەی نارد بۆ یارمەتیدانتان، ئەگەر لە خودا بترسن و سەبر بکەن لە کاتێکدا دوژمنان هێرش دەکاتە سەرتان خودا پێنج هەزار فریشتەی تر دەنێرێ بۆ یارمەتیدانتان کە هێرشیان پێبکەن، خودا واینەکرد بۆئەوەی مژدەی هەواڵێکی خۆشتان بداتێ تا دڵتان ئارام بێتەوە" (ال عمران، 125 و 126)[16] "ئێمە ئەو قیبلەیەمان گۆڕی کە پێشان تۆ ڕووت تێدەکرد بۆ ئەوەی تێبگەین چ کەسێ پەیڕەوی پەیامبەر دەکات و چ کەسێ دژی دەوەستێتەوە" (البقرە، 143)، "ئێمە ئەسحابی کەهفمان لە خەو هەستان بۆ ئەوەی بزانین کام لەو دوو گروپە حسابی زۆر مانەوەی لە ئەشکەوتەکەدا باشتر ڕاگرتووە" (الکهف، 12)، "شەیتانمان بەسەر خەڵکدا زاڵ نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە بزانین ئەوە کێیە کە باوەڕی بە ڕۆژی دوایی هەیە و کێش گومانی هەیە سەبارەت بەوە" (سبأ، 21) "ئەگەر خودا بیویستایە هەموو ئەو کەسانەی لەسەر زەوین باوەڕیان دەهێنا. کەواتە تۆ (محەمەد) چۆن دەتوانی هەموو خەڵك بە زۆر بکەی بە ئیسلام؟ چونکە هیچ کەسێ بەبێ ئیزنی خودا باوەڕ ناهێنێ" (یونس، 99 و 100) چۆن دەتەوێ کەسێك کە خودا گومرای کردووە ڕێنمایی بکەی؟ بۆ کەسێکی وا هەرگیز ڕێگەی ڕێنمایی نییە" (النساء، 90) "نوح بە قەومەکەی خۆی وت ئەگەر خودا ویستبێتی ئێوە گومڕا بکات، دەرس و پەندی من سوودی بۆ ئێوە نابێت. (هود، 34).

.. بە پێی هەموو ئەم جەختکردنانە کە دوبارە و چەند بارە دەبنەوە کە مرۆڤان کەمترین دەسەڵاتیان نییە لەوەدا کە پێشان لە چارەیان نووسراوە. لە هەندێ حاڵەتی تردا قورئان لەناکاو ڕێگا دەگۆڕێ و هێڵی ڕاست و چەپ بەسەر ئەو کەسانەدا دێنێ کە جگە لە ڕێگای حەق ڕێگایەکی تریان هەڵبژاردووە:

"خراپترین جانەوەران لای خودا ئەو کەسانەن کە عاقڵ نابن و ئەگەر ئێمە قسەی حەقیش بدەین بە گوێیاندا دیسان خۆیانی لێ گێل دەکەن و نارەزایی بەرامبەر دەردەبڕن" (الانفال، 22) "ئەگەر فریشتەشیان بۆ بنێرین یان مردووەکان لە گۆڕەکانیان ڕاست ببنەوە و قسەیان بۆ بکەن، دیسان باوەڕ ناهێنن" (الانعام، 111) "خودا کافرانی فەرامۆش کرد،

لەبەرئــەوەی ئــەوانیش خودایــان فــەرامۆش کردبــوو" (الاعـراف، 51، التوبـە، 67، الجاثیـة، 43). تەنانــەت لــە یــەك دوو جێگــادا ئــەوە رادەگەیەنرێ کە چاك و خراپی مرۆڤان بەرهەمی کـردەوەی خۆیانـە "جگـە لـەوەی کـە بـە هـەوڵی خۆی ئەنجامی داوە هیچ حاسڵێ نییە بۆ مرۆڤ" (الــنجم، 39)، "لــە لای خــوداوە بەرچــاو روونیــەکتان بــۆ هــاتووە، هــەر کەســێ بــینی رزگاری بوو هەرکەسێکیش بە کوێری مایەوە لە زەرەرو زیاندا مایەوە" (الانعام، 104).

وێڕای ئەو دەسەڵاتە رەهاو هەمەلایەنەی کە قورئان بۆ خودای سەلماندووە جاری وایە ئەم خودایە بەپێی ئایەتی جیاجیای هەمان قورئان بــە شــێوەیەك رەفتــار دەکــات وەك ئــەوەی گوتەبێــژی پەیامبەرەکــەی و نوێنــەرەوەی داخوازییـەکانی ئـەو بـێ لـە هەندێ حالەتدا کە خـودی پەیامبـەر لەبـەر شـەرمکردن یـان تـەوازع یــان حــەزەرکردن لــە کاردانــەوەی نــاخۆش حەزناکات دەریانبڕێ. ئەم بابەتە بەردەوام ئەم پرسیارەی هێناوەتە پێشەوە کە ئەگەر قورئان پەیامێکی ئاسمانییە بۆ هەموو خەڵك و هەموو ســەردەم و زەمانــەکان چــۆن چــۆنی هەنــدێ مەسـەلەی تێدا باسـکراوە کـە لـە رووی کـات و شــوێنەوە تــەنها پەیوەنــدییان بــە هەنــدێ کاروباری ژیانی رۆژانەی پەیامبەرەوە هەیە؟

"ئـەی ئـەو کەسـانەی کـە باوەڕتـان هێنـاوە، مەچنە خانووەکانی پەیامبەرەوە، مەگـەر خـودی ئــەو مۆڵــەتی پێــدابن، لەســەر ســفرەی نــان خــواردنی دامەنیشــن ئەگـەر خـودی پەیامبـەر داوەتـی نـەکردوون. کاتێکیش بۆ ماڵـەوەیان بـۆ نانخواردن داوەت کرابن بەر لە کاتی دیاری کراو مەچن و لە دوای نانخواردنیش بچن بەلای کاری خۆتانـەوە و بـۆ قسـە و بـاس مەمێننـەوە چـونکە ئـەم کـارە دەبێتـە هـۆی ئـازار بـۆ پەیامبـەر کـە خـودی خـۆی شـەرم دەکـات ئەمانـەتان پـێ بڵـێ، بەڵام خودا شەرم لە دەربڕینی راستی ناکات بۆ ئێـوە" (الاحـزاب، 53) لـە کاتێکـدا دەتانـەوێ پەیامبـەر بـانگ بکـەن، بـە هـەمان دەنـگ بـانگی بکەن کە لە نێو خۆتاندا یەکتری پێ بانگ دەکەن (نـور، 63). دەنگتـان لـە دەنگـی پەیامبـەر زیـاتر بـەرز مەکەنـەوە و بەهـەمان دەنگـی بـەرز قسـەی لەگـەڵ مەکـەن کـە لەگـەڵ یەکتریـدا قسـە دەکـەن ئەوانـەی لـە پشـت ماڵەکەیـەوە بـە دەنگـی بـەرز پەیامبــەر بــانگ دەکــەن زۆربــەیان خــەڵکی بێشـعورن، چـونکە زۆر باشـترە بۆیـان کـە ئـارام بگـرن هـەتا پەیامبـەر لـە ماڵـەوە دێتـە دەرێ. (الهجــرات، 1-5). کــاتێ پەیامبــەر داواتــان لێدەکات رێگا بکەنەوە کەواتە رێگا بۆ کەسانی دی بکەنەوە و کاتێ پێتان دەڵێت هەستن کەواتە هەستن (المجادلـە، 12). کـاتێ داوای شـمەك لـە ژنـەکانی پەیامبـەر دەکـەن لـە پشـت حیجابـەوە داوای بکـەن و ئـازاری پەیامبـەری خـودا مەدەن. لـە دوای مردنیشـی هـەرگیز ژنـەکانی پەیامبـەر مــەهێنن چــونکە ئەمــە لای خــودا گونــاهێکی گەورەیە (الاحزاب 53).

لــە جێگــای تــردا ســەبارەت بــە ژنــەکانی پەیامبەر، لە کاتێکدا کە گلەیی و گازندەی ژن و مێردایـەتیان هـەبووە لـە پەیامبـەر لـە قورئانـدا هـاتووە "ئـەی پەیامبـەر بـە ژنەکانت بڵـێ ئەگـەر خوازیــــاری جــــوانیی دنیــــایین وەرن بــــا مارەییەکــەتان بــدەمێ و بــە چــاکی و خۆشــی ئازادتــان بکــەم (تــەڵاقتان بــدەم)، بــەڵام ئەگــەر

خوازیاری ژیانی ئەو دنیان خودا پاداشتێکی گەورەتان دەداتێ، هەروەها کاری نارەوای ئێوە دوو ئەوەندەی کەسانی دی سزا دەدرێ، و هەر کەسێکیش لە ئێوە ملکەچی فەرمانی پەیامبەری خودا بێ دوو بەرامبەر پاداشت وەردەگرێ. ئێوە ئەی ژنانی پەیامبەر، بزانن کە وەکو باقی ژنانی تر نین، کەواتە لەگەڵ پیاواندا بە نەرمی و ناسکی قسە مەکەن و لە مالەوە بمێننەوە و تاعەتی خودا و پەیامبەری خودا بکەن (الاحزاب، 28- 34) تۆ ئەی پەیامبەری خودا پێویست ناکات لە خەوتن لەگەڵ ژنەکانی خۆتدا سەرە رەچاوبکەی. حەزت لە هەر کامێکیان نەبوو سەرەکەی دوا بخە و ئەگەر حەزت لێی بوو دووبارە بانگی بکە بۆ لای خۆت. نابێ هیچکام لە ژنەکانت لە خواستی تۆ نارازی بن، بەڵکو دەبێ هەموویان لەوە رازی بن کە تۆ پێیان دەبەخشی. (الاحزاب، 51) ئەی پەیامبەر بۆچی چاوپۆشی لەوە دەکەی کە بۆ دڵخۆشی ژنەکانت خودا بۆی حەلاڵ کردووی؟ (التحریم، 1).

دوو ئایەتی جیاواز لە قورئان باس لەوە دەکەن کە خودا یەکەمجار بە پەیامبەری خۆی راگەیاندووە کە ئەو کەسانەی بۆ (تەبەرِوك) دەچنە سەردانی پارە بدەن بۆئەوەی ئەو پارەیە بچێتە سەر مەسرەفی ژیانی، بەڵام لەبەرئەوەی خەڵکەکە رقیان لەم کارە بوو خوداش لە دانی ئەو پارەیە بەخشیونی "ئەی پەیامبەر، داوای خێر لەو کەسانە بکە کە دێنە سەردانت بۆ ئەوەی پاکیان بکەیتەوە و پاکژییان پێ ببەخشی"، (التوبە، 103) بەڵام لەبەر ئەوەی موراجیعەکان ملیان بۆ ئەوە نەدەدا، خودا لە ئایەتێکی تردا عوزریان بۆ دەهێنێتەوە. "ئەگەر ناتوانن وا بکەن ئەوە بزانن کە خودا بەخشندە و بەڕەحمە. ئایا پێتان ناخۆشە کە بەر لە سەردانی پەیامبەر خێر بدەن؟ لەم حالەتەدا ئێمەش تۆبەی ئێوە قبوڵ دەکەین بەو مەرجەی نوێژی خۆتان بکەن و زەکاتی خۆتان بدەن و ملکەچی خودا و پەیامبەری خودا بن" (المحاجە، 12 و 13).

لە جێگایەکی تردا، خودا لە ئاماژەکردندا بۆ پێکەنینی گالتەجارانەی یەکێك لە دوژمنانی محەمەد (عاسی کوڕی وائل) کە منال لێنەکەوتنەوەی پەیامبەری بە بەڵگەی (بێ تۆوی) ئەو زانیووەو زۆر محەمەدی تووڕە کردووە، خودا جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوە محەمەد نییە بەڵکو دوژمنی خوێنەخۆی ئەوە کە خۆی نەزۆکە (الکوثر، 3)

، دیسان لە جێگایەکی تردا خودا نەفرەت لە ئەبو لەهەبی مامی پەیامبەر و ژنەکەی دەکات کە دوژمنایەتی محەمەدییان کردووە "دەستی ئەبو لەهەب بە بڕین چێ، ژنەکەشی دارکێشی دۆزەخ بێت بە کۆڵ" (اللهب، 1-3).

## پەراوێزەکان:

1 -ئەم ژمارەیە تەنها پەیوەندی بە دەقی عیبری تەوراتەوە هەیە، چونکە دەقی لاتینی تەورات کە لە سەدەی چواری زایندا لەلایەن قەشە جرۆنیموی -وە *San Geronimo* لە یونانییەوە تەرجومەکراوەو ناوی (*Vulgata*) و (دەقێکە بەلای کڵێسای کاسۆلیکەوە پەسەندە) بەسەر 46 کتێبدا دابەش بووە. ئەو تەوراتەی کە بەلای کڵێسای پرۆتستانتەوە پەسەندە کە لەلایەن

مارتن لوسەرەوە راستەوخۆ لە عیبرییەوە تەرجومەکراوە لەبەرئەوەی حەوت کتێبی لەلایەن لوسەرەوە بەڕەسمی دانـی پێدانـەنراوە بریتییـە لـە (39) کتێـب. زاراوەی پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ لە ئینجیلی مەتتا (بابی 26) و پەیامی دووەمی پایولوس بۆ قەرنتیان (بابی 14) وەرگیراون.

2-ئـەم بابەتانـەی کـە لـەم کتێبـەدا لـە تەوراتـەوە گوێزراونەتـەوە، دەقاودەق لـە تەرجومـەی فارسـی (عهد عتیق) وەرگیراون کە لەلایەن ئەنجومەنی مەسیحی چاپ و بلاوکردنەوەی نێو دەوڵەتی کتێبی پیرۆزەوە لـە سالی 1904دا لـە نیویـۆرک چـاپکراوەو سـالی 1980 چـاپی نوێی کراوەتەوە.

3-ئەمە یەکەمجارە کە لە تەوراتدا نـاوی ئیسرائیل دەبـرێ. مانـای ئـەم وشـەیە لـە عیبریـی کۆنـدا رووبەڕووبوونـەوەی خودایـە هـەروەها وشـەی (فنوئیل) مانای (خودام بینییە). مایـەی سـەرنجە کـە خودا لەگەڵ پەیامبەرەکەیدا زۆرانبـازی دەکـات بـە هـەموو خوایـەتی خۆیـەوە نـاوی ئـەو پەیامبـەرە نـازانێ، ئـەوەش مایـەی سەرنجە کە لـەو نـاوەدا کـە بـە پەیامبەرەکـەی دەبەخشێ خودا بە (ئیل) ناودەبرێ کە ناوی خودا ئەفسانەییەکانی بابلی و کەنعانییە.

4-چیرۆکی ئـەیوب لـە قورئانیشـدا بـە هاوشێوەی ئەوەی تـەورات گێڕراوەتـەوە، بـەو پێیـەی کـە ئـەیوب لـەو رووەوە کـە لـە هـەموو هەلومەرجێکـدا بێچـەند و چـوون ملکەچـی خواسـت و ویسـتی خودایـە و تەنانـەت لـە خـراپترین حالـەتی بەدبەختییـەکانی خۆشـیدا رێگـای پرسیار بـە خـۆی نـادات کـە خـودا بۆچی تووشـی بـەڵای دەکـات، ئـەیوب مرۆڤێکـی نموونەییـە بـە موسـوڵمانان دەناسێنرێ. "و ئـەیوبی بەنـدەی ئێمـە بهێنـەرەوە یـادت، ئـەو دەمـەی کـە هـاواری لـە پـەروەردگاری خـۆی کـرد کـە شەیتان تووشی ئازار و ئەشکەنجەی کردووم، پێمان وت پێـی خـۆت بکوتـە بـە زەویـدا لەوێـدا ئـاوێکی فێنـك دەدۆزیتەوە بۆ شۆردنی قاچت و بۆ خواردنەوەش، دوو ئەوەنـدەی پێشـوو سـەروەت و سـامانمان بـۆ خـۆی و بنەماڵەکـەی گەڕانـدەوە بـۆ ئـەوەی نیشـانەی رەحمـەتی ئێمـە بێ بەسـەر ئەیوبدا و بیرخستنەوەیەکیش بێت بۆ کەسـانی خـاوەن عـەقڵ (سـورەتی ص ئایـەتی (41، 42، 43)" و ئەیوب هاواری لە خوای خۆی کرد کە بەڵا رووی تێکـردووم، بـەڵام سـکاڵایەکم نییـە چونکە دەزانم تـۆ لـە هەموو کەسێ بەرەحم تری، ئێمەش داواکەیمان قبوڵکرد و ئـازار و ئەشـکەنجەمان لـێ دوورخسـتەوەو بنەماڵەکـەیمان دوو ئەوەنـدە بـەردارتر کـرد بـۆ ئـەوەی نیشانەی رەحمەتی ئێمە بێ و پەندبێ بۆ عیبادەتکەران (سورەتی انبیاء ئایەتی83، 84).

5-ئـەم بابەتـەی تـەورات لـە ئەفسـانە بابلیەکانـەوە وەرگیراوە، هەر بۆیە تیایدا نـاوی بابل دێت. ئەفسـانەی بـابلی بابـەتێکی وەك ئەمـە سـەبارەت بـە بورجێکی بـەرز دەگێڕێتـەوە کـە لەسـەدەی حـەوتی پـێش زاینـدا لـە باشـووری خۆرئـاوای بـین النهـرین (نـەك لـە بابـل) دروستکراوە لەبەرئەوەی حەوت نهۆم بووە بە بەرزترین بینای جیهان ناو دەبراو پاشان بە (باب ایل) (دەروازەی خودا) ناو برا کە ئەم ناوەش بەرەبەرە بوو بە بابل.

ئـەم چیرۆکە لـە قورئانـدا بـەو شـێوەیە گـۆڕاوە کـە فیرعـەونی میسـر داوا لـە هامـانی وەزیـری دەکـات کـە بـورجێکی بـەرزی بـۆ دروسـت بکـات کـە بتـوانێ بچێتە سەری و بگاتە ئاسمان و بزانێ ئەو خودایەی کە موسا ناوی دەبات لەوێیە یـان نـا، هەرچەندە خۆی باوەڕیشی وایە کە موسا پیـاوێکی درۆزنـە. (سـورەتی قصـص 38، سورەتی مؤمن 36، 37).

6-ئـەم سـروودە لـە داسـتانە ئۆگاریتییـەکانی بـین النهـرین وەرگـیراوە کـە نـاوی (بنـو اثـیرات) (منالـەکانی خودای ئەئثیرتا)یەو بەپێی حیکایەتی ئەم داستانە ئەم

خودایە 72 کوڕی هەبووە کە 72 میللەتەکەی سەر زەوی لەو کوڕانە کەوتوونەتەوە.

7–لەم بارەیەوە لە ئینجیلدا هاتووە کە: "کەلامی خودا دەڵێت: لە سەهیون بەردێك دادەنێم کە خەڵك لەسەری دەخزێن و بەردێکی لێدروست دەکەم کە لەسەری دەکەون" (رسالە پائولوس رسول بە رومیان باب نهم، 33).

لە قورئانیشدا هاتووە "ئێمە خۆمان لە شارێکدا مەرام دەکەین کە بڕیاری لەناوبردنی خەڵکی ئەو شارەمان دابێ بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە لە کفری خۆیان تۆبە بکەن (الانبیاء ، 95)، هەر لەم بارەیەوە چەند ئایەتێکی تر لە قورئاندا هاتووە "ئەوان فێڵیان لە ئێمە کرد و ئێمەش لە بەرامبەردا فێڵمان لێکردن و ئەوان تێنەگەیشتن" (النمل، 50)، "ئەوان فێڵیان لە ئێمە کرد و ئێمەش فێڵمان لێکردن، و خودا باشترین فێڵبازە (ال عمران، 54)، "فێڵیان لە خودا کرد و خوداش فێڵی لێکردن، چونکە خودا لە هەمووان فێڵباز ترە" (الانفال، 30) گول تسیهر ئەم حەدیسە بەناوبانگەی ترمزی دەهێنێتەوە کە "لە دوعاکانی پەیامبەر ئەوە بوو کە: خودایە یارمەتی من بدە بەڵام بەسەرمندا یارمەتی کەس مەدە، فێل بۆ من بکە بەڵام فێڵ لە من مەکە" (صحیح جلد دوم ص373)، هەروەها ئەم قسەیەی طبقات الشافعیة (جلد سوم،ص 56) کە عومەری کوڕی خەتاب دەیوت "ئەگەر پێیەکم لەناو بەهەشتدا بێ و پێیەکەی ترم هێشتا لە دەرەوەی بەهەشت بێت، لە فێڵی خودا خۆم لە ئەماندا نابینم".

8–گیانداریکی گۆشت خۆرە وەکو سمۆرە وایە پێستەکەی زۆر بەنرخە. (وەرگێڕ)

9–ئەم وشەیە 282 جار لە تەوراتدا بەشێوەی یەکێ لە نازناوەکانی یەهوە هاتووە کە مانای خودای شەڕ و شەڕەنگێز دەدات. (نووسەر)

10–لە قورئانیشدا هاتووە کە "پەیامبەر بە نهێنی شتێکی بەیەکێك لە ژنەکانی خۆی وت بەڵام ئەم ژنە مەسەلەکەی بە کەسێکی تر راگەیاند، خودا بە پەیامبەری راگەیاند کە فلان ژن نهێنیەکەتی ئاشکرا کردووە. پەیامبەر لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەو ژنە کرد. ژنە بەسەرسوڕمانەوە وتی کێ ئەمەی پێ وتی؟ پەیامبەر وتی خودای دانا پێیڕاگەیاندم. (التحریم، ئایەتی 3).

11–لە قورئانیشدا لەم بارەیەوە هاتووە کە "هیچ چاوێك ناتوانێ خودا ببینێ، بەڵام خودا هەموو چاوەکان دەبینێ (الانعام، 100). لەگەڵ ئەوەشدا لە قورئانیشدا چەند حالەتێك هەیە کە تیایاندا ئاماژە بۆ دەستی خودا (المائدە، 64)، چاوی خودا (القمر، 14) روخساری خودا (البقرە، 115) و خودا لەسەر عەرشی خۆی لەناو فریشتەکاندا (طه، 5) کراوە. ئەم ئاماژە روونانە بۆ لایەنی بەدەنی خودا گەلێ کێشمە کێشی فکری زۆری لە ئیسلامدا لە نێوان مالکیەکان لەلایەکەوەو حەنبەلیەکان وکەرامیەکان و ظاهریەکانی لەلایەکی ترەوە خستبۆوە. گروپی ئیسلامی ناسراو بە (ظاهریة) کە بنیاتنەرەکەی ئەبو داودی ئەسفەهانی بوو و بە تایبەتی لە ئیسپانیای مسوڵمان نفوزێکی زۆری پەیدا کرد) باوەڕی وابوو کە خودا لە عەرشەکەی مالی هەیە کە لە کۆڵی فریشتەدایە هەرکاتێ بجوڵێ، دەنگێکی وەك ئەوەی لە زینی حوشتری سواری زەبەلاح بەرزدەبێتەوە لە عەرشەکەی بەرز دەبێتەوە و دێتە گوێ. هەندێ باوەڕیان وایە کە روخساری خودا لە روخساری پیاوێکی پیری قژ ماش و برنجی دەچێت. هەندێکی تر بە پێچەوانەی ئەمەوە پێیان وایە روخساری گەنجێکی سادە و رووخۆشی هەیە کە نەعلی ئالتوونی لە پێدایە. وتراوە کە لە دوای لافاوی نوح خودا ئەوەندە گریا کە تووشی چاویەشە بوو، بە جۆرێ کە فریشتەکان چوونە سەردانی، و لە کاتێکی دیکەشدا ئەوەندە پێکەنی کە کاکیلەکانی

دەرکەوتن (تشیع و تصوف، نوشتە هاشم معروف الحسینی، ترجمە سید محمد صادق عارف، نشریە بنیاد پژوهشهای استان قدس رضوی، مشهد 1369، نقل ازکتاب اله اکبر، نوشتە دکتر روشنگر، ص 171).

12-ئەم ئەرمیای پەیامبەرە کە بە نوێنەرایەتی خودا پەیامبەرانی پێشووی ئیسرائیل بە نێردراوی درۆزنی یەهوە لە قەڵەم دەدا، پێشان خودی خۆی لە کتێبەکەی خۆیدا نەك تەنها خۆی بە نێردراوی یەهوە دەزانێ، بەڵکو جەخت لەوە دەکاتەوە کە تەنانەت پێش ئەوەی تۆوی دروستکەری ئەو بگیرسێ پەیامبەر بووە. "پاشان قسەی خودا بۆ من هاتە خوارەوە و وتی بەر لەوەی تۆ لە سکی دایکیدا وێنە بکێشم تۆم ناسی و لە هەمان جێدا پیرۆزم کردی و کردمی بە پەیامبەری نەتەوەکان" (کتاب ارمیاء نبی، باب اول، 4 و 5).

13-ئەم نووسینەی تەورات بوو بە یەکێك لە بەڵگەکانی تاوانباری گالیلۆ لە دادگاییکردنە بەناوبانگەکەیدا سالی 1616، چونکە حاکمەکانی کلێسا بە پشتبەستن بەوەی یوشع خۆری لە جووڵە خستبوو نەك زەوی، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە گریمانەی گالیلۆ سەبارەت بە جووڵەی زەوی پێچەوانەی کتێبی پیرۆزە و بەم پێیە هەڵەیە و بە تالە.

14-ئاماژەیە بۆ ئەو نووسینەی تەورات کە دەڵێ "منم کە خودای رووناکی و تاریکی و خودای شەڕو ئاشتی و خودای تەندروستی و نەخۆشیم هەر کەسێکم بوێ دەیبەخشم و هەرکەسێ بمەوێ رەحمەتی بۆ دەهێنم. هاوار بۆ ئەو کەسەی کە دوژمنایەتی من دەکات. بۆچی گۆزە بە گۆزەگەر دەڵێ بۆچی ئاوا منت دروست کردووە، یان کەس بە ژنی دەڵێت چیت بووە؟ (سفر خروج، باب سی و سوم، 19 کتاب اشعیاء، باب چهل و پنجم،7).

15-ئەم ئایەتانە لەلایەن فریمن کلارك-ەوە پشتیان پێبەستراوە بۆ گوزارشت کردن لە چاکە کە زۆرجار لێی گێرراوەتەوە "ئاسایی دەبوو لەناو بوومەلەرزە و لافاوو ئاگردا بۆ خودای محەمەد بگەڕێی".

16-مەسەلەی ناردنی فریشتە بۆ یارمەتیدانی پەیامبەران لە تەورات و ئینجیلەوە سەرچاوەی گرتووە. لە (کتاب دوم سموئیل (باب پنجم، 24) و (کتاب مکابیان (باب پنجم، 3-4 و باب یازدهم، 8- 10) دا ئەم رووداوە بەشێوەیەکی تەمومژاوی باسکراوە، بەلام لە ئینجیلدا بە راشکاوی لە زمانی عیساوە دەوترێ کە ئەگەر بیەوێ دەتوانێت داوا لە خودا بکات کە دوانزە فەوج فریشتەی بۆ بنێرێ بۆ یارمەتیدانی (متی، باب بیست و ششم، 53).

## سەرچاوە:

تولدی دیگر ، شجاع الدین شفا، ص 55-110.

# گفتوگۆ لەگەڵ ئێرنست توگندهات*

له ئینگلیزییەوە: کارزان کاوسێن

وا دانرا کە گفتوگۆکە تەنیا دوو سەعات بخایەنێت لە پاش نیوەڕۆدا، بەڵام تاوەکو نزیکەی نیوەشەو درێژەی کێشا. ئێرنست توگندهات-ی تەمەن 77 ساڵ گومانی هەبوو داخۆ گفتوگۆکە چاپ بکرێت یان نا. دواجار نامەیەك لە (توبینگن)ەوە هات. (تێکستەکەم بەم شێوەیەی ئێستای پێ باشە) ئەم نامەیە بە دوگمە خڕەکانی کۆنە تاپڕایتەرەکەی نووسرابوو. توگندهات حەز ناکات ئیمەیڵ بنێرێت: بیرۆکەکانی هێشتا بە پۆست ڕەوانە دەکرێن. ئەمەی کە لە خوارەوە دێت گفتوگۆیەکە لەگەڵ پرۆفیسۆر توگندهات کە ئولریکه هێرمان سازیداوە.

**- پرۆفیسۆر توگندهات، فەلسەفە هەرە تازەکەت دەربارەی ترسی مردنە. یەکەم جار کەی بوو کە تۆ ئەم ترسەت تاقیکردەوە؟**

- یەکەم بابەتم لەبارەی مردنەوە کاتێك نووسی کە تەمەنم 64 ساڵ بوو. ئەو کاتە من لە شیلی بووم بە تەنیا و ئەو هەستەم هەبوو کە هەموو ئەو شتەی چاوەڕوانی من دەکات بریتییە لە مردن. بەڵام لەوانەیە لەو چرکەساتەدا ئامادەی وەرگرتنی ئەو بیرۆکەیە بووبێتم، چونکە من لەگەڵ هایدگەردا خوێندوومە، کە مەرگیش لە بیرکردنەوەی ئەودا ئامادەییەکی دیاری هەیە. کاتێك بیر لەوە دەکەمەوە کە تەنیا کاتێکی کورتم لەبەردەمدایە بۆ ژیان، زندەقم دەچێت. نەك لەبەر ئەوەی کە دەمەوێت تاهەتایە بژیم، بەڵکو لەبەرئەوەی کە هەست دەکەم کاتەکەمم بەهەدەر داوە و دەبووایە بە شێوەیەکی زۆر جیاواز بژیم.

**- چۆن؟**

- ئەمەیان نازانم. من تەنیا ترسی ئەوەم هەیە کە شتە سەرەکییەکەم لە کیس چووبێت.

بەلاّم لە هەمان کاتدا عیرفان جێگەی بەم هەستە چۆڵکردووە.

**-بەلاّم عیرفان چۆن دەتوانێت یاریدەدەر بێت؟**

-یارمەتیت دەدات دان بەوەدابنێیت کە لە هیچ رووداوێکدا تۆ ئەوەندە گرنگ نیت. ئەمەش بەهۆی سەرسوڕمانەوە دەبێت لەمەڕ ئەوەی کە هایدگەر پێی دەوت (بوون ) یاخود، هەروەکو ویتگنشتاین دەیگوت، ئەم جیهانە لەهەموو ڕوویەکەوە هەیە.

**- ئەگەر تۆ خۆت گرنگ نیت ، کەواتە لە کوێوە ئەنگێزەی ژیانت بۆ دێت؟ ئایا ئەم باوەڕهێنان بەوەی هەموو شتێك گرنگە جگە لە خۆت، لاواز ناکات ؟**

-نا، من تەنیا گرنگم، بەلاّم زیاتر نا. وێڕای ئەمە، من تموحی تەواو فەلسەفییم هەیە و من دڵخۆشم بەوەی کە سەرکەوتووم لەوەدا کە دەیکەم، تەنانەت ئەگەر لە ڕاستییدا تێڕوانینێکی وەها مەحکوم بکەم. هەوڵدەدەم خۆم ئەوەندە بە هەند وەرنەگرم، بەلاّم بە شێوەی واقیعی من ئەوە تاقی دەکەمەوە کە تا چەندە خۆم بە هەند وەردەگرم.

**- ئایا ئەمە نابێتە زەمینەگەلێك بۆ پێداچوونەوە بەو تیۆرەیەی تۆ کە دەڵێت پێویستە پیاو خۆی ڕێژەیی بکات؟**

نەخێر. دەشێت عیرفان و خودگەرایی (*egocentricity*) هەردووکیان ئەلتەرناتیڤ نەبن. من بڕوام وایە کە کەسێك هەرگیز بەسەر خۆ بەهەندوەرگرتندا تێنا پەڕێت، تەنانەت سۆفییەکیش. چونکە لە کرداری سۆفیگەرییدا، ئەو چێژ لەو ڕاستییە وەردەگرێت کە (ئەو) کرداری سۆفیگەرێتی جێبەجێ دەکات. لێرەدا کەلەبەر (جیاوازی) هەیە لەنێوان خۆبەهەندوەرگرتن-ی زیادەڕەوانە-ی یەکێك و ئارامی بەڕێژەییکردنی خودێك، لەبەرچاوگرتنی خودێك.

**کاتێك پیاو دەڵێت: من گرنگ نیم، ئینجا پیاوێکی تریش دەڵێت: من بەلای ئەوانیترەوەگرنگ نیم. چی بەسەر خۆشەویستی دێت؟**

بێگومان خۆشەویستی لێکتێگەیشتن دەگرێتەخۆ کە خەڵکی خۆیان بە گرنگ دەزانن. بە کورتی من پێم وایە ئەم چرکەساتە سەربەخۆیە.

**- لەگەڵ ئەوەشدا بەلای منەوە زاڵبوون بەسەر ترسی مەرگدا چیتر وا لە پیاو دەکات سۆزی نەمێنێت.**

بەڵێ.

**- ئەمە پێدەچێت باجێکی زۆر گەورە بێت.**

- سەیرکە، ئەمانە تەنیا دژیەکێکن لەناو چێوەیەکی تەنگژەدا. دۆخی لوتبەرزی وەربگرە. ئەمە شتێکە هەمووومان گاڵتەمان پێیدێت، چونکە خۆبەگرنگ زانینی لە ڕادەبەدەری کەسێکە.

**- ئایا تۆ لوتبەرزیت؟**

- ئێمە هەمووومان ئیگۆسێنتریك (*egocentric*)ین. بەلاّم هەندێکمان زۆرمان پێوەدیارترە لە هەندێکی تر. دەستەبژێران بەتایبەت پێیانەوە دیار نییە.

**- دەکرێ یەکێك بەرانبەر سەرکەوتنەکانی خۆی دڵخۆش بێت؟**

- پرسیارێکی باشە. من دەڵێم بەڵێ- تا ئەو شوێنەی کە زیادەڕەوی تێدا ناکەیت.

**- کام سەرکەوتنانەت پتر دڵی خۆش کردیت؟**

- کاتێك کە پۆستی یەکەمم وەکو پرۆفیسۆر لە هایدلبێرگ وەرگرت، هەناسەیەکی

قوڵیئاسودەییم هەڵکێشا. بەدرێژاییساڵانی پێش ئەمە وەکو یاریدەدەر لە تیوبینگن باوەڕم بەخۆم نەبوو. ریکلامەکانم لە رۆژنامەکاندا دەخوێندەوە، بەڵام هەرگیز شتێکم نەدۆزییەوە کە هەست بکەم ئەنجامیدەدەم. ئیمانم بەخۆم نەبوو وەکو فەیلەسوفێك. من گرێی خۆبەکەم زانینم هەبوو- ئەمەش بۆ گەلێك کەسی خۆبەزلزان *(haughty)* ڕاستە.

**- تۆ خۆبەزلزان بوویت؟**

- بەشێوەیەکی بنچینەیی من وێنایەکی بەرزم هەبوو سەبارەت بە خودی خۆم. پێ بەپێ باوەڕبەخۆبوون-م بەدەستهێنا، بەڵام تا ڕادەیەکی زۆر من هێشتا پشت ئەستوورم بەوەی کە خەڵکی کاردانەوەیان چۆنە بەرانبەر وتاربێژیەکانم ئەمە دڵم تەنگ دەکات. وتاربێژیەکانم لە ئەڵمانیا بە باشی پێشوازییان لێکراوە، بە پێچەوانەی وڵاتانی ئەنگلۆ-ساکسۆنییەوە.

**- جیاوازییەکە لە چیدایە؟**

- لێرە بەدناوکردنێکی زۆر هەیە لە زانکۆکاندا. لە ئینگلتەرە و ئەمریکا، خەڵکی بە جۆرێکی تر پرسیار دەکەن، بەتایبەت لەگەڵ منـدا، چونکە شێوازی من لە بیرکردنەوەدا زیاتر ئەنگلۆساکسۆنییە. زۆرێك لە هاوکارە ئەڵمانییەکان لە ئەمریکا ئاسانترە بۆیان، چونکە لەوێ خەڵك هەیە دەڵێن، ئۆه، ئەمە جۆرێك لە قووڵبوونەوەی ئەڵمانییە کە هەرچۆنێك بێت ئەمە لەوە قووڵترە کە شیاوی تێگەیشتن بێت.

**- کەواتە ئەمەرۆکە فەلسەفەیەکی باش تەنیا لە ئینگلتەرە و ئەمریکا پێشکەش دەکرێت؟**

نەخێر. من باوەڕم وایە کە خەڵکی لە ئەڵمانیا زۆر ئاگادارن لەوەی کە پرسیارە گەورەکان کامانەن. بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەوان کەمتر میتۆدۆلۆجی و زۆر کەم دیسپلین لە مشتومڕدا لەبەرچاودەگرن. دوای محازەرەیەك لە ئەڵمانیا، گەلێك خەڵك لەسەر پێ دەوەستن و دەربارەی شتێك یا شتێکی تر دەدوێن، بەبێ ئاماژە کردن بەوەی کە قسەکەر چی وتووە. وا هەڵکەتووە کە ئامادەبووانی ئەڵمانی وەکو ئەندامانی دەستەیەك (*panel*) خۆیان ببینەوە لە پێکەوە خستنەڕووی بابەتەکانیاندا.

**- پەیوەندی تۆ لەگەڵ (یورگن هابرماس)دا چۆنە؟**

- ئەمە پرسیارێکی زۆر ئاڵۆزە.

- دەکرێ بەشێوەیەکی جیاواز پرسیارەکە بکەم؟ هابرماسیش وەکو تۆ کەشفی ئایین دەکات.

بەڵام زۆر جیاواز. ئەو خۆی هیچ پێویستی بە ئایین نییە، ئەو سەربەستانە پەسندی دەکات. بەڵام ئەمەی کە چۆن جێگەی بایەخییەتی کتومت نازانم. بەڵام لە هەموو بارێکدا ئەمە ئەو شتە نییە کە جێگەی بایەخی منە. من بەدڵنیاییەوە پێویستییەکم بە باوەڕهێنان هەیە. ئەو بایەخ بە پێکهێنەرە مۆراڵییەکانی نەریتی ئایینی دەدات نەك ئایین وەك خۆی.

- پێدەچێت کتێبە هەرە تازەکەت ناکۆکئامێز بێت. بە ئاماژە بەهێزەکەی بۆ مەرگ، وەك بڵێی ماڵئاوایییەك- و سەرەتایەکی نوێیە.

- چ شتێك ئینتیباعی سەرەتایەکی نوێت ئەداتێ؟

**- هەوڵی تۆ بۆ خستنەڕووی وەڵامی نوێ بۆ پرسیارەکە: فەلسەفە چییە؟ میتۆدەکەی چییە؟ ئایا پرسیارێکی گشتی هەیە کە بتوانێت دیسپلینە یەك بە یەکەکان لەناو فەلسەفەدا بەیەکەوە ببەستێتەوە؟**

- لە پێشەکییدا وتم کە تاوەکو ئێستا ئەوەی دەربارەی بیرۆکەگەلێکی دیاریکراو وتوومە بەلای منەوە زۆر کەموکورتە. هەنوکە من وتومە کە کتێبی پێشووم دوایین کتێب دەبێت. پاشان ئەم کۆمەڵە وتارەم نووسی کە لەمانگی مارسدا بڵاوکرایەوە. ئێستاکە هەرچۆنێك بێت بە ڕاستی پێم وایە ئەمە دوایین کتێبی من بوو.

**- چونکە قەناعەتت بە خۆت هەیە؟**

- نەخێر، بەڵام ئەو هەستەم هەیە کە سەردەمی فیلۆسۆفیزە کردن بەسەرچووە.

**مێزەکەت زۆر ڕێکوپێك دیارە. تاکە شتێکیش کە لەسەری دانراوە کۆنە ئامێرێکی تایپکردنە.**

تەنیا ئەو کاتە دەتوانم بیربکەمەوە کە لەسەر تایپرایتەرەکە دادەنیشم. پەڕەکاغەزی زۆر بچوکم لەبەردەستدان، نیوەی پەڕە کاغەزی ئاسایی. ژمارەی لاپەڕە لەلای ڕاستەوەیە، بەروار لەلای چەپەوەیە. ئەمانە بەشێوەی کرۆنۆلۆجیکی ریزبەندی دەکەم.

**- قوچەکێکت لە نزیکەی دوو هەزار لاپەڕە دەستنووس دروستکردووە. چۆن جارێکی تر بیرۆکەکانت دەدۆزیتەوە؟**

- ڕەنگە ئەمە کارێکی قورس بێت. بەر لەوەی شیلی بەجێبهێڵم لەساڵی 1999دا هەموو شتێکم فڕێدا و ئەو شتانەشم فرۆشتن کە هێشتا نرخێکیان هەبوو. خۆم بە شتەکانەوە ناگرمەوە.

**تەنانەت بیرۆکەکانی خۆشت؟**

- کاتێك وتارێکت نووسی، دەتوانی تێبینییەکان فڕێ بدەیت.

**- ئەمە زیاتر نەگبەتییە بۆ بایۆگرافەرێکی بەتوانا.**

- پێویستە هەموو شتێك بە ماوەیەکی کورت پێش مردن فڕێ بدەیت. نامەوێت خەڵکی ئارەزووی بڵاوکردنەوەی شتێکیکیان لا دروستببێت. ئێستا ئەوە نامەکانی هایدگەر بۆ خێزانەکەی چاپ دەکرێن. باوەڕ ناکەم کە ئەو ڕێگەی بەم کارە بدایە. من لەمە تێناگەم بۆچی خەڵکی وا بیردەکاتەوە کە کەسێك مرد چیتر شایەنی ڕێز گرتن نییە و ئەتوانیت ژیانی تایبەتی دیواودیو بکەیت.

**- لەگەڵ ئەوەشدا، نیشانەیەکی تری بایۆگرافەرە بەتواناکان لەم پرسیارەدا خۆیدەبینێتەوە: چۆن کاتی بەتاڵت بەسەر برد؟ دەوترێت کە لودیك ویتگنشتاین ڕۆمانە پۆلیسیە کۆنەکانی دەخوێندەوە.**

- بە درێژایی ژیانم جگە لە کاری فەلسەفی هیچم نەکرد. ڕەنگە کەمێك گوێم لە مۆسیقا گرتبێت، یان چاوم بە هەندێ کەس کەوتبێت. پێم وایە کە کەسێکی خوو گرتوو بووبێتم بە کارەوە.

**- ئایا نموونەی پێشەنگت هەبووە بۆ ئەمە؟**

- لەوانەیە خێزانەکەم. باوکم زۆر هێمن و داخراو بوو ، کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو.

**- بۆ ماوەی 25 ساڵ و بەشێوەیەکی سەرەتایی خۆت بە ئەخلاقیاتەوە سەرقاڵ کردبوو- ئێستاش لە تەمەنێکی درەنگدا ڕووت کردووەتە ئەنترپۆلۆژیا. چۆن بوو ئەم گۆڕانە روویدا؟**

- لە وتارێکدا کە لە ساڵی 1999دا نووسیوومە، من دەربارەی کێشەیەکی

دیاریکراوی هایدگەر دەدوێم، ئەویش بریتییە لە زاراوەی (پیاو) – بە گشتی لە زمانی ئینگلیزییدا بە (یەکێك) وەردەگێردرێت–. دەمەوێت پیشانی بدەم کە ئەنترۆپۆلۆژیای هایدگەر ناڕاست بوو و زاراوەکانی خودی ئەوی ڕوون نەدەکردەوە. ئەمە زیاتر بەشێوەیەکی ڕێکەوت ڕوویدا، بەلآم من لێرەوە بەردەوام بووم.

**– دەکرێت تەواوی ژیانی فەلسەفییت وەها وەسف بکرێت کە هایدگەر تیایدا بالآدەستە؟**

– بەڵێ. (بوون و کات)م لە تەمەنی پانزە ساڵییدا خوێندەوە. ئەو کاتە بە زۆری لەگەڵ دایکم تێکستە فەلسەفییەکانم دەخوێندەوە. زۆر گرنگ بوو بەلای ئەوەوە کە لە هەر کارێکدا کە دەمکرد لەگەڵمدا بێت. هەرچی زوو بوو هاتم بۆ ئەڵمانیا و ماوەیەکی درێژ لە فرایبورگ خەریکی خوێندن بووم.

**– هایدگەر بەوە ناسرابوو کە زۆر دوورەپەرێز، گۆشەگیر(*aloof*)ە.**

– دەزانیت، ئەو وەکو کەس، بە هیچ شێوەیەك بەلای منەوە بایەخی نەبوو. کاتێك ئەو پلەو پایەکەی بۆ گەڕێنرایەوە، کە من لە قۆناغی دووەم یان ئەو دەوروبەرەدا بووم، لە سێ کۆرسی ئەودا بەشداریم کرد. پاشان لە فرایبورگ ناوبەناو سەردانم دەکرد و بەیەکەوە دەچووین بۆ پیاسە. من هەمیشە لاشەیەکی تۆقیو بووم، هەستم بە نائامادەییەکی تەواو دەکرد. پاشان کارتێکی بۆ ناردم بۆ ئەوەی پێم بڵێت هەر کاتێك چووم بۆ لای:

( پێویست بە خۆ ئامادەکردن ناکات).

**– ئەی دواتر؟**

– پاش ئەوەی فرایبورگم بەجێ هێشت بە ڕاستی وتوێژێکی باشمان هەبوو بەیەکەوە– کاتێك دەستم کرد بە ڕەخنەگرتن لە بیرۆکەی ئەو لەمەڕ حەقیقەت لە پایاننامەی دوایین پلەی ئەکادیمییمدا. پێم وایە ئەمە دەستپێکی ماوەیەکی کورت بوو کە تیایدا ئەو بەتەواوی لەگەڵمدا دەستەویەخەبوو. بەلآم پەیوەندی کەسییمان بەلای منەوە بە تەواوی بێ بایەخ بوو. لەو دەمەدا نازیزمی هایدگەرم ئەوەندە بە هەند وەرنەگرت تاوەکو بمگوتایە ڕێبازێکی هەڵەیە. ئەمە لە ساویلکەیی خۆمەوە بوو. دوایی لەسەر ئەمە، زۆر سەرکۆنەی خۆمم کرد.

**– ئەمە بە هۆی ئەوەوە بوو کە تۆ ئەوەندە بە پەلە لە کۆچبەرێتییەوە گەڕایتەوە بۆ سەرزەمینی تاوانکاران؟**

– ئەمە هەنگاوێکی زۆر پرسیارئامێزە. ئێستاکە نیشانەی ئاشتبوونەوەم لە بەرانبەر قوربانییاندا ڕیسوایی پێوە دیارە.چونکە من لە ژێر حوکمی نازییەکاندا ئازارم نەچەشت. تەنانەت کۆچیشم وەکو زیانێکی کەسیی تاقینەکردەوە. وەکو تەمەن پانزە ساڵێك، سواربوونی کەشتی بۆ ڤەنزوێلا بەلای منەوە ڕیسکێك بوو.

**– بەلآم دەبووایە یەکێك لە خانووە هەرە بەناوبانگەکانی مێژووی هونەری مۆدێرن بەجێ بهێڵیت، *Villa Tugendhat* کە ئارکیتێکتی باوهاوس میێ ڤان دێر ڕۆ *Mies van der Rohe* بۆ باوکتی دروستکرد لە برون.**

– ئەو خانووە هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانی مندا نەبوو، و ئەگەر هەیبووبێت ئەوا ڕۆڵێکی نێگەتیڤ بووە. بۆ من، شوێنی ژیان مایەی

بێباکییەکی تەواوە. لەوانەیە ئەمە کاردانەوەیەك بێت بەرانبەر شکۆدارکردنی لەڕادەبەدەری خانووەکە لەلایەن خێزانەوە.

**- بۆچی ماوەیەکی درێژی خایاند بۆ تۆ تاوەکو بگەیتە ئەو ئەنجامەی کە هەڵەیە وازوو بگەڕێیتەوە ئەڵمانیا؟**

من لە ناو بازنەیەکی کۆچبەرانی جوولەکە دا گەورەبووم کە قوتابی هایدگەر بوون. هەموویان پێیان وابوو کە دەتوانیت کارەکەی لە کەسایەتییەکەی جیابکەیتەوە. بۆیە من وەکو جوویەك زووتر لە کاتی خۆی گەڕامەوە ئەڵمانیا- کە دواجار باجەکەیشمدا.

**- بەڵام تەنیا خۆت؟ کەس لەسەر ئەم کارەت سەرزەنشتی نەکردیت؟**

- نەخێر هیچ سەرزەنشتێك و هیچ تۆمەتێك. بەڵام خەڵکی واقیان ورما.

**- مەبەستت خێزانەکەتە ؟**

- ئەوان هەر هیچ هەر لەوساوە. بەڵام من لە بەرلین خانمێکی دۆستم هەبوو کە خەڵکی ئینگلتەرا بوو. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا رۆژێکیان لە قاوەخانەیەك بە ناوی ئاینشتاین دانیشتبووین و هۆی راستەقینەی گەڕانەوەی من بۆ ئەڵمانیای لێپرسیم. لەو ساتەدا بۆم روون بووەوە کە من لە روانگەیەکی بێلایەنەوە وەڵامێکی باشم پێنیە. ئەمەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی وایانلێکردم ساڵی 1992 ئەڵمانیا بەجێبێڵم و بەرەو باشوری ئەمریکا بڕۆم.

**- ئایا دەکرێ پاش پانزدە ساڵ بڕیارێك راستبکرێتەوە ؟**

- دیارە شتێکی ئەقڵانی نەبوو. لەوانەشە ئەم هەنگاوە شەڕانگێزیەك بووبێ دژی خودی خۆم کە بۆ دەرەوەی خۆم گواستەوە. لە کتوپڕدا ئەم ڕکەم بەرامبەر ئەڵمانیا لە لا دروست بوو و گەرەکم بوو ئەم ڕکەم نەهێڵمەوە.

**- ساڵی 1999 دیسانەوە گەڕایتەوە بۆ ئەڵمانیا، ئەی ئێستا هەست بە چی دەکەیت؟ ئاساییت؟**

- من تەنها لەبەر کتێبخانەکان گەڕامەوە توبینگن. ئێستەش ئەگەر دیسان بڕۆمەوە باشوری ئەمریکا جێگایان دیاردەبێت.

**- ساڵی 1968 راگری زانکۆی هایدلبێرگ بوویت، ئەو دەمە چۆن ئەزموونی ئەڵمانیات کرد؟**

- بزووتنەوەی خوێندکارانی ئەو دەمە وایلێکردم کە لەگەڵ ئەڵمانیادا ئاشت بمەوە. لە ساڵانی پێشوودا خۆمم وەك بیانییەك دەبینی. بەڵام لەگەڵ راپەڕینی خوێندکاراندا تەواو یەك گیان بووم. لێرەدا کاردانەوەی سەیری بەشێکی زۆری هاوپیشەکانم رایچڵەکاندم. چونکە هیچ شتێك ئەوانی لەو ئاسودەییەی تێیدابوون رانەچەناند. سەرەڕای ئەمەش ئەمە ئەزموونێکی سەرسوڕهێنەر بوو بۆ من. ئەوان منیان وەك مرۆڤێکی ئاسایی دەبینی. لای ئێمەی پرۆفیسۆریش مشتومڕ پەیدابوو. هاوپیشەکانیشم نە بە گیانێکی دژەسامی و نە سامیخواز رەفتاریان دەکرد. تا ئیمڕۆش لەمە تێناگەم. چونکە ئەمانە هەموویان کەسانێك بوون کە ئەزموونی سەردەمی نازییەکانیان کردبوو.

**- ئەی دوایی چۆن بوو؟**

بۆ خۆم توشی هیچ دژەسامییەك نەبووم، بەڵام ئەمە گوزارشتێکی بابەتیانە نیە، چونکە لەوانەیە بە رێکەوت وابێ. من پتر سامیخوازی

دەبینم. بۆ نمونە ئەڵمانەکان پێمدەڵێن کە ئەوان ناتوانن بە هەمان شێوە رەخنە لە ئیسرائیل بگرن، وەك من دەیکەم. من زایۆنیزم بە نەتەوەپەرستی ناودەبەم و زۆر ئەڵمان ناوێرن ئەمە بڵێن.

**با بگەرێینەوە سەر هایدگەر، ئێستا ئەو چۆنی دەبینیت؟**

دەزگای بڵاوکردنەوەی *C.H.Beck* ئەوەی دا بە گوێمدا کە کتێبێك لە بارەی " بوون و کات"ی هایدگەر بنووسم. بەڵام ئەگەر ئەمە بکەم شەرەفێکی پێدەدەم کە لە قەبارەی خۆی گەورەتر بێت. نەك تەنها لەبەر ئەو شێوە هەڵسوکەوتەی لە سەردەمی نازیەکاندا نواندی، بەڵکو لەبەر دەربڕینەکانی لە دوای 1945یش. شتێکی قێزەوەن بوو. من پێموایە ئەو جگە لە رووی مرۆیی و سیاسیەوە کە بە هیچ شێوەیەك راستگۆ نەبو لە رووی فەلسەفیشەوە راستگۆ نەبوو.

**- هەمیشە ئەو گوزارەیەت دەگوترێتەوە کە گوتووتە کێشەی هایدگەر بریتییە لە غیابی چەمکی ناڕاستی؟**

- ئەو چەمکێکی حەقیقەتی گەلاڵە کرد، چەمکی" ناشاراوەیی"، کە پێچەوانەی ناڕاستی چیتر بەشێوەیەکی جەوهەری پەیوەندی پێوە نییە. ئەم مەسەلەیە کەمێك ئاڵۆزە لای هایدێگەر، چونکە ئەو هەمیشە دەیتوانی خۆی لەم کێشەیە دەربازبکات و بەهانەیەکی بۆ بدۆزێتەوە.بەڵام لە بنەڕەتدا رەهەندی (گیانی) رەخنەگرانە لای ئەو ون دەبوو.

**- سەرەڕای ئەمەش تۆ بە درێژایی ژیانت شەیدای ئەو بوویت**

- بە درێژایی ژیانم نەبوو. بۆ من خاڵی وەرچەرخان ئەو دەمە بوو کە چەند رۆژێك بەر لە پێشکەشکردنی پایاننامەکەم لەمەڕ هەسرێل و هایدگەر لە ساڵی 1965دا بۆ ئان ئەربۆر لە ویلایەتی میشیگان بانگهێشتکرام. ئەو کاتە تەمەنم 35 ساڵ بوو. لەوێدا بۆم دەرکەوت کە بە میتۆدی فەلسەفەی شیکاری دەکرێ ئەو بابەتانە ئاسانتر روونبکرێنەوە کە هەسرێرل لەرێی چەند داهێنانێکی وەك هەڵنانی پۆلێنبەند—*catigorical intitution* روونی دەکردنەوە. ئەمەیان بۆ من لادانێکی زۆر گەورە بوو لەو میتۆدەی کارم پێدەکرد. من خۆم بە شێوازی پرسیارکردنی هایدگەر بەستبووەوە، بەڵام ئەو شەیداییەی جارانم نەمابوو. هایدگەر هەوڵیدا چەمکە میتافیزیکیەکانی خۆی لەسەر ئەرستۆ تاقیبکاتەوە. بەڵام من ویستم نیشانی بدەم کە ئەرستۆ لە راستیدا ئێمەی بەرەو فەلسەفەی شیکاریی زمان دەبرد.

**- وێڕای ئەوەی کە ساڵی 1999 رووت کردە ئەنترۆپۆلۆژیا- دوور لە هایدگەر- هێشتا پێدەچێت کاریگەری هایدگەر بەسەرتەوە مابێت؟**

- بەڵێ من لەم مەسەلەیە بەئاگام. بەم دواییە لە موحازەرەیەکدا لە تویبنگن هەوڵمدا شتەکان هەڵگێڕمەوە و لەبارەی ئەوە قسەمکرد کە کام بەشانەی بەرهەمەکانی هایدگەردا هێزی مانەوەی هەیە ؟ بەڵام دەبوایە تاوناتاوێك بە خەڵکەکە بڵێم کە ئەمە بەم شێوەیە ناکرێت. هەربۆیەشە ناتوانم کتێبێك لەبارەی " بوون و کات"ەوە بنووسم.

**- چونکە زۆر روخێنەر دەبێت؟**

– بەڵێ، بۆ نووسین لەبارەی کتێبێکەوە، ڕوانینێکی سەرەتایی پۆزەتیڤانە پێویستە.

**– کەواتە پیاو ناتوانێت بنووسێت کە هایدگەر لە ئاکامدا تەنها ئۆم -om- ی سۆفیگەرێتی هیندیی-هەبوو کە بیخاتە بەردەستمان وەك جەنابت لە دواهەمین کتێبتدا باست لێوەکردووە. لێرەولەوێ بەوە تۆمەتبار دەکرێیت کە لە ڕەخنەکانتدا ڕکئامێز بوویت.**

– بۆ من ڕەخنەگرتن ئاسانترە لە ڕێزلێنان. جارێکیان یورگن هابرماس پێی گوتم " ئەمە تەنیا ڕەخنە نیە کە تۆ دەیگریت بەڵکو هەوڵی کوشتنە".

**-زۆر لە خوێندکاران و یاریدەدەرەکانت بەدەست ترۆوما (زەبری دەروونی)ی توگندهات-ەوە دەناڵێنن. دەستەواژەی بەناوبانگی تۆ لە کاتی پرێزەنتەیشنەکانی خوێندکاراندا بووەتە قسەی سەر زاران کە دەتگوت**

**" من لەمە تێناگەم".**

–دەزانی چۆن بوو، هیچ مەبەستێکی ستراتیژی لە پشت ئەم هەڵوێستە نەبوو.

**– بۆیە وا کوشندە بوو**

– ڕەنگە ئەمەیان لە دایکمەوە بۆم مابێتەوە. ئەویش وا ساکار بوو.

**– زۆر لە خوێندکارانت ئەمڕۆکە پرۆفیسۆرن. هەست بەوە ناکەیت کە قوتابخانەیەکت بۆ بەجێهێشتوون؟**

– نەخێر، من لە زووەوە ئەرکی خۆمم وەك پرۆفیسۆرێکی ئەڵمانی لەوەدا بینیوە کە بەرامبەر بیری قوڵی ئەڵمانەکان بەرچاوروونییەك بێنمەکایەوە. پێشموایە، ئەگەر شتێکم هێنابێتە گۆڕێ، پتر خۆی لە پەیداکردنی هۆشیاریی لە میتۆدا دەبینیەوە.

بەڵام کەم کەس هەیە کە لەسەر ئەم ناوەڕۆکانە کاربکەن.

**پێت خۆش بوو قوتابخانەیەك دابمەزرێنیت ؟**

– نەخێر، ئەمەیان بۆ من کارێکی زۆر دووردەست بوو.

**– لەبەر ئەوەی تۆ دڵنیایی ڕەتدەکەیتەوە ؟**

– من دڵنیایی ڕەتدەکەمەوە ؟

**– تۆ ناوت لێناوە (سەرلەنوێ پێداچوونەوە)، هەموو دەمێك لە وتارە تازەکانتدا بۆچوونەکانی بەرهەمە کۆنەکانت ڕاست دەکەیتەوە.**

– بەڵێ، ئەمەیان زۆرجار لە فەلسەفەی ئاکاردا بەسەرمدا هاتووە. من بەردەوام دەکەومە ئەم زەلکاوە.

**– بۆ خوێنەر ئەمە وا دێتە بەرچاو وەك بڵێیت بۆ ئەوە بابەتێك دەنووسیت کە پاش ماوەیەکی تر فراوانتر بیری لێبکەیتەوە و دواتر کۆنەکە وەلانێیت.**

– نا ئەمە شێوازی بیرکردنەوەکە نییە، تەنیا هەندێ جار شتگەلێك بلأودەکەمەوە و لە پێشدا دەزانم تەواو ڕاست نین، بەڵام ئەمە کێشە نییە، لێگەڕێ با خەڵکی پێیەوە ماندوو بن.

**– کەواتە، جۆرێك لە دابەشبوونی کارە؟**

– نەخێر، خەڵك وا بیر ناکاتەوە. من هەست ناکەم کە خەڵکی زۆرینەی ئایدیا گەورەکانمی هەرس کردبێت.

**– هەستێکی وا لای تۆ پەیدابووە کە لەوانەیە کار لەسەر ئەو بابەتانە بکەیت کە خراپت هەڵبژاردبن ؟**

– نەخێر، لە ڕاستیدا هەرگیز ئەو هەستەم لە لا پەیدا نەبووە. بۆ هەندێ بابەت وا بیردەکەمەوە کە بابەتی گرنگن، بۆ هەندێ بابەتی تریشەوە پێمواییە بە پێی پێکهاتەی هزریم دەتوانم هەر قسەیان لەسەر بکەم.

**- باشە تۆ چۆن مرۆڤێکیت؟**

من کەسێکم کە تا رادەیەکی زۆر کورتبینم. من ئەو کەسە نیم کە تێڕوانینێکی گشتبینانەم لــە بــارەی هاوپەیوەندیــە کۆمەڵایەتیەکانــەوە هــەبێت. هــەر بەمشــێوەیەش دەتــوانم کێشــە بچــکۆڵەکانی خــۆم رایــی بکــەم. لێــرەدا مــن خەســڵەتێکی ســودمەندم هەیــە کــە ئــەوانیتر نییانــە. ئــەویش ئەوەیــە کــە مــن زۆر بــە وردی کاردەکـەم. لـە راسـتیدا مـن هیچـم نیـە بیڵـێم لـە بارەی ئەو شتانەی بۆ کۆمـەڵگا گرنگن. چونکە ئەمــە بــۆ مــن زۆر ئــاڵۆز و چــەتونە. مــن هــەر لەبارەی ئەو شتانە ئەدوێم کە لای هەر کەسێك وەك تاکێك هەیە. لە ژێر ئەم بارە زۆرم کێشا کە مـن نـاتوانم ئەزمونگەرایانـە کاربکـەم. هـەر ئـەو کاتـەش لەبـەر ئـەوە وازم لـە زانکـۆی هایـدلبێرگ هێنا بۆ ئەوەی فێربم بەمشێوەیە کاربکەم.

**- کارکردنی ئەزمونگەرایانە بۆ تۆ چی دەگەیێت، دەتویست کاری کۆمەڵناسی بکەیت ؟**

- کۆمەڵناسی و مێژوو. بەڵام ئەمە هەمووی گەمـژەیی بـوو. تـەنها شانسـم لـەوەدا هـەبوو کە هابرماس ئەو پێشنیازەی خستە بەردەستم کە لــە پەیمانگــەی شــاری شــتارنبێرگ کاربکــەم. ئەگــەر بەراســتی چــەند ســاڵێك بــێ تــوێژێکی پەیوەنـدی کـارم بکردایـە خـراپ دەشـکایەوە. بــەڵام مــن دەمویســت فێــربم ئەزمونگەرایانــە کاربکــەم. ئێســتەش دەســتم لــەم بیرۆکەیــە هـەڵگرتووە. ئێسـتا تـەنها ئـەو کارانـە دەکـەم کە دەزانم دەتـوانم بیانکـەم. ئەوانـەی سـوور دەزانم پێم ناکرێن، وازیان لێدێنم.

**- سەرەڕای ئەمەش بـۆ نمونـە لـە بـارەی شـەڕی یەکەمی کەنداوەوە قسەت هەبوو.**

- پێدەچێت ئەمانە کۆمەڵێك پرس بووبن کە دەکرا تاڕادەیەك بە ئاسانی چوارچێوەیەکیان بۆ بکێشـێت. خـۆ مـن لـەبارەی مەترسـی شـەڕی ئەتۆمییش موحازەرەم دابوو. بەڵام ئەو کاتـەش هـەر بـە تـرس و لـەرزەوە شـانم لـەو موحازەرانـە دەدا کە لە سەرەتادا پێشکەشم کردبوون.

**- ئەوانەی رەخنە لە خۆیـان دەگـرن دەڵـێن تـۆ هەمیشە ئەو لایـەت نـەگرتووە کـە دەبوایـە بیگریـت، کەچی لە هەموو حاڵەتەکاندا باشترین بەڵگەت بۆ ئـەو لایەنانە دەهێنایەوە.**

- بـەڵام سـەرەڕای ئەمـەش مـن لـە سـاڵانی هەشتادا تووشی چەقبەستێك هاتم. ئەو کاتە لە بەرلین تەنها یەك دوو موحازەرەم دا کە کەڵکیان هەبوو. ئەوانیتر هیچ نەبوون.

**- فەلسەفە چ ئەرکێکی لەسەر شـان مـاوە ؟ ئایـا لەبەر زانستی توێژینەوەی رەفتار وزانستی توێژینــەوەی مێشك و بیۆلۆژیای تەواوکاری جێی بۆ دەمێنێتەوە ؟**

- لێـرەدا مـن زۆر خـۆمی لێ لادەدەم. ئـەوەی پەیوەندی بە توێژینـەوەی رەفتـار بێـت، پێموایـە کــە زۆر خێــرا و بــە پەلــەن لــە دۆزینــەوەی هاوشــێوەیی. بــۆ نمونــە هاوشــێوەیی نێــوان ئاکـاری مـرۆڤ و سـوودی ئـاژەڵ بـۆ خـۆی. ئـەم کــارە کــۆنراد لــۆرێنس کــردی. ئــەوەی پەیوەندیشـی بـە توێژینـەوەی مێشکەوە هـەبێت پێموایە ئەو شتانەی ئێستا لـەم بوارەدا دەکرێن زۆر شێتگیرانەن.

- بۆچی ؟

- پیاو تەنها دەتوانێت بیسەلمێنێت کە لە چ بەشێکی مێشکدا کـام پرۆسە کاردەکـات. بـەڵام ئـەو پرۆفیســۆرانەی لــە بــواری تۆژینــەوەی مێشــکدا کاردەکــەن تیــۆرە لــەبارەی نــەبوونی

ئـازادی مرۆڤمـان دەخەنـە پێشچـاو. تـەنیا بەهانەشیان بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە دەڵێن، ئێمـە زانـاین و باوەڕمـان بـە حەتمیـەت (دیتـەرمینیزم) هەیـە. ئـەوان هـەر ئاوڕێـك لـە ئەدەبیاتی فەلسەفەی ئەو چەند دەیەیەی دوایی نادەنـەوە کـە هەوڵیـداوە حەتمیـەت و ئـازادی ویست وەك دژبەیـەك تەماشا نـەکرێن. مـن ئـەم دەنگۆیە بە تەواو بێ بنەما دەبینم.

**- بـەڵام زانستی توێژینـەوەی مێشـك هێشـتا لـە سەرەتاکانیدایە.**

- لــە ســەد ســاڵی ئاینــدەدا لەوانەیــە توێژینەوەی مێشك بۆ فەلسەفە جێی بایەخپێدان بێـت. بـەڵام تـا ئێسـتا وا نـەبووە. مـن بـۆ خـۆم توێــژەری سروشــتم و مــرۆڤ وەك بەشــێك لــە گەشەسەندنی بیۆلۆژی دەبینم. بەڵام ئەوەی لە زانستە بیۆلۆژیەکانـدا دەکرێت و پەیوەنـدی بـە مرۆڤەوە هەیە، هەندێکی کەمی بەسودە.

**- ئەگەر توێژینەوەی مێشك شتێکی ئەوتۆی نـەبێ کە بیخاتـە بەردەسـتمان، ئایـا زانسـتێکی فەلسـەفی مسۆگەر هەیە ؟**

- نەخێر، بەڵام مرۆڤیش پێویستی پێی نیە. ئـارەزووی هـەبوونی زەمینەیـەك کـە لەسـەری بوەسـتیت ئەمـە پاشمـاوەی ئاگاییـەکی دەسەڵاتخوازە. ئەمە پاشەکەوتی ئەو دەمانەیە کـە مـرۆڤ پێیوابـوو هـەموو شـتێکی گـرنگ و جەوهـەری لـە خوداوەندەکانـەوە بـۆی ئاشکرادەکرێت.

## پەراوێز

*ئێرنیسـت توگنـدهات پرۆفیسـۆری فـەخری فلسەفەیە لـە زانکۆی ئازادی بـەرلین. ئـەو لـە تـوبینگن و ئەمریکای لاتین دەژیت. بەرهەمە هـەرە تازەکەی بریتییە لــە (ئیگۆسێنتریســیتی و ســۆفی لــە توێژینــەوەی ئەنترۆپۆلۆژییــدا) کــە دەزگــای *C.H.Beck* لــە ســاڵی 2003دا بڵاویکردووەتەوە.

*ئولریکـە هێرمـان، پـەیامنێری ڕۆژنامـەی (*taz*)ە لـە بــواری ئــابوریی سیاســیدا و تەمــەنی 43 ســاڵە و فەلسەفەی خوێندووە.

## سەرچاوەکان

بە زمانی ئەڵمانی: ***taz.de*** / 2007-7-28

بــە زمــانی ئینگلیــزی: ***signandsight.com*** 20/08/2007

کـاك -ئـاوات دەوڵـەت- لەگـەڵ دەقـە ئەڵمانیەکـەدا بەراوردی کردۆتەوە.

# بانیژە

**شەهلا مەعسوم نەژاد**

**لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد**

فینجانی قاوەکەم هەڵدەگرم و دەچمە سەر بانیژەکە. بانیژەکە دەڕوانێتە ئەو کۆڵانە داخراوەی کە لقی ئاڵۆزی شۆڕەبییەکەو گوڵە یاسەکانی پێوە هەڵواسراوە .من هەر لەمنداڵییەوە حەزم لەکۆڵانی داخراو بوو. ئەو دەمەی هێشتا نەدەچوومە قوتابخانە ماڵەکەمان لە کۆڵانێکی داخراودا بوو، بۆیە دایکم دەیهێشت لەگەڵ منداڵەکانی دراوسێماندا لەکۆڵان یاری بکەین چونکە دەیووت لە کۆڵانی داخراودا ئۆتۆمبیل هاتوچۆناکات و بۆ یاری منالان جێی مەترسی نییە. هەندێجار کە منالی دراوسێکانی لێ نەدەبوون دایکم بڕێك نۆکی بڕژاوی بۆ لەکاسەیەك دەکردم و منیش وا ڕاهاتبووم کە هەمیشە کاسەکە هەڵگرم و لەسەر ئەو تاقەپلیکانەیەی بەردەم ماڵەکەماندا دانیشم و لەسەرخۆو لەفرسەتدا دانە دانە نۆکەکان بخەمەدەممەوە، هەڵبەتە ئەم کارەشم ئەوەندە بەکاوەخۆ دەکرد کە لەگەڵ تەواوبوونی دەنکە نۆکەکانی ناو کاسەکەدا خۆرئاوا دەبوو. ئەوسا منیش ئاسوودەو دڵنیا دەبووم کە ئیتر شەوە، کاسە بەتاڵەکەم هەڵدەگرتو دەچوومەوە بۆماڵەوە. فینجانی قاوەکە دەخەمە سەر ئەو جێ گوڵدانەی لە قەراغی بانیژەکەدا دانراوەو خۆم لەو گوڵە یاسانە ورد دەبمەوە کە کەوتونەتە سەردیوارەکەی ئەوبەر. من ڕۆژگەلێکی خۆشم لەسەر ئەم بانیژەیە بەسەربردووە. ئەسڵەن ئەم خانووەشم هەر لەبەر ئەم بستە بانیژەیەی کە ئاوا رووی کردوەتە کۆڵانە داخراوەکە هەڵبژارد، داوودیش هەڵبژاردنەکەمی پەسەندکرد. ئیتر هەشت ساڵ پێش ئێستا کە بووین بە هاوسەری یەکتر هاتینە ناو ئەم خانووە. هەموو عەسرێك کە داوود لە دوکانی زیوەر فرۆشییەکەی دەهاتە ماڵەوە دوودانە قاوەی تاڵم دروست دەکرد و

دەمهێنایە سەر ئەم بانیژەیەو چاوەڕێم دەکرد تا داوود دەست و دەموچاوی بشوات و بێت بەرەوڕووم دانیشێ، لەسەر ئەو کورسییەی کە دەسکاری نەکرابوو و بەزستان و بەهاوین لەو سەر بانیژەیەدا بوو، تەنیا لە زستاندا نایلۆنێکمان پێدا دەدا تاکو بەفروباران تێکی نەدات . زۆر جاری واش دەبوو کە بەفروبارانیش دەباری جلی گەرممان لەبەردەکرد و دەچووینە بانیژەکە و هەر لەسەر هەمان مێز دادەنیشتین و من لە دەنکە بەفرەکان ڕادەمام کە بەسەماوە دەهاتنە خوارێ و دەرژانە ناو فینجانە قاوەکەمەوە، دەشمدیتن چەند خێراو بروسکەئاسا دەتوانەوە و دەبوونە ئاو. کە داوود دەهاتە باڵکۆنەکە هەمووشتێك ساز و ئامادە بوو ، ئیتر دەکەوتە باسکردن، باسی تێکڕای ئەو کارانەی لەدرێژایی ڕۆژەکەدا کردبووی. باسی هەموو ئەو کەسانەی دیبوونی، هەروەها باسی هەموو ئەو زیوەر و مجەوهەراتەی فرۆشتبوونی، منیش بەچوارچاوەوە لێی ورد دەبوومەوە، جارجارەش قومێکی لە قاوەکەم دەداو حەزمدەکرد فینجانەکەم ئەوەندە گەورە بوایە کە تاشەوو تا ئەو کاتەی داوود قسە دەکات و دەدوێ قاوەم لێ نەبڕێ و ناچار نەبم بۆ تێکردنی فینجانێکی تر بچمەوە ژوورەوە. داوود ڕازی نییە من کاربکەم. ئەسڵەن هەر لەگەڵ کارکردنی ژندا نییە و دەڵێ ئافرەت دەبێ هەر لەماڵەوە بێت و خەریکی کاری ماڵەوە بێت. منیش ئێستا وەکو داوود بیردەکەمەوە و دڵم پێوەنییە لە دەرەوەی ماڵدا کار بکەم . جاخۆ لە ماڵەوەدا ئەوەندە کار هەیە سەرقاڵت بکات، ئیتر ئەم دوو منداڵەی کە

وەکو گوڵ گەورە بوون. ئەم هەموو هۆڵ و ژووری میوان و موبەقەی کە هەمیشە وەکو ئاوێنە بریسکەیان دێت ، ئەم شام و قاوەڵتی و بەرچاییەی کە دەیبینی هەموو کاتێ و لە ئان و ساتی دیاریکراوی خۆیدا ئامادەیەو ئەو مێزەی هیچ کاتێك بێ زەڵاتەو ماست و سەوزی نەبووە، هەموو ئەمانە کۆڵێك ئیش و کۆڵێك کاتیان دەوێت، بۆیە داوود حەقێتی بە کارکردنی من ڕازی نابێت. من و داوود لە زانکۆ یەکمان ناسی، هەردووکمان بەشی ئابووریمان خوێند. داوود کەسێکی هێمن و کەم دوو بوو، هەندێجاریش کە دەدوا ئەوەندە دەنگی نزم بوو، بەزەحمەت دەتتوانی لێیبگەی، پاشان کە کەوتە ناو کاری زیوەر فرۆشتنەوە، وردە وردە دەنگی دەرهات و دەکرا ئیتر لە قسەکانی بگەی. یەکدووجار کە لێم پرسی: بۆچی لە بوارەکەی خۆیدا کارناکات، وتی "خۆی لە ڕاستیدا هەر من لە بوارەکەی خۆمدا کاردەکەم، چونکە بناغەی ئابووری مجەوهەرات و زیوەر فرۆشتنە." من خۆشم کەسێکی کەم دووم بۆیە کە داوود چەندین کاتژمێر دەدوا بێزار نەدەبووم و حەزم دەکرد نۆرەی قسەکردنی من هەرنەیەت چونکە من شتێکم بۆ وتن پێ نەبوو. من لەبەیانەوە تا شەو لەماڵەوەم و هاتوچۆم لەگەڵ کەسدا نییە. هەموو ئەو شتانەش کە دەربارەی چێشت لێنان و ئەو شتانەن بە تەلەفۆن لە دایکم یان هاوڕێیەکم دەپرسم و دوایی یەکسەر خواحافیزی دەکەم، چونکە لەوانەیە داوود لەو کاتانەدا تەلەفۆن بکات و منیش نامەوێ ڕاگیری بکەم. جگە لەوەش کچە گەورەکەم لە پۆلی یەکەو دەبێ لە ئامادەکردنی وانەکانیدا یارمەتی بدەم،

بچووکەکەشم چوار ساڵانە و دەبێ لەگەڵیدا خەریکی وێنە کێشان بم. داوود قەت تاقەتی منداڵی نەبوو، ئارەزووشی دەکرد کە کوڕی ببێ و هەمیشە دەیووت: "منداڵ واتە کوڕ. مرۆڤ بۆیە منداڵی دەبێ تاوەکو ئەسڵ و نەوەی بمێنێ و بەردەوام بێ". حەزدەکەم سبەی کە پیر بووم، پیاوێك پێم بڵێ "بابە" فینجانە قاوەکە بەسەرەوە دەنێم. قاوەکەی ئەمجارە کڕیومە تۆزێك بۆن شێی لێدێت . داوود قاوە باش دەناسێ. نازانم لەکوێی دەکڕێ. ئەو قاوانەی داوود دەیکڕین بۆنی شێیان لێنەدەهات، حەیف ئێستا کاتی ئەو جۆرە کارانەی نییە، ئێستا ئیتر خێزانداری تەواوە. دوو ساڵ بەر لە ئێستاو لە رۆژانێکی وەکو ئەمڕۆدا بوو کە زانیم داوود ژنی هێناوە. لە ئارایشتگەرەکەی خوشکەکەم بیست. هەمووی خەتای خوشکەکەم بوو کە بەزۆر بردمی بۆ ئارایشتگا تا قژم نیگرۆ بکەم . قژی من خاوو درێژە. خوشکم دەیووت :"قژت ئەوەندە خاوە مرۆڤ تاقەتی دەچێ شتێکی لێبکات." ئارایشگەرەکە بەدەم لوول کردنی قژی منەوە قسەی بۆ خوشکەکەم دەکرد کە گوایە موستیلەیەکی گرانبەهای زۆر جوانی لە پەنجەی یەکێك لە مشتەرییەکانیدا دیووەو لێی پرسیووە کە ئەو موستیلەیەی لەکوێ کڕیوە. ژنە جحێڵەکەش وتویەتی کە ئەو موستیلەیە دیاری مێردەکەیەتی و ناوی مێردەکەشی بردووە کە ناوی داوودە. سەرەتا وشك بووم. دوایی بیرم کردەوە کە رەنگە زیوەر فرۆشێکی تریش هەبێت کە ئەویش هەر ناوی داوود بێت، ئیتر منیش هەر لە خۆمەوە کونجکۆڵ بووم و دوای چەند رۆژێك لە داوودم پرسی. لە پێشدا خۆی گێل دەکرد و دەیووت ئەم قسەقۆڕانەت لە کوێوە هێناوە .بەلأم من ئەوەندە لێی ئالأم و گیرم لێدا تا لە دواییدا رۆژێك دانی بەوەدا نا کە ژنی هێناوە. توند کێشام بەسەرمدا، ئینجا بەمشت بەربوومە دیوارەکەو قیژاندم کە ئیتر نامەوێ بۆ تەنیا ساتێکیش بیبینم. لەم ژوور بۆ ئەو ژوور رامدەکرد و مناڵەکانیش بەدوامدا. داوودیش پێ بەپێی من ئەم ژوور و ئەو ژووری دەکردو دەیووت: راوەستە با قسە بکەین. رۆژی دوایی بڕیارمدا لەماڵ بچمە دەرەوە ، نەك هەر ئەوە بەڵکو ویستم هەر لە ئێران بڕۆم. بچم بۆ جێگایەك هیچ کەس هەواڵم نەزانێ. بیستبووم کە جێگایەك لە هیندا هەیەو خەڵك دەچن لەوێ خەڵوە دەکێشن. جێگایەك زۆر ئارام و خۆش. لەوێ دەچمە لای کەسێك کە نەخۆش چاك دەکاتەوەو هەندێجاریش مردوو زیندوو دەکاتەوە، بیستبووم زۆر کەسی لە وێڵی و سەرگەردانی رزگار کردووە. ئەگەر بچوومایە بۆلای تکام لێدەکرد کە حاڵ و رۆژم بگێڕێتەوە بۆ حەفتەیەك پێش ئێستا کە هێشتا هیچ رووی نەدابوو، بەلأم هەر هەمان حەفتەی پێشوو زۆر شت روویدا بوو و داوودیش بڕیاری خۆی دابوو. تەنیا جیاوازییەکی کە هەیبوو ئەوەبوو کە من هێشتا هیچم نەدەزانی بۆیە وا حاڵم زۆر خراپ بوو. بەلأم دەبوو کەمێ لەسەر خۆم بوەستامایە و کاتم بەخۆم بدایە، هەروەها دەبوو سەبارەت بەو بڕیارەی کە دەبوایە بیدەم و ئەو جێگایەی دەبوایە بچم پرس و جوو بکەم. کە لە زانکۆ بووم جارێك بڕیارمدا لەگەڵ تیپی کەژەوانەکانی زانکۆدا بچم بۆ ئەو کێوانە، تەنانەت هەموو تەمەنم لەکێودا بەسەر بەرم ئیتر

گرنگ نەبوو چ کێویێك بێت. هەر ئەوەندەی وا بێ تێیدا بژیت، بەلاّم نەچوم، چونکە پێم وا بوو ڕۆشتنی سەر زەوی تەختم پێ خۆشترە لەوەی بەکێودا سەرکەوم. ئەو ڕۆژەش کە ویستم لەماڵ بچمە دەرەوە، بیرم کەوتەوە کە دەبێ زۆر خۆم ئامادە بکەم، تازە منالّەکانیش بوون و دەبوایە بیرم لە حالّ و بالّی ئەوانیش بکردایەتەوە. ڕەنگە باشتریش بوایە ئەگەر منالّەکانم بسپاردایەتە دەستی داوود، هەرچییەك بێت داوود باوکی منالّەکان بوو، هەرچەندە من لە داوود زیاتر پێیانەوە ماندوو بووم، بەلاّم کە بیرم هاتەوە داوود ژنی هێناوە و بیریشم هاتەوە ژنی داوود دەبێ بەچی منالّەکان.

داوود ووتی: "تەلاّقی دەدەم ."

وتم: "بۆچی هێنات ؟"

وتی: "لەبەر ئەوەی بێ پشت وپەنا بوو ، قوتابییەکی زانکۆو کچێکی بێ پشت و پەناو بێکەس بوو لەم شارەدا، دەبوایە یارمەتی بدەم .داوود دەیوت: ژنێکی میهرەبانەو زۆر ئاگای لە داوودە. دەیوت دەبێ ئارام بگرم تا بتوانێ هێواش هێواش کاروباری تەلاّق جێبەجێ بکات و لێی جیا بێتەوە. داوود کاتی دەویست، قسەکانی داوودم کە بیر دەکەوێتەوە، بەدەست خۆم نیە پێکەنینم دێت، کچێك، قوتابییەکی زانکۆ، بێ جێگاو ڕێگاو بێ پەنا. قومێکی تر لە قاوەکەم دەدەم. لە شەقامە چۆلّەکەی پالّ مالّەکەمان، یەکێك پێچ دەکاتەوە و دێتە کۆلاّنە داخراوەکە. چەند شەقاوێك دێتە پێشەوە، بەلاّم وەکو ئەوەی بە هەلّە هاتبێ چونکە لەم کۆلاّنەدا جگە لە دەرگای مالّی ئێمە زیاتر دەرگایەکی تری تێدا نییە. داوود مێژووی تەلاّقدانی ژنەکەی دواخست. دەیوت چۆن دەتوانێ ژنێکی دووگیان تەلاّق بدات؟ کە بیریشی لێدەکەمەوە و خۆم دەخەمە جێی ژنەکە دەبینم داوودیش ڕاست دەکات. بەلاّم کە دەمەوێ دووبارە بێمەوە جێگاکەی خۆم هەموو شتێکم بیر دەچێتەوە و ناتوانم خۆم لەجێی خۆمدا دابنێمەوە. ئەم ڕۆژانە بەهار حەشر دەکات و بۆنی یاسی سەردیوارەکە تێکەلّ بەبۆنی قاوەکە بووە، منیش بەیادی ئەو ڕۆژانەی بەفر دەباری فینجانی قاوەکە دەگرمەدەستم. دوایین جار کە بەفر باری قاوەیەکم بۆ خۆم و داوود دروست کردو نایلۆنی سەر کورسییەکانم لادا تاوەکو لە بالّکۆنەکەدا دانیشین. بەلاّم داوود دەبووایە زوو برۆشتبایە. دەیوت ژنەکەی مانگ و ڕۆژی خۆیەتی. داوود شەو نا شەوێك دێت بۆ مالّەوە بەلاّم ئیتر کاتی بالّکۆن دانیشتنی نییە. زۆر کاردەکات، بۆیە هەر کە دەگاتە مالّەوە بەتەواوەتی ماندووە، بەتایبەت کە ئێستا کوڕە بچووکەکەی سێ مانگانەیە. دەلّێ ژیان خەرجی زۆری دەوێ. دەلّێ دەبێ وێژدانی بێ و پەیڕەوی عەدالەت و یەکسانی بکات. هەر لە بالّکۆنەکەوە، سەیرێکی سەعاتی سەر دیواری ژوورەکە دەکەم. لە حەوتو نیو تێپەڕیوە. ئیمڕۆ نۆرەی من نییە. دەبێ وردە وردە هەستم و چێشت و نانی ئێوارە بۆ منالّەکان تێکەم، زەلاّتەشم دروست کردووە، هەر ماوە سۆسەکەی بەسەردا بکەم.

**سەرچاوە:**

لە کۆمەلّە چیرۆکی "ئیمڕۆ نۆرەی من نییە" وەرگیراوە

# دژوار

## (ناساندنی فێرناندۆ سۆرنتینۆم)

موحەمەد ڕەزا فەرزاد
لە فارسییەوە: سەروەر عومەر

"من فێرناندۆ سۆرنتینۆم .بە ڕاناوی کەسی یەکەم دەنووسم تابەرپرسی وتەکانم بم. لە 8ی نۆڤەمبەری ساڵی 1947 لە بۆینس ئایرس لەدایک بووم. بەپێی وتەی خاوەن ڕاکان، لەچیرۆکەکانمدا تێکەڵەیەکی تایبەت لە فەنتازیاو تەنزی شاراوە هەیە، کە دەگاتە حاڵەتێکی گرۆتسک . زیاتر حەزدەکەم بخوێنمەوە تابنووسم . لەڕاستیدا زۆر کەم دەنووسم. لەماوەی ئەم ساڵانەدا، ژیاننامەیەکی ئەوتۆم نەبووە تا پێشکەشیکەم... وەك هەمووان،کەم و زۆر چەند خەڵاتێکم وەرگرتووە. بەگشتی، مرۆڤێکی تاڕادەیەك شادومانم.

"هەموو شتێك لە تێکچونێکی سادەوە سەرچاوە دەگرێت و لە کۆتاییدا بەهەلومەرجێکی دژوار ، واقیعیەتێکی توندوتیژو گۆڕانێکی بەر لەوەخت کۆتایی دێت. ئەم تێکچونە سادەیە دەتوانێت بەشکانی کلیلێك لە قوفڵدا، قوفڵێکی لەناکاو لەپیادەڕۆدا، ترس و تەلقینێکی بێهۆ یا کەوتنە خوارەوەی چاوەڕێنەکراوی چەتر یا جانەوەرێکەوە ، دەستی پێکردبێت. وەها چیرۆکێك پەیوەستە بە سەرەتاو کۆتاییەوەو بۆتەی وەها گێڕانەوەیەك. پێویستییەکی زۆری بەبەریەك کەوتن، خێرایی ، فەنتازیاو جۆرێك مۆتیفی شۆخ و شەنگە. لەگەڵ ئەوەی "پەرێشانی" سورنتینۆیی لەواقیعیەتی دەرەکییەوە وەرگیراوە بەلام واقیعیەتەکان، بە جیهانی "واقیعیەتە چیرۆکیەکاندا" ( *fictional realities*) تێدەپەڕن.

جیهانی ئەڵتەرناتیڤ و ناپیشاندراوە کە یاساو ڕێسـا دەرەکییـەکان بەرهـەم ناهێنێتـەوە، هەڵیدەگێڕێتـەوە ، بەگاڵتـە دەیگرێـت و ئەمـەش بەرهـەمی هێـزی ڕەخنـەگری خەیاڵـە. لـە چـیرۆکەکانی ئـەودا کـە خـاوەنی ڕۆحێکـی کافکـایی و زمـانێکی وتـارین، دەروونناسـی تاکـەکان ڕۆڵێکـی ئـەوتۆی نییـە تـەنها وەسـفی گرفتـاری و قـەیرانی مرۆڤـەکان بنەمایـە. گـرنگ گاڵتەیەکـە کـە چـڕکراوەتەوەو کارەسـات و مەینەتییـەك کـە ڕوویـداوەو ئایـا ژیـان، سـەربوردەی جەنگـە جیهانییـەکان و ڕەوتـی بەرفراوانی مێـژوو و شارستانییەتی مرۆڤایـەتی بـەم شـێوەیە نـەبووە؟ یـەکێك لـە تایبەتمەندیـەکانی کەسێتییەکانی چیرۆکەکانی سـورنتینۆ، هـەر ئـەو نەپرسـین و خـووگرتن و خۆگونجاندنەیە لەگەڵ هەلومەرجی نامۆییاندا. لەچـیرۆکی "بـەرگری تاکەکەسـی" دا جـەنگی ساردی نێوان دوو خێزان دەبێتە هۆی ڕاڕایی و کینایەتیـەکی گـەورە. مرۆڤـەکانی ئـەم چیرۆکە "توندوتیـژی" پێشـکەش یـەك دەکـەن. هەڵبـژاردنی نـاوی "ئانخینـە ڕۆ هاشـۆڤیتس" بەتەواوەتی لەبەرئەوەیە کە شارەکانی ئەمڕۆمان بەشـتێك جگـە لـە کـورە مـرۆڤ سـوتێنەرەکانی "ئاشـۆڤیتس" و داخائۆو مالـت هـاوزن نـەزانین. تەنانـەت جـەخت دەکرێتـەوە کـە ئـەم شـارە لـە تەنیشـت بـۆینس ئایرسـەوە نییـە. "ڕووزەرد" بـوون ،"دریـژدادڕی"، و "ناسـاندنی" نـەژادی ئـەڵمانی ، "بازوکـا"ی دروسـتکراو لەئاسـیاو "چاکەت"ی پاریسی سەرجەم کۆمەڵێك خوازەن بـۆ جیهـانی بەڕواڵـەت شـادی پـاش جـەنگی جیهـانی. ئـەو مرۆڤانـەی لەسـەر کوشـتن و تۆڵـە سـەندنەوە دانیشـتوون و بەزەردەخەنـەوە پێشکەشی یەکدی دەکەن.

دایانا گارسیا سیمۆن دەڵێت"کافکا دووبارە گەڕاوەتـەوە" بەشـێکی گـەورەی کارەکـانی سۆرنتینۆ، بەرهـەمی تێکـەڵی و گشـتگیرکردنی بابەتی کافکاییانەیە: لە چیرۆکەکانی ئەویشدا دیکتـاتۆرە بچـووکەکان دەبیـنین کـە گرفتـاری تـرس و بوودەڵییـە پووچـەکانی خۆیـانن، مرۆڤگـەلێك کـە لـە ئەڵقـەی پووچپەرسـتی سیسـتەمی بیرۆکراتیکـدا گرفتـارن. گەرچـی تێڕوانینە ڕەخنەییەکانی سورنتینۆ لە قۆناغی دیکتاتۆرییـەتی ئەرجەنتینـدا (1976ـ1983) لـەودیو گێڕانـەوەی گاڵتـە ئامێزانـەی ئـەوەوە شـارایەوە و دەرنەکـەوت، بـەڵام ئـەمڕۆ کۆمـەڵی ڕەخنەگران باس لە دەرکەوتنی کافکایەکی نوێ دەکـەن. لانیکـەم لـە چـیرۆکەکانی وەك "ترسـە بێهۆکـان"، "ژمـارە پێوانەییـەکانی ئەنـدازیار سیمۆن" ،و "یەکجۆر ژیان"دا وەها ئامادەییەك دەبینرێـت. گەرچـی ئـەو خـۆی هەرچـی زیـاتر لەژێر کاریگەری باوکە ئەدەبییەکانی وەك بیوئی کاسـارس، بـۆرخێس، کۆرتاسـارو دینـۆی (ڕۆژنامەنووسـی ئەرجـەنتینی)دا دەبینێتـەوە. ئەو تا هەنووکە شەش کتێبی چیرۆکی نووسیوە وەك "تۆڵەسـەندنەوەی مردووەکـان" "تەوالێتـە سەدسـاڵەکان"و "گەڕانـەوە بـۆ دڕندایـەتی" و چەند کتێبێکـی منداڵان وەك"چیرۆکەکانی دون خۆرخـە سـالامە"و "بەسـەرهاتەکانی مـونتی ڕۆسـۆ". دوو کتێبی گفتوگۆی هەیە کە حەوت گفتوگـۆ لـەخۆ دەگرێـت، لەگـەڵ خۆرخـە لـویس بـۆرخێس و ئـەوی دیکـە لەگـەڵ هـاوڕێی خۆشەویستی، ئادۆڵفۆ بیۆئی کاسارس.

دەڵێت: ڕقم لە ئەدەبیاتی بەرهەڵستکاری کۆمەڵایەتی دەبێتەوە، بۆ من ئەستەمە کە بتوانم هەڵسوکوتی ڕۆژانەی کرێکارێکی ساردخانەی گۆشتە بەستووەکان وەسف بکەم. ئەمانە ماندووم دەکەن، خوێنەریش هەروا. تەنها شتێك دەنووسم کە بۆخۆشم سەرنجڕاکێش و سەرگەرمکەر بێت.

## بەرگری تاکەکەسی

نزیکەی دەی بەیانی شەممە بوو. کوڕە گەورەکەم کە سەرچاوەی بەدکارییە، لە بێئاگاییدا بەپارچە تەلێك لەسەر دەرگای ماڵەکەی بەرامبەرمان، وێنەی گوڵ و بنچکێکی کێشابوو. شتێکی ئەوەندە ترسناك و ناجۆر نەبوو، تەنها چەند هێڵێکی خوارو خێچی بچووك، ئەوەندە بچووك کە هەرکەسێك بەدوایشیدا بگەڕایە نەیدەدۆزییەوە. بەباوەڕو بڕوایەکی تەواوەوە دان بەمەدا بنێم کە: سەرەتا وام بیرکردەوە کە بابەتەکە دەبێت نهێنی بمێنێتەوە (کامەتان تاهەنووکە وەها چرکەساتێکی لاوازو زەبوون ئامێزتان هەبووە؟) بەڵام دوایی تێگەشتم کە ڕاستەکەی ئەوەیە داوای لێبوردن لە دراوسێکەمان بکەم و پێی بڵێم تێچوونی زیانەکان دەدەم. ئەم بڕیارە ڕاستگۆیانەش لەبەر ئەوەبوو کە دڵنیا بووم تێچوونی زیانەکان زۆر کەمە.. خێرا چەند تەقەیەکم لەدەرگاکەیان دا. دەربارەی دراوسێکەمان تەنها ئەوەم دەزانی کە تازە هاتبوونە ئاپارتمانەکەمانەوە. سێ کەس بوونو هەرسێکیان موویان بۆربوو. وەختێك قسەیان دەکرد، تێگەیشتم بێگانەن. کە هەندێك زیاتر قسەیان کرد بیرم کردەوە یادەبێت ئەڵمانی بن یا نەمسایی یا سویسری. بە دڵخۆشییەوە پێکەنین و هەر بەسەر خۆشیان نەهێنا. بابەتی زۆر نادیار ئەوە بوو کە تەنانەت وایان پیشاندەدا بە ووردبینیش ناتوانن ڕووشاوی سەر دەرگاکە ببینن. بەدڵنیایی و ڕووخۆشییەوە تەواوی لێبوردنەکەی منیان ڕەتکردەوەو وتیان: "کوڕەکان، کوڕن ئیدی" و بەکورتییەکەی تەنانەت قەبوڵیان نەکرد بڕی تێچوونی چاکردنەوەکەش بدەم. پێکەوە تەوقەمان کردو لەنێوان پێکەنینە بەرزەکانمانەوە، لەیەك جوودا بووینەوە. وەختێك بۆ ماڵەوە گەڕامەوە، ژنەکەم کە لە کونی دەرگاکەوە هەموو شتێکی بینیبوو، دەستەپاچە لێی پرسیم :"زۆری تێچوو؟" ئارامم کردەوە:"یەك پاپاسیشیان وەرنەگرت". ژنەکەم لەبارێکدا خەریکبوو جزدانە ژنانەکەی دەگوشی وتی"چ بەختێکی باشمان هێنا!" سەرم تەواو وەرنەگێڕابوو کە بینیم زەرفێکی سپی بچووك لە درزی دەرگاکەوە هاتۆتە ژوورەوە. لەناویدا کارتێکی بانگهێشتکردنی تێدا بوو. دوو ناو بە پیتی بچووك چاپکرابوون: وێلهم هوفەر و برۆنهێلد ئێچ کورنفلد هوفەر. بەدەستخەت و بەقەڵەم جافێکی شین زیادکرابوو:" لەگەڵ وێلهم گۆستاف هوفەری بچکۆلانە. پاش سڵاوی گەرم و گوڕمان بۆ کاك سورنتینۆ و هاوسەرەکەی و دەربڕینی هەزار شەرمەندەیی و داوای لێبووردن لەبەر ئەو کاتە ناخۆشانەی کە بەهۆی چەتوونکاری سۆرنتینۆی بچکۆلانەوە تێتانیپەڕاندووە. دەبێت ڕایبگەیەنین کە ئەسڵەن

چەتوونکارییەك لەئارادا نەبووە و خوان بەو هێڵکارییە بچووك و جوانەی ڕەونەقێکی تازەی بە دەرگا کۆنینەکەمان بەخشیوە ." بەسەرسوڕمانەوە وتم : "ئەی خودایە! چ مرۆڤگەلێکی سەیرن! هیچ تووڕە نەبوون، تازە داوای لێبووردنیش دەکەن".

بۆ ئەوەی بەجۆرێك لە جۆرەکان قەرەبووی میهرەبانییەکەیان بۆ بکەمەوە، کتێبێکی منداڵانەی تازە کە وەك دیارییەك بۆ خوان مانوئێلم دانابوو، هەڵگرت و داوام لە خوان کرد تا بە دیاریی بیدات بە وێلهم گۆستاف هوفەری بچکۆلانە. ئەو رۆژە بەخت یارم بوو. خوان مانوئێل بەبێ سەپاندنی هیچ مەرجێکی سوکایەتی ئامێزانە، داواکەی قەبوڵ کردم و بە دڵسۆزانەترین سوپاسەکانی بنەماڵەی هوفەرو منداڵەکانییەوە گەڕایەوە. نزیکەی سەعات 12ی نیوەڕۆ بوو. هەمیشە ڕۆژانی شەممە بەشێوەیەکی سەربڕاوانەو ناسەرکەوتوو هەوڵدەدەم شتێك بخوێنمەوە. دانیشتم، کتێبەکەم کردەوە، دوو وشەم نەخوێنبوویەوە کە لە زەنگیان دا. لەم کاتانەدا من تەنها کەسی ماڵەکەم و دەبێت لەجێگای خۆم هەستم. بە بێزارییەوە ناڵەیەکم کردو بەرزبوومەوە. پیاوێکی گەنجم بینی بەسمێڵەوە لە جل و بەرگی فەرمی سەربازییدا، لەپشت دەستەگوڵێکەوە خۆی شاردبوویەوە کاغەزێکم واژۆ کرد. بەخششێکم پێداو سڵاوێکی سەربازییم بۆ کرد. گوڵەکانم ژمارد ، دوازدە دانەیەك دەبوو. پاشان کارتێکی ڕنگاوڕەنگیشم خوێندەوە: "ویلهام هوفەرو برۆنهێڵد ئێچ. کورنفلد هوفەر ، دروود و سڵاوە گەرمەکانیان ئاراستەی کاك سورنتینۆو هاوسەرەکەی و خوان مانوئێل سورنتینۆی بچکۆلانە دەکەن و بۆ ئەو بنەماڵە بەڕێزە لەبەر ئەو کتێبە جوانەی چیرۆکی منداڵان –خۆراکی گیان – کە ویلهم گۆستافی بچکۆلانە شانازی وەرگرتنی پێدراوە، تەواوی سوپاس و پێزانینیان هەیە".

ڕێك لەو کاتەدا ژنەکەم لە بازاڕ گەڕایەوە. لە بارێکدا کە خەریکبوو جزدانەکەی لوول دەکرد وتی: "چ دەستە گوڵێکی جوانە! چەندە حەزم لە گوڵە! چ باسە، گوڵت کڕیوە؟ هیچکات لەم کارانەت نەدەکرد!"

دەبوو خێراتر دانم پێدابنایە کە ئەوانە دیاریی بنەماڵەی هوفەرن. ژنەکەم لەبارێکدا کە خەریك بوو گوڵەکانی لەگوڵداندا ڕێکدەخست، وتی"ئێمە دەبێت بەجۆرێك لە جۆرەکان سوپاسیان بکەین. میوانییەکی چایی خواردنەوەیان بۆ ساز دەکەین". من بۆ ڕۆژانی شەممە نەخشەیەکی دیکەم هەبوو. قسەکەم قوتدایەوەو وتم :"ئەمرۆ ئێوارە؟" نزیکەی شەشی ئێوارە ، ئیدی دەفرە درەوشاوەکان و سەرمێزێکی سپی، مێزی نانخواردنەکەیان پڕکردبوویەوە. کەمێك بەرلەوە، بەپێی فەرمانەکانی ژنەکەم کە بەشوێن جۆرێك مۆدو سەلیقەی "ڤییەناییدا" دەگەڕا، دەبوو بڕۆم بۆ دوکانی فرۆشتنی خواردەمەنی ئامادەکراوی شەقامی کالبیدۆ، چەند دانە ساندویچی ئێوارانەو نان و شیرینی و میوەو وورده شتی دیکە بکڕم . هەمووشتێکیش پلە یەك، تاڵێکی ئاوریشمینی سپی و سووری ناسکیش بەدەوریاندا، بەڵکو ئارەزووی خواردنی مرۆڤ بکرێتەوە. هەر بەو جۆرەی کە خەریکبووم

بـەلای دوکـانێکی ئـامراز فرۆشـیدا تێدەپـەڕیم، جۆرێك خووی هەژارانەم ناچاری کردم تا نرخـی ئـــەو شـــتانەی کڕیبـــوومن لەگـــەڵ بـــەهای گـەورەترینو باشـترین قوتـووی ڕەنگـی بـازاڕدا بەراوورد بکەم، کەمێك دڵم گیراو نیگەران بووم.

بنەماڵەی هوفەر بەدەستی بەتاڵەوە نەهاتن. دەسـت و باڵیـان پڕبـوو لـە کێکێکـی گـەورە: کێکێکی سپی و پڕ لە کرێم و نەخش و نیگار، کـە بەشـی لەشـکرێکی سـەربازی دەکـرد. لـەو دەسـت و دڵفراوانییـە بێئەندازەیـەی ئـەوان، ژنەکەم دەمی تەتەڵەی دەکرد، منیش هـەروەها، بـەڵام مـن کـەمێك هەسـتم بـە ڕەنجـاوی دەکـرد. بنەماڵـەی هوفـەر کـە زۆربڵێیـی و زۆر وتنیـان زیـاتر بریتیبـوو لـە داوای لێبـووردن و زمـان لووسـی، نـەیانتوانی دڵـی مـن بەدەست بهێنن و سـەرنجم ڕابکێشـن. خـوان مانوئێـل و وێلـی بچـکۆلانە، کـە هـەموو وازیپەکـەیان ڕاکـردن و شەڕو تەقەکردن و وێرانکاری بوو، ئیدی خەریك بـوون ئارامیـان لێهەڵـدەگرتم. سـەری سـەعاتی هەشـت بـەخۆم وت ئەگـەر هەڵسـن و بـڕۆن، کارەکەیان بەڕاستی شایەنی ڕێزە. بەڵام ژنەکەم لـە چێشـتخانەکەدا چرپاندی بەگوێمـدا: "ئـەوان بەرامبەرمان چاکەی زۆریان کردووە، ئەو کێکە! دەبێت بۆ شێو بیانهێڵینەوە."

" کە چی بخۆن؟ هیچمان بۆ خواردن نییە. بۆچـی دەبێـت شێو بخـۆین، وەختێك برسـیمان نییـە؟" "ئەگـەر لێرە خواردنمـان نییـە، لەسـەر کۆڵانەکـە خـۆ هەیـە. وەختێـك برسـیمان نییـە ڕاستە، کەسێك نەیوتووە خواردن بخۆین، بـەڵام مەسـەلەکە لەسـەر یـەك مێـز دانیشـتن و لەگـەڵ یەکدا خۆش گوزەراندنە."

لەگەڵ ئەم واقیعیەتەدا کە بەڕاستی بابەتەکە خـواردن نـەبوو، نزیکـەی تـا دەوروبـەری دەی شــەو، بەهــەمان شــێوە وەك ئێســتر باریــان خسـتبوو، منـیش دووبـارە پێچـراوەی گـەورەو بۆنخۆشـی خواردنـە ئامادەکـانم کـڕی و هێنـام. بنەماڵـەی هوفـەریش ناڕەزاییـان پیشـاندا کـە ئەوان لەو کەسانە نین بە دەستی بەتاڵـەوە بـڕۆن بۆ جێگایەك و سی بوتڵ شەرابی ئیتاڵی و پێنج بوتـڵ کنیاکیـان لـە پاکـەتێکی دروسـتکراو لـە برۆنـزو ئاسـندا لەگـەڵ خۆیـان هێنـا. سـەعات نزیکـەی دووی سـەرلەبەیانی بـوو، مـن مانـدوو بووم لەو هەموو پیادە ڕۆیشتنە لە بارێکدا کە تا قوڕقوڕاگــە خــواردنم تێکردبــوو، مەســت و ســەرخۆش، گێــژوو مــەنگی هاوڕێیــەتی، زوو خـەوم لێکـەوت. جـارێکی دیکـەش بـەخت یـارم بوو. سەعات شەش خانەوادەی هوفەر بە بـەرگی پڵاو خۆری و عەینـەکی ڕەشـەوە لـە زەنگیـان دا. ئێمەش لەگەڵیاندا بۆ خانووە ڤێللاییەکـەیان لـە شارەکەی دراوسێمان "ئانخینـە ڕو ماشویتس" ڕۆیشـتین. هەرکـەس دەڵێـت ئـەم شـارە لـە تەنیشـت بـۆینس ئایرسـەوەیە، درۆدەکـات. لـە ئۆتومبێلەکـەدا بەحەسـرەتەوە کەوتمـەوە یـادی خێـزان و ڕۆژنامـەو کاتـەکانی دەسـت بـەتاڵیم. ئەگـەر چـاوەکانم بـە کراوەیـی بهێشـتایەتەوە دەکزانــەوە. ئەگــەر داشــم بخســتنایە خــەوم لێدەکـەوت. بنەماڵـەی هوفـەر ژیرانـە بەدرێـژایی ڕێگــا پشــوویان دەدا و قســەیان دەکــردو پێدەکەنین. لە باخچەی ڤێللاکەیاندا کـە زۆریش جوان بـوو ، زۆر شـاهانە پێشـوازییان لێکـردین. لەبـەر هـەتاودا پاڵمـان دایـەوە، لـە حەوزەکـەدا مەلـەمان کـردو خـواردنی بـەتاممان خـوارد. مـن

تەنانەت لەژێر درەختێکی پڕ لە مێروولەدا، سەرخەوێکم شکاند. وەختێك هەستام، تازە تێگەیشتم ئەی دڵەی بێئاگا ئێمە بەدەستی بەتاڵەوە هاتووین. ژنەکەم بەگوێمدا چرپاندی:"بێهەست مەبە .لانیکەم شتێك بۆ منداڵەکەیان بکرە." وێلیم بە بیانووی گەڕان بەشاردا، لەگەڵ خۆمدا بردە دەرەوە. لەبەردەم کۆگای دوکانێکی فرۆشتنی کەلوپەلی کایەی منداڵاندا لێم پرسی:

"چیت دەوێ بۆت بکرم؟"

"ئەسپێك"

لام وابوو مەبەستی ئەسپێکی بچووکی منداڵانەیە. بەڵام هەڵەم کردبوو. لە ڕاستی کەنارێکی نائارامدا، لەبارێکدا کە مەچەکی وێلەمی بچکۆلانەم توند گرتبوو بۆ ڤێللاکە گەڕامەوە، بەبێئەوەی تەنانەت بتوانم کارێك بۆ دەردەسەرییەکەم بکەم. بەمشێوەیە یەك شەممە تێپەڕی. دوو شەممە وەختێك لەسەر کارەوە بۆ ماڵەوە هاتمەوە، بەڕێز هوفەرم بینی خەریکە خوان مانوئێل فێری ماتۆڕسواری دەکات. لێی پرسیم: "چۆنە؟ ئەو شتەی داومە بەکوڕەکەت بەدڵتە؟"

"بەڵام ئەو بۆ ماتۆڕسواری زۆر منداڵە"

"باشە دەیدەم بە تۆ"

وەك بڵێی شتی وای نەوتبێ. بەڵام خۆم لەگەڵ دیارییە تازەکەدا بە ناموٚ دەبینی. خوان مانوئێل لەناکاو بە دەنگێکی بەرز دای لە قاقای پێکەنین. بەڕێز هوفەر هاودەردانە وتی: "هاوڕێی بێچارە. منداڵەکان هەروان. بجوڵێ هاوڕێ گیان. شتێکی باشم بۆ هێناویت".

سواری ماتۆڕەکە بووم و لەگەڵ ئەوەی کە هەرگیز نەمدەزانی ماتۆڕ لێبخوڕم. دەنگی ماتۆڕیان پێدەرهێنام. خوان مانوئێل تفەنگێکی خەیاڵی بەرەو ڕووم ڕاگرتبوو:"دەی خێراکە ئەگینا تەقەت لێدەکەم."

بەڕێز هوفەر ڕایسپارد: "ڕووی مەکەرە چاوەکانی!"

من دەنگی ئیستۆپی ماتۆڕم دەرکردەوەو مانوئێل لە تەقەکردن لە من کشایەوە. ئێمە بەکەیفتر لەپێشوو بۆ ئاپارتمانەکەمان لە نهۆمی سەرەوە ڕۆیشتین. ژنەکەم چرپاندی بە گوێمدا: "ئا بەڵێ، دیاری وەرگرتن زۆر باشە، دەچەسپێت بەڵام تۆ دەبێت بزانیت چۆن قەرەبووی بکەیتەوە. بزانم چی دەکەیت ها؟" من قسەکەیم وەرگرت. سێ شەممە ئوتۆمبێلێك و کارابینێکی*بیانیم وەرگرت. بەڕێز هوفەر پرسی بۆچی ئەرکم کێشاوە. لەگەڵ یەکەمین تەقەکردندا، ویلی بچکۆلانە گڵۆپێکی سەر شەقامەکەی شکاند. چوار شەممە سێ دیاریی هاتن. بۆ من پاسێکی درێژی تایبەت بەگەشتە نێودەوڵەتییەکان، تەیارکراو بە ساردی و گەرمی، ساونا، ڕیستۆرانت و هۆڵی سەما. بۆ خوان مانوئێل بازوکای دروستکراو لە ئاسیا. بۆ ژنەکەم بەرگێکی شەوانەی سپی خانەدانانە. ژنەکەم نائومێدانە وتی: "ئەگەر شەو ئەم جل و بەرگە بپۆشم چیم لێدێت! پاس! هەڵەتکرد کە هیچت نەدا بەژنەکەی. لەبەر ئەوەیە کە ئێستا خەریکم سەدەقە وەردەگرم ئیدی." دەنگی تەقینەوەیەکی ترسناك تاڕادەیەك لاڵی کردم.

خوان مانوئێل بۆ ئەوەی بازوکایەکەی تاقی بکاتەوە، بەتەقاندنی تەنها گوللەیەك ماڵی

سەرگۆشــەی شــەقامەکەی ، کــە خۆشــبەختانە دەمێکە چۆڵە، ڕەوانەی ئاسمان کرد.

بــەڵام ژنەکــەم هــەروا ســەرقاڵی گلــەیی و ســکاڵابوو: "ئۆهــۆو، بــەڵێ ئیــدی ، بۆپیــاوی ماڵــەوە، پاســێکی گــەورە بەســە تــا بــەردەوام هەســتێت بــڕوات بــۆ بــەڕازیل. بــۆ گــەورەی ئەزیزتری ماڵ چەکێکی چاك بەسە تا لەچارەی مرۆڤ خۆرەکانی ماتۆگرۆسۆ بێت، بەڵام خانمی ماڵەوەچــی ؟ تــەنهاجل و بــەرگێکی میــوانی. بنەماڵــەی هوفــەر تــەواو ئــەوروپایین، کۆمــەڵێك بێئاوەزن."

ســوار پاســەکە بــووم و خســتمە کــار. لــە جێگایــەکی دووردا لــە تەنیشــت ڕووبارێکــەوە ڕاوەســتــام و ئوتومبێلەکــەم ڕاگــرت. لەســەر کورســییە گەورەکــەی پاســەکە دانیشــتبووم و خــەریکبووم لــەو ڕووناکییــە لاوازەی کــە لــە پەنجەرەکەوە دەڕژا بەسەرمدا چێژم وەردەگرت. خــۆم دایــە دەســت بێئاگاییــەکی ئارامبــەخش. وەختێك تێگەیشتم کە دەبێت چی بکەم یەکسەر ڕۆیشتم بۆ وەزارەتی وڵات پڕێز ببینم. منیش وەك هــــەموو ئەرجەنتینییــــەکان لانیکــــەم هاوڕێیــەکم لــە وەزارەتخانــە هەیــەو نــاوی ئــەم هاوڕێیــە پڕێــزە. لەگــەڵ ئــەوەدا کــە ڕیســکێکی تەواو بوو بەڵام لەم کاتەدا پێویستم بە پڕێز بوو تا بەدەسەڵاتی خۆی بێتەناوەوە و، سەرکوتنم بەدەست هێنا. من لە ناوچەی "لاس کایتاس "دەژیم کە ئێستا "سان بنیتود پالیرمۆ"ی پێدەڵێن. بۆ ڕاکێشانی هێڵێکی شەمەندەفەر لە وێستگەی "لیساندرۆ دلاتۆرە"وە تابەردەم دەرگای ماڵەوە سوپایەك لە ئەندازیاران، تەکنیکی و کرێکارە بێدەنگ و کارامەو ئیشکەرەکان دامەزران. کرێکارەکان بەسوود وەرگرتن لە تایبەتیترین و تازەترین ئامرازی نێودەوڵەتی و پاش کڕین و رووخاندنی چوار تەلاری ڕازاوە کە پێشتر بە درێژایی شەقامی "لیبەرتادۆر" لەنێوان شەقامەکانی "ئیرۆس" و"ماتی یەنسۆ"دا دروستکراون، ئەم کفن و دفنە ئازایانەیان بە سەرکەوتنێکی بەرچاوەوە تەواوکرد. قسەی ناوێ کە خاوەن تەلارەکان پارەیەکی زۆرو باشیان وەرگرت. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەبێ ئامادەبوونی پڕێزێك لە وەزارەتخانەیەکدا ئاوها کارێك ئەستەمە. ئەمجارە ئیدی دەمویست بەڕێز هوفەر سەرسام بکەم . وەختێك سەعات هەشتی بەیانی پێنج شەممە لە ماڵ هاتمە دەرەوە شەمەندەفەرێکی گازیی زەردو سووری جوان کە جێگای شەش سەرنشینی لێبەسترابوو، بینی. لەسەر دەرگای شەمەندەفەرەکە تابلۆیەکی بچووك دەخوێندرایەوە:

"بۆ شەمەندەفەرەکەی خۆتان خۆشهاتن بەڕیز هوفەر!"

هوفەر هاواریکرد: "شەمەندەفەرێك، ڕاستە. ئەویش تەنها بۆ من! خەونی ژیانم هاتەدی. لە منداڵییەوە حەزم دەکرد شەمەندەفەرێك لێخوڕم."

بێ هیچ سوپاسێك، بە خۆشحاڵییەوە چووە نێو شەمەندەفەرەکەوە، ئەو شوێنەی کە ڕێنوێنی لێخوڕینی شەمەندەفەر چاوەڕوان بوو تا چۆنێتی ئاژووتنی شەمەندەفەرەکەی بۆ باس بکات. وتم: "هێی! بۆستە. مەپەشۆکێ. سەیرکە بۆ ویلی بچکۆلانە چیم کڕیوە." تانکێکی بەهێز خەریکبوو خشتەی پیادە ڕۆکەی بە زنجیرەکانی

ووردوخاش دەکرد. ویلی بچکۆلانە هاواریکرد: "چەند جوانە، چەندێك حەزم دەکرد ئەو پەیکەرەی نێوەڕاستی شەقامەکە بکەم بە تۆز."

درێژەم پێدا: "ژنەکەشتم لەیاد نەچووە"و بۆ ئەویش یەکێك لە نەرمترین و باشترین ئەو چاکەتانەی بەم دواییە لە فەرەنسا کڕیبووم، پێشکەش کرد. چونکە بنەماڵەی هوفەر زۆر خۆشحاڵ بوون. ویستیان دیارییەکانیان تاقی بکەنەوە، بەڵام من لە هەر دیارییەکدا تەڵەیەکی بچووکم دانابوو. شلەیەکی جادوویم بەهەموو شوێنێکی چاکەتەکەدا کرد، کە پزیشکێکی گیاناسی کۆنگۆیی پێیدابووم. هەرئەوەندەی کە خانم برونهێڵد، چاکەتەکەی پۆشی، سەرەتا قیژەیەکی کردو پاشان بوویە هەورێکی سپی پێست پیازی و لەئاسماندا دیار نەما. هەر ئەوەندەی وێلی بچکۆلانە یەکەمین گوللەی روەو پەیکەرەکە ئاڕاستە کرد، ئەو ئامێرە تایبەتەی لەنێو تانکەکەدا دامنابوو چالاك بوو و لووتکەکەی لە هەوادا تەقییەوەو هاوڕێ بچکۆلانەکەمان بوویە یەکێك لە دە ئەستێرەکەی هەسارەی مشتەری. وەختێك بەڕێز هوفەر شەمەندەفەرەکەی بەڕێخست بە ئارامی و بەشێوەیەکی جلەو نەکراو پەڕی بۆ سەر پردێکی بچووك کە هێڵی ڕێڕەوەکەی پاش تێپەڕین لە ئۆقیانوسی ئارام و باکووری ئەفریقاو کەناڵی سیسیل لەناکاو دەکەوتە گەرووی ئاورپرژێنی ئیتناوە کە ئەزقەزا لەو کاتەدا خەریکبوو هەڵدەچوو. باشە، هەینی گەیشت و دیارییەك لەلایەن بنەماڵەی هوفەرەوە نەهات. ئێوارە، ژنەکەم هەروا کە خەریکبوو شێوی ئامادە دەکرد وتی: "بەڵێ وایە ئیدی. بارودۆخ دەبینی؟ لەگەڵ هاوسێکەتا میهرەبانی، خەرجی بۆدەکەی: شەمەندەفەرێك، تانکێك، چاکەتێك، بەڵام ئەو چی؟ درێغ لە کارتێکی سوپاسگوزاری."

## پەراوێز:

* جۆرێك تفەنگی درێژ یا کورتی سووکە.

## سەرچاوە:

گۆڤاری "کارنامە" ژمارە25و 26 بهمن و اسفند 1380.

# ناوتم لە یادەوەریمدا سڕیەوە

**ئومبرتو ئاكابالْ**

**لە فارسییەوە: رەووف بێگەرد**

(ئومبرتو ئاكابالْ) شاعیرێكی سوورپێستی گواتیمالیە، ساڵی (1952) لە شاری (ماتزاتناگو) لە دایك بوە، ناودارترین شاعیری وڵاتەكەی و ئەمەریكای لاتینە. بەرهەمی بەزمانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵی و ئەڵمانی و پورتوگالی بڵاوبۆتەوە، گەلێك خەڵاتی پێدراوە لەوانە: خەڵاتی شیعری ئەمەریكا (1999) كە (رێكخراوی یۆنسكۆ) دەیبەخشێت، خەڵاتی نیونەتەوەیی شیعری (بلیز سندراری سویسری 1997)، خەڵاتی (پازۆلینی ئیتاڵیا 2004)، گرنگترین خەڵاتی ئەدەبیی گواتیمالا كە بەناوی (میگل ئانخل ئاستۆریاس)ی ڕۆمان نووسەوەیە كە نۆبلی ساڵی (1967)ی وەرگرتووە، بەلام (ئاكابالْ) خەڵاتەكەی ڕەت كردەوە و وتی:"هەرگیز شانازی بە خەڵاتێكەوەناكەم كە بەناوی یەكێكەوەیە سووكایەتی بەگەلەكەم كردووە" مەبەستی ئاكابالْ كتێبی (كێشەی كۆمەلایەتی سوورپێستەكان)ی ئاستۆریاسە كە شارستانیەتی گەلی (مایا)ی بە شارستانیەتێكی سووك لە قەڵەمداوە. ئاكابالْ شیعر بە زمانی (مایا)ی دەنووسێت كە زمانی دایكیەتی و پاشان خۆی دەیكات بە ئیسپانی. شیعری ئاكابالْ گێڕانەوەی چیرۆكی نەتەوەكەیەتی بە هەموو ئازار و بەسەرهاتەكانیەوە كە پێش چوارسەدە ئیسپانیا وڵاتەكەی داگیركردن، شارەكانیانی وێران كردو خەڵكەكەی ئاوارەبوون. ئاكابالْ لە خێزانێكی هەژاری گوندنشین بوەو لە تەمەنی شەش ساڵیەوە لەگەڵ باوكیدا كاری كردووەو وەك خۆی دەڵێت: "نەم زانیوە منداڵی یانی چی". چەند ساڵێكی كەم لە قوتابخانە خوێندویەتی و پاشان چوەتە پایتەخت و لەوێ شیرینی و بنێشتی فرۆشتوە. دوای پێنج ساڵ گەڕاوەتەوە

گونـدو لەگـەڵ باوکیـدا کەوتۆتـەوە کـارکردن. یەکـەم کتێـب کـە خوێندوویەتیـەوە ڕۆمـانی (وێنـەی دوریـان گـرا)ی –ئۆسـکار وایلـد–بـوەو دواتـر ئاشـنایەتی لەگـەڵ (دۆستۆیفسـکی و ئسـتڤان تسـوایکدا) پەیـداکردووە، ئـەم نووسـەرانە کاریگـەری زۆریـان لەسـەر بـەهرە و توانـای دانـاوە و عاشـق بـەدنیای ئـەدەب و بەتایبەتی شیعریان کردووە.

## چەند نموونەیەك لە شیعرە کورتەکانی ئەم شاعیرە

### فرمێسك

کە لەدایك بووم
فرمێسکیان تکاندە چاوانمەوە
بۆ ئەوەی ببینم
بە ئەندازەی ئازارەکانی گەلەکەم بێت.

### دوور

لەم سەر زەویە چکۆڵەیەدا
هەمووشتێك زۆر دوورە
خواردن
ئەلفبا
بەرگ

### نزا

لەکڵێسەدا
گوێت لە هیچ نیە
بێجگە لە دەنگی نزای درەختێك
کە ئێستا بوەبە کورسی

### ئاگر

ئاگر بڵێسەی سەندوە
خەمی دار دادەمرکێنێت
موزیك حەماسەتەکەی
بۆ دەکات بە ئاواز
پشکۆ عاشقانە گوێ دەگرێت
بۆ ئەوەی لەبیری بچێتەوە کە درەخت بوە

### باران

دوێنێ
پەڵە هەورێکم بینی دەگریا
گوتی ئاوی بۆ شارهێناوە
بەڵام ڕێی ون کردووە
بـەدوای چیاو دەربەندێکـەوە بـوە تـا ئاویـان بداتێ
بەڵام شار هەمووشتێکی هەڵ لووشی بوو

بەپێی پەتی
تەنیا و غەمبار
گەڕایەوە

بارانەکەی بەسەردەشتا ڕشت
تووتی و ریشۆڵەکان لە ئامێزیان گرت
بۆقەکانیش کەوتنە گۆرانی وتن

### گەڵا مردوەکان

گەڵا مردوەکان
نامە عاشقانەکانن

که درەختەکان

داویانەتە دەست بای فەرامۆشی
بەڵام ئاه...
هەمدیس گەڵای نوێ دەڕوێن
هەر جارە و سەوزتر
ئاه ئەی عەشقی دارستان
کە هەرگیز لە یادناکرێیت

**یادەوری**

هەندێك جار بەرەودواوە دەگەڕێمەوە
ئەمە ڕێگای منە بۆ یادکردنەوە
ئەگەر تەنیا بۆ پێشەوە بڕۆشتمایە
هیچم نەدەبوو پێتی بڵێم
بێجگە لە فەرامۆشی

**تەختە**

سادەییم خۆش دەوێت
وەك درەخت
نا
وەکوو تەختەیەکی ڕەش

**ڕەگەکان**

نازانم دڵم چ گوڵێکە
ڕەگەکانی بەدرێژیی شەوە تا بەیان
لە هەرماڵئاواییەکیشدا
دەبێت لە ڕەگەوە هەڵیکێشم
چەندە ئازاراویشە!

**کاتێك بەئاگاهاتم**

ڕۆژێك
خوا منی بە تەنیا بینی
تاق و تەنیا
پاشان خەواندمی
لە ژێر گەڵای گەنمەشامیدا نووستم
پەراسوویەکی دەرهێنام
کاتێك بە ئاگاهاتم
بەرانبەرم بوو
-جوان، ڕووت
لە گڵ و گەنمەشامی
بۆنی دارستانی گرتبوو-
بەرانبەرم بوو
شیعرەکەم.

**یادەوەری**

ئەو خەمەی ئێستا هەستی پێ دەکەم
وەك ئەو خەمە وایە کە بەمنداڵی هەستم پێ
کرد
باوکم تەواو مەست بوو
لەپاڵ شەقامەکەدا نوستین
ئەوم لەگەڵدا بوو
منیش تاق و تەنیا

**تاڤگە**

ئەوە ئاوازی تاڤگەیە
بەدەنگی دارستانەوە
لە لووتکەوە
تاداوێن
هێدی هێدی بۆ پێشەوە دەڕوات
تادەگاتە زەویە وشکەکان
ئیدی لەوێدا پڕمەی گریان دەست پێ
دەکات.

### مانگ

مانگ تەنیایە
خەمبارە
هەر چەندە لەنێو ئەستێرەدایەو
بە ئاسماندا دێت و دەچێت
بەڵام هەر عاشقی سەرزەمینە
بۆیە لە حەوزی ئاوەکاندا دەنوێت

### دیدار

لە ڕێگادا یەکمان بینی
ئەگـــەر باووباپیرانمـــان بـــەم ڕێگایـــەدا
نەڕۆشتبان
ڕەنگە ئێمەش یەکترمان نەبینیایە
نازانم کامیان چاکتربوو
با جیّ پێکانتی سڕیەوە
بەڵام لەو ڕۆژەوە
لە مندا دەنگ دەداتەوە.

### ناوتم لە یادەوەریمدا سڕیەوە

ناوتم لە یادەورەریمدا سڕیەوە
بەرەڵام کردە نێودارستان
با لەگەڵ خۆیدا ڕای پێچایە ژێر دەربەندێك
منیش بێدەنگبووم
بەڵام کتوپڕ بەر بەردێك کەوتوو
گەڕایەوە لام
باران دای کردو
ناوەکەت بە فرمێسك ڕشتنەوە
گەڕایەوە لام

### سێبەر

سێبەر:
شەوێکی چکۆڵەیە لە ژێر درەختێکدا

### یادگار

مرۆڤ پیّ لەسەر هەرشوێنێك دابنێت
شوێن پێکەی دەمێنێتەوە
زەویش ئەو یادگارە دەپارێزێت
لەش دادەڕزێت و
یادگار دەمێنێتەوە
مرۆڤ نامرێت
ماڵئاوایی لە ژیان دەکات
ژیان یادەوەری مەرگە
مەرگ یادەوەری ژیانە

### کات

لێگەڕیّ کات بەمندا تیّ بپەڕێت
من بەوداتێناپەڕم

### ئاوازی ڕەنگاورەنگ

گەڵاکان دەنگ دەرەنگێنن
بۆیە ئاوازی چۆلەکەکان
سەوزن.

### لەئەمرۆوە

لە ئەمرۆ وە مەوداکان دەست پیّ دەکات
سبەینیّ نۆرەی فرمێسکەو
ئاخ و ناویش

دواتر
ئاخ و ناوو
پاشان
تەنیا ناوەکە دەمێنێتەوە

**بەرد**

بەرد لاڵ نیە
تەنیا بێدەنگە

**لەبەر ئەمەیە**

تەنیا لەبەر ئەستێرەکان نیە
تەنیا لەبەر مانگیش نیە
کە  من شەوم خۆش دەوێت
کوندە بەبوەکان دەخوێنن
شەمشەکوێرەکان دەفڕن
گوڵ ئەستێرەکان دەدرەوشێنەوە
لە تاریکیدا زەمان دەوەستێت
هەست دەکەم سەروبن بووم
لەبەر ئەمەیە ...

**درەخت**

ئەی شاعیر
ئەی کتێبی سەوز
چەندان شیعر لەنێوان گەڵاکانتایە!
هەرکەسێك بەسەرچڵەکانتەوە بنیشێتەوە
دەبێت بە شاعیر

**ناوت**

ناوت چاوەڕێم بوو
لەو سووچەدا
بەسەر
بەردێکەوە
دانیشتبوو

**سەرچاوە:**

گۆڤاری نگاە نو، ژمارە 73 ئوردی بهشت 1386.

# با ئەمریکا
# جارێکی تر ببێتەوە بە ئەمریکا

لانگستۆن هیوز
لە ئینگلیزییەوە: عەزیز ڕەئووف

با ئەمریکا جارێکی تر ببێتەوە بە ئەمریکا
با خەونەکانی بێتە دی
با ئەمریکا پێشەنگی کاروان بێت
بەدوای نیشتیمانێکدا بگەڕێ کە خۆت تێیدا سەربەست بیت
(ئەمەریکا هەرگیز ئەمریکا نەبووە بۆ من)

با ئەمریکا ببێت بە خەونێك بۆ ئەوانەی خەو دەبینن...
با ببێتە خاکێکی گەورە و بەهێز بۆ عەشق
شوێنێك نەبێت بۆ پیلانی پاشاکان و نەخشەی ستەمکاران و
هەپرون کردنی کەسانی بێ دەسەڵات
(ئەمەریکا هەرگیز ئەمریکا نەبووە بۆ من)

ئۆه، با خاکەکەی من ببێتە خاکێك بۆ ئازادی
تاجە گوڵینە لەسەر بنێ نەك گوڵی درۆی نیشتیمانپەروەری
بەڵام هەل ڕاستیە، ژیان ئازادە،

**یەکسانی لەو هەوایەدایە کە هەناسەی پێدەدەین.**
**( بەڵام ئەوە هەرگیز یەکسانی نیە بۆ من،**
**ئازادی نیە لە "نیشتیمانێکدا بۆ ئازادی".)**
**بڵێ، ئێوە کێن کە فسکەفسك دەکەن لە تاریکیدا؟**
**کێن ئێوە کە پەچە دەدەن بە ڕووی ئەستێرەکاندا؟**

**من سپی پێستێکی هەژارم، شێت و وێت وەلا خراوم،**
**من قولەڕەشێکی کۆیلەی کەنەلانێکی بەردینم.**
**من سورپێستێکم لە خاکەوە دروست بووم،**
**من پەنابەرم و بەدوای ئارەزوەکانما وێڵم...........**
**بۆ دۆزینەوەی هەمان نەخشەی گەمژانە**
**کە سەگ سەگ دەخوات**
**بەهێزەوە لاوازیەکان تێکدەشکێنم**

**من کوڕێکی گەنجم، پڕ لە وزەو ئارەزوو**
**لەو زنجیرە دێرین و بێکۆتایەوە ئالاوم**
**لە سەرمایە و دەسکەوت و هێز و زەوتکردنی خاك!**
**زەوتکردنی خودا! زەوتکردنی ئەو ڕێیانەی دەچنەوە سەر پێویستی!**
**زەوتکردنی کاری مرۆڤ! لە وەرگرتنی بەشی خۆی!**
**بوونە خاوەن هەموو شت وەك کەسێکی چڵێس!**

**من جوتیارم، دەستەبەری خاك**
**من کرێکارم، فرۆشیاری ماشێن**
**من قولەڕەشم، کارەکەری هەمووتان**
**من خەڵکم، بێفیز، برسی، پەرپوت......**
**ئەمرۆ برسی.. بێگوێدانە خەون**
**تێهەڵدراو....ئۆە، سەرۆکەکان!**
**من ئەو مرۆڤەم، کە هەرگیز پێشناکەوم،**
**هەژارترین کرێکارم و سالانە وەك شتومەك**
**ئالوگۆڕم پێدەکەن.**

ئیستا ئەو کەسەم کە خەون بە خەونە بنەڕەتیەکانمەوە دەبینم
لە جیهانێکی دێریندا کە تا ئیستاش کۆیلەی پادشاکانم،
خەونەکانم خەونگەلێکن زۆر بەهێز، زۆر ئازا، زۆر ڕاست،
کە تا ئیستاش گۆرانی بۆ خەونەکانم دەڵێم
لە هەر خشت و بەردێکدا، لە هەڵدانەوەی هەر دێراوێکدا
ئەمریکا دروست بوو.
ئۆە، من ئەو کەسە بووم کە سەوڵی دەریاکانم لێدەدا
بۆ گەڕان بەدوای ئەوەی پێی دەڵێن نیشتیمانەکەم.....
من ئەو کەسەم کە کەناری تاریکی ئێرلەندە و
دەشتایی پۆڵەندە و مێرگی سەوزی ئینگلاندم جێهێشت،
لە ڕەشی ئەفریقا جیابوومەوە و هاتم
بۆ بنیادنانی " نیشتیمانێك لە ئازادی"
ئازادی؟
کێ دەڵێ ئازادی؟ من نا؟
بە دڵنیاییەوە من نا؟ ملیۆنان هەژارن ئەمڕۆ؟
ملیۆنان تەقەمان لێدەکرێ لە کاتی مانگرتندا؟
ملیۆنان خاوەنی هیچ نین؟
بۆ هەموو ئەو خەونانە ئێمە خەونمان دەبینی
بۆ ئەو هەموو گۆرانیانە ئێمە گۆرانیمان دەچڕی
بۆ هەموو ئەو خواستانە ئێمە هەوڵمان دەدا
بۆ هەموو ئەو بەیداخانە ئێمە بەرزمان دەکردنەوە،
ملیۆنان کە خاوەنی هیچ نین.........
جگە لە خەون کە ئەوەندەی نەماوە ئەمڕۆ بمرین.

ئۆە، با ئەمریکا جارێکی تر ببێتەوە بە ئەمریکا....
خاکێك کە هەرگیز ئەوەی ئیستا نا....
ئیستا پێویستە خاکێك بێت هەموان تیایدا ئازادبن
ئەمە خاکی منە.... خاکی هەژارانە، خاکی هیندی و کۆیلەکانە، من.....
کێ ئەمریکای دروست کرد،
بە خوێن و عارەقی کێ، بە باوەڕو ئازاری کێ،
کام دەستانەبوون کانگایان دروستکرد ، کێ لەبەر باران زەوی دەکێڵا،

پێویسته جارێکی تر خەونە مەزنەکانمان ببینینەوە.

بەدڵنیایەوە، بانگم کەن بە هەر ناوێکی ناشرین خۆتان ئەتانەوێ...
هێزی ئازادی بە ئێوە لەکەدار ناکرێت.
بۆ ئەوانەی کە وەك مشەخۆر لەسەر ژیانی خەڵکی تر دەژین،
ئێمە پێویستە جارێکی تر بگەڕێینەوە خاکەکەمان،
ئەمریکا!

ئۆه، بەڵێ،
من بەڕوونی ئەوە دەڵێم،
ئەمریکا هەرگیز ئەمریکا نەبووە بۆ من،
وە من ئێستا ئەو سوێندە دەخۆم
دەبێ ئەمریکا ئەمریکابێت!

لە دەرەوەی ڕووخان و فەوتانی پیاوخراپەکانمان،
لاقەکردن و پوکانەوەی پەیوەندی، نهێنی و درۆکان،
ئێمە و خەڵك پێویستە جوانیەکانی
خاك و کانگا و سەوزایی و ڕوبارەکان بگێڕینەوە
چیاکان و دەشتە بێکۆتاییەکان...
بۆ ئەوەی ئەم وڵاتە بە سەوزی بمێنێتەوە....
دەبێت ئەمریکا جارێکی تر ببێتەوە بە ئەمریکا!

**سەرچاوە:**

*Modern American Poetry 1982*

# جەنتاکەی باوکم

**وتارەکەی (ئورهان پاموك) لە کاتی وەرگرتنی خەلاتی نوبلی ئەدەبیات**
**لە (7)ی دەیسەمبەری ساڵی (2006ز)**

**لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح**

باوکم دوو ساڵ بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات، جانتایەکی بچووکی دامێ کە پڕ بوو لە دەستنووس و دەفتەرە یاداشتەکانی. وەك هەمیشە هەر بەو چەشنە گاڵتە ئامێزانەی پێی وتم کە حەز ئەکات کاتێ رۆیشت بیانخوێنمەوە، "مەبەستی دوای مردنی بوو".

بە کەمێك شڵەژانەوە پێیوتم: "چاوێکی پێدابخشێنە، سەیر بکە بزانە شتێکی تێدایە کە بە سوودت بێت. دەشێ پاش رۆیشتنم بتوانی هەندێ شتی تێدا بدۆزیتەوە کە بە کەڵکی چاپکردن بێت".

لە ژووری کارکردنەکەی خۆمدا بووین، دەوروبەری پڕ بوو لە کتێب، باوکم بە دوای شوێنێکدا دەگەڕا کە جانتاکەی تێدا دابنێ. هەر شوێنی ئەگۆڕی، ئەچووە دواوە و دەهاتە پێشەوە وەك کەسێك کە دەیەوێت لە شەڕی بارێکی قورس رزگاری بێت. ئاخرەکەی خستیە سووچێکەوە کە بە چاو نەئەبینرا. ساتی تەریق بوونەوەبوو و تەواو. ئەو ساتەی هیچ کاممان بیرمان نەئەچووەوە، بەلام هەر کە ئەو ساتە تێپەڕی، گەڕاینەوە ناو قاڵبە هەمیشەییەکەی خۆمان کە ئەوەش کەمتەرخەم بوون بوو بەرامبەر ژیان، رواڵەتی گاڵتە ئامێزانەکەمان دەستی بەسەر بوونماندا گرت و ئۆقرەمان گرت. دەستمان بە قسەکردن کرد، وەکو هەمیشە، سەبارەت بەو شتە بچووکانەی ژیانی رۆژانە، مەسەلە سیاسییە بێ کۆتاییەکانی تورکیا، و چالاکیە بازرگانیەکانی باوکم کە زۆربەیان سەرکەوتوو نەبوون و ئەویش گوێی نەئەدا.

لە بیرمە کاتێ باوکم رۆیشت، چەند رۆژێك لە دەوروبەری جانتاکە سووڕامەوە بێ ئەوەی

پەنجەی بۆ بەرم. هەر پێشتریش ئەو جانتا رەشە بچوکە چەرمەم دەناسی بە قفڵ و سووچە خڕەکانیەوە. باوکم لەسەفەرە کورتەکانیدا سوودی لەم جانتایە وەردەگرت و هەندێ جاریش بەڵگەو نامەکانی پێ دەبرد بۆ ئۆفیسەکەی.

بیرمە کاتێ منداڵ بووم وەختێ باوکم لە سەفەر دەگەڕایەوە ئەم جانتا بچووکەم دەکردەوە و شتەکانی باوکم دەرژانە دەرەوە و بۆنی عەتری شوێنە نامۆکانم دەکرد. ئەم جانتایە دۆست و ئاشنای من بوو، یادگاری منداڵیم، رابردووم، بەڵام چیتر نەمدەتوانی تەنانەت دەستی لێبدەم، بۆچی؟ دەشێ بەهۆی قورساییە پڕ نهێنیەکەی نووسینەکانی ناوییەوە بێ.

ئێستا ئەمەوێت سەبارەت بە واتای ئەو قورساییە بۆتان بدوێم. کاتێ مرۆڤ خۆی لە ژوورێکدا زیندانی ئەکات و لە پشتی مێزێکدا دائەنیشێ و دەچێتەوە ناو خۆی تا بیروڕای خۆی دەربڕێت، لە ڕاستیدا هەر ئەم کێش و قورساییە دەخوڵقێنێ، ئەمە مانای ئەدەبیاتە.

کاتێ دەستم بۆ جانتاکەی باوکم برد هێشتا نەمدەتوانی خۆم قایل بکەم بەوەی بیکەمەوە، بەڵام دەمزانی کە لەو دەفتەرە یاداشتانەدا شتی زۆر نووسراون، پێشتر بینبووم کە باوکم شتی تێدا دەنووسین. یەکەمجار نەبوو کە دەمزانی بارێکی قورس لەو جانتایەدایە. باوکم کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو. لە سەردەمی لاوێتیدا، لە کۆتاییەکانی دەیەی 1940 ز ویستوویەتی ببێتە شاعیرێکی ئەستەمبولی، شیعرەکانی (پۆڵ ڤالیدی) وەرگێڕابووە سەر زمانی تورکی، بەڵام نەیویستووە ئەو چەشنە ژیانە بگرێتە بەر کە پێویستی بە شیعر وتن بێ لە وڵاتێکی هەژار کە ژمارەیەکی کەم گۆرانیبێژی تێدایە. باوکی باوکم – باپیرم – بازرگانێکی دەوڵەمەند بووە. باوکم لە تەمەنی منداڵی و گەنجیدا ژیانێکی ئاسوودەی هەبوو و هیچ پێی خۆش نەبوو بە بۆنەی ئەدەبیات و نووسینەوە تووشی سەختی ژیان بێت. ژیانی بە هەموو جوانیەکانیەوە خۆش دەویست – باش درکم بەوە ئەکرد.

هەڵبەتە یەکەمین شتێك کە وایلێکردم نەچم بەلای نووسینەکانی ناو جانتاکەی باوکمدا ترس بوو، ترس لەوەی نەکو بیانخوێنمەوە و حەزیان لێنەکەم. باوکم کە ئەوەی دەزانی بۆ دڵنیایی وا پیشانی دەدا کە زۆر گرنگی بە ناوەرۆکی شتەکانی ناو جانتاکە نادات. من ماوەی (25) ساڵ بوو کە نووسەر بووم و هیچ لەوە بێتاقەت نەبووم کە تووشی شتی وا بم. بەڵام من تەنانەت نەمدەویست بەرامبەر ئەوەی بۆچی باوکم نەیتوانیوە بە ڕادەی پێویست بەرامبەر ئەدەبیات جدی بێت، هەڵچم.

.. ترسە ڕاستەقینەکەم، ئەو مەسەلە زۆر گرنگەی کە نەمدەویست بیزانم یان لێی تێبگەم، ئەوەبوو کە دەشێ باوکم نووسەرێکی باش بوو بێ. هەر لەبەرئەو ترسە بوو کە نەمدەویست جانتاکەی باوکم بکەمەوە. خراپتر لەوە خۆیشم بە ئاشکرا دانم بەو ترسە دانەئەنا. ئەگەر لەو جەنتایەی باوکمدا ئەدەبیاتێکی ڕاستەقینە و ڕێك و پێك دەرچوایە، ناچار دەبووم ئەمە قبوڵبکەم کە مرۆڤێکی جیاواز لە ناخی باوکمدا ژیاوە. ئەگەری ئەو حاڵەتە دەیترساندم. ئاخر

مـن تەنانـەت لـە تەمـەنی گـەورە ساڵیشـدا دەمویسـت بـاوکم، بـاوکم بێـت نـەك نووسـەر. نووسـەر کەسـێکە کـە سـاڵەکانی تەمـەنی بـە خـۆڕاگریی و سـەبرەوە تێدەپـەڕێنیٚ و هـەوڵ ئەدات بوونی دوەمـی نـاخی خـۆی بدۆزێتـەوە، هەروەها ئەو دنیایەی کە هەر بەو چەشنەی کە هەیە دروستی ئەکات.

کـاتیٚ سـەبارەت بـە "نووسـەری دەدوێـم"، یەکەمین شتیٚ کە بە خەیاڵمدا دێت، رۆمان یان شیعر نیە، بەڵکو مرۆڤێکە کە خۆی لە ژوورێکدا زیندانی دەکات، لە پشتی مێزێکدا دائەنیشیٚ و بەتاقی تـەنیا، نـاخی خـۆی دەدۆزێتـەوە، و لـە نێـوان ئەشـباح و سـێبەرەکانی دەرونیـدا بەواژەکان دنیایـەکی نویٚ دروست ئـەکات. ئەم پیـاوە – یـان ژنـە – دەشـیٚ سـوود لـە ئـامێری تایپکردن وەرگرێت، یان ئاسانتر بە کۆمپیوتـەر کار بکات، یان بە قەڵەم لەسەر کاغەز بینووسێت وەکو من کە ماوەی سی ساڵە وامکردووە.

لەوانەیـە لـە کـاتی نووسـیندا چا یـان قـاوە بخواتـەوە، یـان جگـەرە بکێشـیٚ، دەشـیٚ هەنـدیٚ جار لـە شـوێنی خـۆی هەسـتیٚ و لـە پەنجـەرەوە سەیری منداڵەکانی بکات کاتیٚ لە ناو کۆڵاندا یاری دەکەن و ئەگەر بەخت یاوەری بێت چاوی بە هەنـدیٚ دار و درەخـت ئەکـەویٚ یـان لەوانەیـە زەق زەق سـەیری دیـوار بکـات. لەوانەیـە شـیعر بنووسێت، سیناریۆ یان رۆمـان بنووسێت وەکو مـن. هـەموو ئـەم جیاوازییانـە پەیوەنـدییان بـە دوای ئەو کارە سەرەکیەوە هەیـە. واتـە دانیشتن لە پشتی مێز و بەسەبر و خۆڕاگرییەوە چوونە نـاو نـاخی "خـود"ەوەیـە. نووسین واتـە کردنـی ئـەم دیـدە دەرونیـە بـەواژەکان. گـەڕان بـە دوای ئەو جیهانەی کاتیٚ مرۆڤ ئەچێتەوە ناو خۆی، دەچێتە ناوی و کارکردنە بە سەبرو تێکۆشان و چێژ وەرگـرتن. مـن کـاتیٚ لـە پشـتی مێزەکـەم دائەنیشـم، لـە مـاوەی رۆژەکـان و مانگـەکان و ساڵەکاندا هێدی هێدی وشـەیەکی نـویٚ لەسـەر پەڕەی کاغەز دەنووسم، واهەست ئەکەم خەریکم دنیایەکی نویٚ ئەخوولقێنم، خـەریکم بوونەکـەی تری ناو خودی خۆم ئەهێنمە ئەم دنیایە، رێك وەك کەسێك کە بەرد دەخاتـە سـەر بەردێکی تـر تـاکو پردێـك یـان گۆمەزەیـەك دروسـت بکـات. واژەکـان بـەردەکانی ئێمـەی نووسـەرن. کـاتیٚ دەیانگرینـە نـاو دەسـتمانەوە بـاش دەزانـین کـە چـۆن چـۆنی دانەدانـەیان پێکـەوە بنووسـێنین، هەنـدیٚ جـار لەسـەری ڕادەوەسـتین و چـاوی لێدەکـەین. هەنـدیٚ جاریش بە پەنجە و نـووکی قەڵەمەکـەمان بـە جۆرێـك نەوازشـیان دەکـەین، هەڵیاندەبـژێرین، جێگۆڕکێیـان پـیٚ ئەکـەین و ساڵەکان تێدەپـەڕن، بـە سـەبر و خـۆڕاگری و بـە ئومێـد و ئـارەزووەوە، بـەڵیٚ بـەم چەشـنە دنیـا نوێکانمان دەخووڵقێنین.

(ئیلهام) نهێنی کاری نووسەر نییە – چونکە هیچ کـاتیٚ دیـار نیـە کـە ئیلـهام لـە کوێـوە دێـت. نهـێنی کـاری نووسـەر خـۆڕاگری و سـەبر و تاقەتیەتی. قسەیەکی نەستەقی تورکی هەیـە کـە ئـەڵێت: ئـەکریٚ بـە دەرزی بیرێـك هەڵکـەنیت، بـەڕای مـن ئـەم قسـەیە دۆخـی نووسـەرەکان وەسـف ئـەکات. لـە چـیرۆکە کۆنەکانـدا، مـن عاشقی فەرهادم کە لەبەرخاتری عەشقی خـۆی بەسـەبرەوە شـاخەکە هەڵدەکـەنێت – نـەك هـەر خۆشم ئەوێت بەڵکو لێی تێدەگەم.

لە رۆمانی (نـاوم سوورە) باسی هونەرمەندە

مینیاتۆریستە کۆنەکانی ئێرانم کردووە کە لە ماوەی ساڵەهای ساڵ بە شەوق و تاقەتێکی بەردەوامەوە وێنەی ئەسپێکیان دەکێشاو هەموو جووڵەی قەڵەمەکەیان لەبەر دەکرد تاکو بتوانن تەنانەت بە چاوی داخراویشەوە دیسانەوە ئەو ئەسپە جوانە بخوڵقێنەوەو کاتێ ئەو رۆمانەم دەنووسی، باش دەمزانی کە خەریکم پیشەی نووسەری وەسف ئەکەم و باسی ژیانی خۆم ئەکەم.

ئەگەر نووسەرێك بیەوێت چیرۆکی خۆی بگێڕێتەوە — بە هێمنی و بە شێوەیەك وەکو بڵێیت خەریکە سەبارەت بە کەسانی تر چیرۆکێك دەگێڕێتەوە — ئەگەر بیەوێت تینی چیرۆکەکە لە ناخیدا هەڵکوڵێت و هەڵچێت، ئەگەر بیەوێت لە پشتی مێزەکەی دانیشێت و بەسەبرەوە خۆی بداتەوە دەستی هونەرەکەیەوە، بەم شێوەیە پێویستە سەرەتا کەمێك ئومێدی هەبێت. فریشتەی ئیلهام (کە زۆر جار ئەچێتە لای هەندێ کەس و زۆر کەمیش ئەچێتە لای هەندێ کەسی ترەوە) عاشقی مرۆڤە ئومێدەوار و باوەڕدارەکانە، و کاتێ نووسەرێك زۆر هەست بە تەنیایی بکات، کاتێ گومانی بەرامبەر هەوڵ و تێکۆشانەکانی خۆی و خەونەکانی و بەهای نووسینەکانی هەبێت — کاتێ وا بیر بکاتەوە کە چیرۆکەکەی تەنیا چیرۆکی خۆیەتی — بەڵێ، لەو ساتانەدا فریشتەی ئیلهام بڕیاری ئەوە ئەدات ئەو چیرۆك، دیمەن و خەونانەی نیشان بدات کە نووسەر ئەیەوێت دنیایەکی خۆی پێ بخوڵقێنێ. من خۆم کاتێ بیر لەو کتێبانە دەکەمەوە کە سەرانسەری تەمەنم بۆ تەرخان کردوون، لەو ساتانە سەرم سووڕدەمێنێ کە وام هەست کردوە ئەو رستەو خەون و پەڕانەی سەرمەستیان کردووم وەکو بڵێیت لە خەیاڵی منەوە نەهاتوون — وەکو بڵێیت هێزێکی تر دۆزیویەتەوە و بە سنگێکی فراوانەوە خستویەتە بەردەستم.

دەترسام جەنتاکەی باوکم بکەمەوە و دەفتەرە یاداشتەکانی بخوێنمەوە، چونکە دەمزانی ئەو سەختیانەی من بەرگەم گرتوون، ئەو پێی تەحەمول نەئەکرا و حەزی لە تەنیایی و خەڵوەت نەبوو، بەڵکو حەزی لە تێکەڵبوون لەگەڵ هاوڕێ و ناسیاوو قەرەباڵغی، کۆبوونەوەو جەژن و ئاهەنگ و نوکتەو گاڵتەو گەپ دەکرد. بەڵام دواتر بە چەشنێکی تر بیرم لێکردەوە. ئەم بیرو خەیاڵانە و سەبر و خۆڕاگرییانە هەندێ پێش داوەریی بوون کە من لە ژیانی خۆم و لە نووسەر بوونی خۆم هەمبوون.

زۆر کەس نووسەری پلەی یەك بوون و لە ناوەڕاستی قەرەباڵغیدا و لە ناو خانەوادەو گاڵتەوگەپدا کتێبەکانیان دەنووسی. سەرەڕای ئەوەش کاتێ گەنج بووین، باوکم لە رۆتینی ژیانی ماڵەوە هیلاك بووبوو و ئێمەی بەجێهێشتبوو و چووبوو بۆ باریس و لەوێ وەك زۆربەی نووسەرەکان لە ئوتێل نیشتەجێ بووبوو و دەفتەرەکانی بە نووسین پڕ کردبووەوە. ئەمەشم دەزانی کە هەندێ لەو دەفتەرانە لەناو ئەم جەنتایەدان، چونکە باوکم لەو ساڵانەدا دەستی بە قسەکردن کردبوو سەبارەت بەو قۆناغەی ژیانی کە هێشتا جانتاکەی بۆ نەهێنابووم. تەنانەت لەو

کاتانەشدا کە منالْ بووم باسی ئەو سالآنەی بۆ ئەکردم بەلاّم لەسەر خالّە لاوازەکانی نە ئەدواو هیچی سەبارەت بەو خەونانەی نەئەوت کە بۆ "بوون بە نووسەر" لەسەری دابوون، یان سەبارەت بەو مەسەلانەی پەیوەست بوون بەو ناسنامەیەی کە لە ژووری ئوتێلەکەدا تووشی بووبوو.

لە بری ئەوە بۆی باسدەکردم کە چەند جارێك لەناو شەقامەکانی باریسدا سارتەری بینیوە، چەند کتێبی خوێندوەتەوەو چەند فیلمی بینیوە، بە دلْپاکی و خۆشیەکەوە بۆی باسدەکردم وەکو بلْەیت هەوالْێکی زۆر گرنگت دەداتێ. من لەو کاتەی بوومە نووسەر هیچ کاتێ ئەمەم لە یاد نەچوو یەکێك لە هۆکارەکانی بوونم بە نووسەر ئەمە بووە باوکێکم هەبووە کە زیاتر سەبارەت بە نووسەرە جیهانیەکانی قسەی بۆ کردوم تاکو پاشاو رێبەرە گەورە ئاینیەکان. ئێدی دەبوو بەم زینیەتەوە دەفتەرەکانی باوکم بخوێنمەوە و ئەوەم بیر بکەوێتەوە کە چەند حەقی کتێبخانە گەورەکەیم بەسەرەوە هەبووە. دەبوو ئەمەم لە یاد نەچێت کاتێ باوکم لە گەلْماندا ئەژیا وەکو من حەزیدەکرد لەگەلْ کتێبەکان و بیری خۆیدا بچێتە خەلْوەتەوە – نابێ کارم بەسەر چۆنیەتی ئەدەبی نووسینەکانیەوە هەبێت.

بەلاّم کاتێ بە شەوق و دلْەڕاوکێیەوە سەیری جانتا میراتیەکەی باوکم دەکرد، وا هەستم دەکرد ئەمە رێك ئەو کارەیە کە من پێم ناکرێت. کاتێ باوکم لەسەر قەنەفەی بەرامبەر کتێبەکانیدا ڕائەکشا، کتێب یان گۆڤارەکەی دەستی فرێ ئەداو دەچووە قوولاّیی خەیالْیەوە و ماوەیەکی دوور و درێژ لە بیرو خەیالْیدا نوقم دەبوو.

حالْەتێکم لە ناو روخساریدا دەبینی کە زۆر جیاواز بوو لەو حالْەتەی کە لە کاتی گالْتەو گەپ و قسە و باسی خانەوادەگیدا هەیبوو – من یەکەمین نیشانەکانی ئەم نیگا دەرونیەم تێدا دەبینی – و لەم کاتەدا بە تایبەت لەسەردەمی مندالْی و نەوجەوانیمدا بە نیگەرانیەوە تێدەگەشتم کە ئەو نارەحەت و بێ تاقەتە. ئێستا و پاش سالْەها تێگەیشتم کە ئەم نارەحەتیە هەمان تایبەتمەندییە سەرەکیەیە کە مرۆڤ ئەکاتە نووسەر. تەنیا هەولْ و تێکۆشانی و سەبر و خۆڕاگری بەس نییە بۆئەوەی ببی بە نووسەر، پێویستە سەرەتا هەست بەوە بکەین کە ناچارین لە کۆمەلْ هەلْبەین، لە دانیشتن لەگەلْ کەسانی تردا هەلْبەین، لە ژیانی ئاسایی رۆژانە بێینە دەرەوە و خۆمان لە ژوورێکدا زیندانی بکەین. ئومێد و سەبرمان بۆیە پێویستە تاکو بتوانین دنیایەکی قوولْ لە نووسینەکانماندا بخولْقێنین. بەلاّم شەوقی ئێمە بۆ زیندانی کردنی خۆمان لەو ژوورەدا هەر ئەو شتەیە کە ئێمە وا لێدەکات کار بکەین. پێشڕەوی ئەم جۆرە نووسەرە سەربەخۆیە – کەسێ کە کتێبەکانی بۆ دلْی خۆی ئەنووسێت، ئەو کەسەی تەنیا بە بیستنی دەنگی ویژدانی خۆی بەسەر واژەی کەسانی تردا دەچێتەوە، ئەو کەسەی لەگەلْ کتێبەکانیدا گفتوگۆ ئەکات و بیروڕاکانی سادە ئەکاتەوەو دنیاکەی خۆی ئەخوولقێنێ – بەلْێ، بێگومان ئەم پێشڕەوە (مونتنی)یە، ئەو کەسەی پەیوەندی بە سەرەتای ئەدەبیاتی نوێ وە هەیە. مونتنی

نووسـەرێك بـوو کـە بـاوکم زۆر دەچـووە لای و ئامـــاژەی بـــە منـــیش دەکـــرد کتێبـــەکانی بخوێنمـەوە، مـن حـەز ئەکـەم خـۆم لـەو دەستە نووسەرانە بزانم – لە هەر کوێی ئەم دنیایە بن، لــە خۆرئــاوا یــان لــە خۆرهــەلآت – کــاتیٚ لــە کۆمەڵگە دائەبڕێن و خۆیان لەگەڵ کتێبەکانیاندا لـەناو ژوورێکدا زینـدانی ئەکـەن. دەسـتپێکەری ئـەدەبیاتی راسـتەقینە ئـەو کەسـەیە کـە خـۆی لەگـەڵ کتێبەکانیـدا و لـە ژوورێکـدا زینـدانی ئەکات.

بـەڵام ئێمـە کـاتیٚ لـە کۆمـەڵ دائـەبڕین، تێدەگەین ئێمـە بەو جۆرەی بیرمان لێدەکردەوە بە تـەنیانین. لەگـەڵ واژەی ئـەو کەسانەداین کە بـەر لـە ئێمـە بوونیـان هـەبووە، لەگـەڵ چیرۆکی خـەڵکانی تـر، لەگـەڵ کتـێبی مرۆڤـەکانی تـردا، واژەی مرۆڤـەکانی تـر، بـە کورتیەکـەی هـەر ئـەو شتەی کە ئێمە نەریتی پێدەڵێین-. بە باوەڕی من، ئەدەبیات پڕ بە هاترین گەنجینەیە کە مرۆڤ لە هەوڵی تێگەیشتنی خود دا کۆی کردۆتـەوە. کۆمەڵگـەکان، عەشـیرەت و خێـڵ و خەڵکـەکانی کـاتیٚ بایـەخ بـە واژە دژوارەکـانی نووسـەرانی ئـــەدەن، هووشـــیارتر و پێشـــکەوتوتر و دەوڵەمەنـدتر دەبـن و هـەر بـەو شـێوەیەی کـە هەموومان دەیزانین، سووتاندنی کتێبـەکان و بە سـووك زانـینی نووسـەرانی ئێمـە نیشـانەی سـەردەمی دواکـەوتویی و نارۆشـنبیرییە. بـەڵام هـیچ کـاتیٚ ئـەدەبیات تـەنیا ململانیٚ نەتـەوەیی نیـە. ئـەو نوسـەرەی کـە خـۆی لـە ژوورێکـدا زینـدانی ئـەکات و ئەچـێتە سـەفەرێك بـۆ نـاو خـودی خـۆی، پـاش تێپـەڕینی ساڵەهای ساڵ بنـەمای ئەبـەدی ئـەدەبیات کەشـف ئـەکات:

پێویســـتە شـــارەزایی ئەمـــەی هـــەبێت تـــا چیرۆکەکانی خۆی بە چەشنێك بگێڕێتەوە وەکو بڵێیـت چـیرۆکی مرۆڤـەکانی تـرە و چـیرۆکی مرۆڤـەکانی تـر بـە چەشـنێك بگێڕێتـەوە وەکـو بڵێیـت چـیرۆکی خـودی ئـەون، چـونکە ئەمـە ئەدەبیاتە. بەڵام پێویستە سەرەتا بۆ ناو چیرۆك و کتێبەکانی خەڵکانی تر سەفەر بکەین.

بـــاوکم کتێبخانەیـــەکی باشـــی هـــەبوو – هـەمووی (1500) بـەرگ کتێـب بـوو – زۆریشـی لـیٚ زیـاد بـوو وەك نووسـەرێك. لـە تەمـەنی (22) سـاڵیدا هـەموویم نەخوێنـدبووەوە بـەڵام یـەك بەیـەکیانم دەناسـی – ئـەمزانی کامـەیان گرنگـە، کامەیان زۆر قـووڵ نیـە بـەڵام ئـەکریٚ بـە ئاسـانی بخوێنرێنـەوە. کامـەیان کلاسـیکە، کامـەیان بـۆ فێربـوونی وانـەکان پێویسـتە، کامـەیان هەنـدیٚ مەسەلەی فەرامۆشنەکراو بەڵام سـەرنج راکێشـی سـەبارەت بـە مێـژووی نـاوخۆیی هەیـە، و کامـە نووسـەری فەرەنسی لای باوکم گـرنگترە. هەنـدیٚ جـار لـە دوورەوە سـەیری ئـەو کتێبخانەیـەم دەکـرد و لـە خەیاڵمـدا ئـەمبینی کـە رۆژێـك، لـە ماڵێکی تـردا، کتێبخانەکـەی خـۆم دادەمـەزرێنم. کـاتیٚ لـە دوورەوە سـەیری کتێبخانەکـەی بـاوکم ئەکرد وام دەهاتە بەرچاو کە وێنەیـەکی بچووکە لە دنیای واقعی. بـەڵام ئەمـە دنیایـەك بـوو کـە لـە سووچـی ئێمـەوە دەبینـرا، واتـە لـە ئیسـتەمبول. کتێبخانەکە خۆی شایەتی ئەم لاف لێدانە بوو. بـاوکم لـە سـەفەرەکانی بـۆ دەرەوەی وڵات ئـەم کتێبخانـەی وەدەسـت کـەوتبوو. زیـاتر ئـەو کتێبانـەی لـە پـاریس و ئـەمریکاوە هێنـابوونی، بـەڵام هەنـدیٚ کتـێبی تریشـی لـەو فرۆشـگایانە کڕیبـوو کـە لـە دەیـەکانی 1940 و 1950 ز دا

کتێبی بیانیان دەفرۆشت و هەروەها لە کتێبخانە کۆن و نوێیەکانی ئەستەمبول کە منیش دەمناسین.

دنیاکەی من تێکەڵەیەك بوو لە رووە ناوخۆیی – نەتەوەیی – و خۆرئاوایەکان. لە دەیەی 1970 ز دا منیش تا ڕادەیەکی گەشبینانە دەستم کرد بە دروستکردنی کتێبخانەکەم. بڕیاری لەسەداسەدم نەدابوو کە ببمە نووسەر – هەر بەو شێوەیەی لە کتێبی (ئەستامبول)دا نووسیومە بەم ئەنجامە گەیشتبووم کە لە هەموو حاڵێکدا نابمە وێنەکێش، بەڵام نەمدەزانی ژیانم کەوتە چ کوونێکەوە. لە ناخمدا جۆرە بزێوێکی بێ ئەمانم هەبوو، خواستێکی زۆر بۆ خوێندن و فێربوون، بەڵام لە هەمان کاتیشدا وا هەستم دەکرد ژیانم بە تاڵە و ناتوانم وەکو کەسانی تر ژیان بەسەربەرم. بەشێك لەم هەستەم پەیوەندی هەبوو بەو حاڵەتەی کە لە کاتی سەیرکردنی کتێبخانەکەی باوکمدا تووشی بووم – ژیانکردن لە دەرەوەی سەنتەری شتەکاندا، ڕێك وەك ئەو هەستەیە کە لەو ڕۆژانەدا ئێمەی خەڵکی ئەستەمبول هەمانبوو، واتە هەستکردن بەمەی کە پێویستە بڕۆینە شارە بچووکەکانی تر بژین. هۆکارێکی تریش بۆ ئەم دڵەڕاوکێ و هەستی بۆشاییە لە ئارادا بوو، چونکە بە تەواوی دەمزانی من لە وڵاتێکدا ئەژیم کە بایەخ بە هونەرمەندەکانی – چ وێنەکێش بن، چ نووسەر – نادات و هیچ ئومێدێکیان پێ نابەخشێت. لە دەیەی 1970ز دا ئەو پارەیەی باوکم پێی دەدام دەمبردە ناو بازار و لە کتێبخانە کۆنەکانی ئەستەمبوڵدا بە شەوقەوە کتێبی کۆن و دڕاوو بێ ڕەنگ و ڕووم ئەکڕی و نەك هەر دڵم بەو کتێبانە دەسووتا بەڵکو دڵم بۆ حاڵ و ڕۆژی فرۆشگا کۆنەکانیش ئەسووتا – هەروەها بە حاڵی ئەو کتێب فرۆشە هەژارانەی لە قەراغ شەقام و ناو مزگەوتەکان و کووڵە سووچەکانی وێرانەکاندا کتێبیان ئەفرۆشت.

هەستی سەرەکیم سەبارەت بە پێگەم لە دنیا، ژیان و ئەدەبیات ئەمە بوو کە من لە "سەنتەردا نیم". لە سەنتەری دنیادا، ژیانێکی پڕ بەهرەتر و وروژێنەرتر لە شاری ئێمە بوونی هەیە و من لەگەڵ هەموو ئەستەمبول و هەموو تورکیا لە دەرەوەی ئەم سەنتەرەدابووم. ئەمڕۆکە وا بیر ئەکەمەوە زوربەی مرۆڤەکانی دنیا بەم چەشنە بیر ئەکەنەوە. سەڕای ئەوەش ئەدەبیاتێکی جیهانیش بوونی هەبوو کە دیسانەوە لە سەنتەرەکەی منەوە زۆر دوور بوو. ئەو شتەی لە زەینمدا بوو، ئەدەبیاتی خۆرئاوا بوو، نەك ئەدەبیاتی جیهانی و ئێمەی تورك لەدەرەوەیدا بووین.

کتێبخانەکەی باوکم شایەتحاڵی ئەم بارودۆخە بوو. لەلایەکەوە کتێبەکانی ئەستەمبول بوو – ئەدەبیاتەکەمان، دنیای ناوخۆییمان، بە هەموو وردەکارییە جوانەکانیەوە – و لەلایەکی تریشەوە کتێبەکانی دنیاکەی تر، دنیای خۆرئاوا کە هیچ لە دنیاکەی ئێمە نە ئەچوو، و ئەم لێکنەچوونە هەم بێ تاقەتی دەکردین و هەم ئارەزوومەند. نووسین و خوێندنەوە وەك چوونە دەرەوە لە دنیایەك بوو لە پێناو ئارامگرتن لە گۆڕانکارییەکانی دنیایەکی تر.

واهەستم دەکرد باوکم ڕۆمانی خوێندوەتەوە

تـا لـە ژیـانی خـۆی دەرچـێت و بـۆ خۆررئـاوا هـەڵبێت — هـەر ئـەو کـارەی کـە دواتـر خۆیشـم کردم.

یـان وا بیردەکەمـەوە کـە لـەو رۆژگـارەدا ئێمـە کتێبمان بە دەستەوە دەگرت تاکو لە کەلتووری خۆمـان هـەڵبێین چـونکە ئـەم کـەلتوورە لـە بەرچاوی ئێمە کەلتوورێکی بەتاڵ بوو. تەنیا بە خوێندنەوە نەبوو کە ئێمە ژیانی ئەستەمبولی خۆمان بەجێدەهێشت و بۆ خۆرئاوا سەفەرمان دەکـرد — بـە نووسـینیش هـەر ئـەم کارەمـان دەکـرد. بـاوکم بـۆ پڕکردنـەوەی دەفتـەرەکانی چوو بووە پاریس، خۆی لە ژوورێکدا زیندانی کردبـوو و دواتـریش بـە نووسـینەکانیەوە گـەڕابووەوە تورکیـا. کـاتێ سـەیری جەنتاکـەی بـاوکمم دەکرد وا دەهاتـە بەرچاوم کـە هـەر ئـەم مەسەلەیە تووشی دڵەڕاوکێم ئەکات. من ماوەی (25) سـاڵ لـە ژوورەکەمـدا کـارم کردبـوو تـاکو وەك نووسەرێك لە تورکیادا باری خەرجیم دابین بکەم و ئێستاکە بێتاقەت دەبووم لەوەی باوکم بـیرە قووڵـەکانی لـەم جەنتایـە شـاردۆتەوەو بـە جۆرێك خۆی دەرخستووە وەکو بڵـەیت نووسین کارێکـە دەبـوو بـە نهـێنی بکرێـت، بـەدوور لـە چـاوی کۆمەڵگـە، دەوڵـەت، خـەڵك. دەشـێ هـەر لەبـەر ئـەو هۆیـەش لـە بـاوکم تـووڕە بـووم کـە بەڕادەی من ئەدەبیاتی بە جدی وەرنەگرتبوو.

بەڕاستی لە باوکم تووڕە بووم، چونکە وەکو مـن ژیـانی نـەکردبوو، هـیچ کـات سـەرو سـاختی لەگـەڵ ژیانیـدا نـەبوو، تەمـەنی بـە گاڵتـەو گـەپکردن لەگـەڵ هـاوڕێی و کەسـە خۆشەویسـتەکانی تێپەڕانـدبوو. هەڵبەتـە بەشێکی تـر لـە ناخمـدا پێـی ئـەوتم کـە زۆریـش "تووڕە" نیم بەڵکو زیاتر "بەرچاو تەنگم". بەڵێ وشـەی "بەرچـاو تـەنگ" وشـەیەکی وردتـر بـوو. ئەمە بوو وابێ تاقەتی دەکردم. بۆیە بەو چەشنە کەمتەرخەمی و تووڕەییەی هەمیشەیی خۆمـەوە لـە خـۆم دەپرسـی: "خۆشبەختی چییە؟" ئایا خۆشبەختی خەریکە بیر ئەکاتـەوە کـە مـن لـەو ژوورە چۆڵەدا چەشنە ژیانێکی قووڵم هەیە؟ ئایا خۆشـبەختی خەریکـە ژیـانێکی ئـارام لـە کۆمەڵگەدا بەسـەر دەبات، باوەڕی بـەو شـتانەیە کە هەموو باوەڕیان پێیەتی، یان هەر ئەو کارەی دەکـرد کـە ئێـوەش دەتـانکرد؟ خۆشبەختی یـان بەدبەختی چیە؟

تەمەنێك نووسین لـە تـەنیایی دا و لـە هـەمان کاتیشدا بەرواڵـەت وا نیشـان ئـەدەین کـە لەگـەڵ مرۆڤـەکانی دەورو بەرمانـدا گونجـاوین؟ بـەڵام ئەمانـە ئـەو پرسـیارانە بـوون کـە بـە هـۆی تووڕەبوونمەوە دەمپرسین.

ئـەم بیرۆکەیـەم لـە کوێـوە هێنـاوە کـە خۆشـبەختی پێـوەری ژیـانێکی باشـە؟ مرۆڤـەکانی، نووسـینەکان، هـەموو بـە چەشـنێك رەفتاریـان دەنوانـد وەکـو بڵێیـت گـرنگترین پێـوەری ژیـان خۆشـبەختییە. هـەر ئەمـە خـۆی نەئـەبووە هـۆی ئـەوەی بـیر لـەوە بکەینـەوە بەدواداچوونێکی بۆ بکەین بزانین پێچەوانەشی راسـتە یـان نـە؟ ئـاخر، بـاوکم چـەند جارێـك لـە بنەماڵەکـەی هـەڵهاتبوو — چـەندم دەناسـی؟ چـەند لـەوە دڵنیـابووم کـە درك بـە بـێ ئۆقرەییەکەی ئەکەم؟

هـەر ئـەم بیرۆکانـە دەیانبزوانـدم تـاکو جەنتاکەی باوکم بکەمەوە. ئایا باوکم نهێنیەکی هەبووە، جۆرێك لە بەدبەختی لە ژیانیدا هەبووە

کە من هیچم دەربارەی نەئەزانی، شتێك کە تەنیا بە نووسینیان توانیویەتی بەرگەیان بگرێت؟

هەر کە جەنتاکەم کردەوە بۆنی ئەو سەفەرەم هاتەوە یاد. هەندێ لە دەفتەرە یاداشتەکانم ناسیەوە و زانیم باوکم چەند ساڵ لەمەوبەر نیشانی داوم بەلام هەروا سەرپێیانە نیشانی دابووم. زۆربەی دەفتەرەکانی لە کاتی گەنجیدا بە نووسین پڕ کردبووەوە، هەر ئەو کاتەی کە ئێمەی بەجێهێشتبوو و چوو بوو بۆ پاریس. من وەکو زوربەی ئەو نووسەرانەی خۆشم دەویستن – حەزم ئەکرد بزانم باوکم چی نووسیووە و کاتێ لە تەمەنی ئێستای مندا بووە چۆن چۆنی بیری کردۆتەوە. زۆری نەخایاند تێگەیشتم لەوەی هیچ باسی ئەو شتانە لە ئارادا نیە. ئەو شتەی دەیبزواندم ئەمە بوو کە لە نووسینەکانی باوکمدا یەکسەر لەگەڵ قەڵەم و زمانێکدا رووبەروو بووم کە هی باوکم نیە، ساختەیە، یان بەلایەنی کەمەوە هی کەسێك نیە کە من بە باوکی خۆمم زانیوە. دەترسام نەکو باوکم کاتێ کە نووسیوویەتی، باوکم نەبووە. بەلام لە پشتی ئەم کەسەوە ترسێکی قووڵتریش هەبوو، ترس لەوەی نەکو من لە ناخی خۆمدا خۆم نەبم و نەتوانم هیچ شتێکی بەکەڵك لە نووسینەکانی باوکمدا پەیدا بکەم. هەر ئەمە وایلێدەکردم زیاتر بترسم نەکو باوکم لە بنەماوە کەوتبێتە ژێر کاریگەری نووسەرەکانی ترەوە. هەر لەبەر ئەم ترسە، تووشی هەمان بێ ئومێدی دەبووم کە لە گەنجێتیدا دایگرتبووم و ژیانم، بوونم، ئارەزووم بۆ نووسین و کارەکەی تووشی گومانی کردبوو. لە ماوەی دەساڵی یەکەمی کاری نووسەریمدا ئەم دڵە ڕاوکێ و نیگەرانیانە لە ناومدا زۆر قووڵ بوو، لەگەڵ ئەوەی بەرامبەریان دەوەستامەوە و لە خۆمم دوور دەخستەوە بەلام هەندێ جاریش لەوە دەترسام نەکو رۆژێك دان بە شکستی خۆمدا بنێم – وەك دانپیانانم بە شکست هێنان لە وێنەکێشاندا – تەسلیمی بێ ئومێدی بم و واز لە نووسین بهێنم. باسی دوو هەستم کردووە کە پاش بەستنی جانتاکەی باوکم و وەلانانی لە ناخمدا دروست بووبوو: یەکێکیان ئەمەی کە بە تەنیا لە دەرەوەی سەنتەرەکە ماومەتەوە و ئەویتر ئەمەی کە نەکو من رەسەن نەبم. هەڵبەتە یەکەمجارم نەبوو کە تووشی ئەو حاڵەتە دەبووم. ساڵەهای ساڵ لە کاتی خوێندن و نووسیندا ئەم حاڵەت و هەستانەم دەدۆزیەوە و دەمخستە ناو خۆمەوە لەگەڵ هەمووهەمەچەشنی و لایەنە خوازراو، بێ کۆتایەکانی و رەنگە جۆراوجۆرەکانیدا.

بێگومان ئەو سەرگەردانی و هەستیاری و ئازارە تێپەڕانەی کە ژیان و کتێبەکان لە تەمەنی گەنجێتیمدا پێشکەشیان دەکردم، رۆح و رەوانی ئازاردابووم. بەلام تەنیا بە نووسینی کتێب دەگەیشتمە تێگەشتنێکی کاملتر لەو مەسەلانەی کە پەیوەست بوون بە رەسەنایەتییەوە. (بۆ نموونە لە کتێبی (ناوم سووورەو کتێبی رەش) و سەرەڕای ئەوەش لە پەراوێزدا گەشتن بە دەرك پێکردنی زیاتر لە ژیان (بۆ نموونە لە کتێبی بەفر و ئەستەمبول دا).

نووسەر بوون بۆ من هاوتایە لەگەڵ زاڵبوون بەسەر برینە شاراوەکانی ناخماندا، (ئەو برینانەی ئەوەندە شاراوەن کە خۆمان زۆر کەم لێیان بە ئاگا دەبین)، بەسەبر و خۆڕاگربوونمان

بەرامبەر ئەم برینانە، ناسینیان، شیکردنەوەیان و داگیرکردنی ئەم دەرد و ئازار و برینانەو کردنیان بە بەشی هووشیاری زەینیەت و داڕشتن و نووسین.

نووسەر باس لەو شتانە ئەکات کە هەموو ئەیزانن بەڵام نازانن کە ئەیزانن. کەشفکردنی ئەم ناسین و وردبوونەوە لە گەشەسەندنی ئەم کارە زۆر ئارامبەخش و پڕ چێژە. خوێنەر ئەچێتە دیداری دنیایەکەوە کە هەم ئاشنایە و هەم نامۆشە.

کاتێ نووسەرێك ساڵەها خۆی لە ژوورێکدا زیندانی ئەکات تاکو کارەکەی شەفاف بکاتەوەو دنیایەك بخوڵقێنێت - ئەگەر کارەکەی لە برینە شاراوەکانەوە دەستپێبکات، بیزانێت یان نەیزانێت ئەوە خەریکە باوەڕی بێ کۆتایی خۆی نیشانی مرۆڤەکان ئەدات. باوەڕی من لەمەوە هەڵدەقووڵێت کە هەموو مرۆڤەکان لەیەك ئەچن، ئەوانی تریش برینی وەکو برینەکانی منیان هەیە - بۆیە تێدەگەن. تێکڕای ئەدەبیاتی راستەقینە لەم باوەڕە ساوا و پڕ ئومێدەوە دەردەکەوێت کە مرۆڤەکان لەیەك ئەچن. کاتێ نووسەرێك ساڵەهای ساڵ لە ژوورێکدا خۆی زیندانی ئەکات، ئەمە نیشانی ئەدات کە مرۆڤ تاکە و دنیا سەنتەری نیە.

بەڵام هەر بەو شێوەیەیە کە لە جەنتاکەی باوکم و لەبیرەنگ و روویی ژیانمان لە ئەستەمبوڵدا بەدی دەکرێت، لە راستیدا دنیا سەنتەرێکی هەبوو کە زۆر لە ئێمەوە دوو ر بوو. من لە کتێبەکانمدا تاڕادەیەك بە وردی باسی ئەوەم کردووە کە چۆن ئەم مەسەلە گرنگە چەشنێك لە هەستی شارستانی بوونی چیخۆڤ دروست دەکرد و چۆن چۆنی لە روویەکی ترەوە بووەتە هۆی ئەوەی من گومان لە رەسەن بوونی خۆم بکەم. بە ئەزموون ئەمە دەزانم کە زوربەی مرۆڤەکان لەسەر ئەم گۆی زەویەدا لەگەڵ ئەم هەستانەدا دەژین و زۆریشیان تەنانەت زیاتر لە من هەست بە نائەمنی و بێ دەسەڵاتی و نا لایەقی ئەکەن. بەڵێ، گەورەترین مەسەلەی مرۆڤەکان هێشتا برسیەتییە و نەبوونی پارچەیەك زەوی و پەنایەکە.. بەڵام ئەمڕۆ کە تەلەفزیون و رۆژنامەکان زۆر خێراتر و سادەتر لە ئەدەبیات ئەم مەسەلە بنەڕەتیانە نیشان ئەدەن. ئەو شتەی کە پێویستە ئەمڕۆ ئەدەبیات لەسەری بدوێت و بە دوای دابگەڕێت ترسە بنچینەییەکانە: ترس لەمانەوە لە دەرەوەی سەنتەرەکە، ترس لە پشت گوێخستن، هەستی بێ نرخ بوون کە تێکەڵ بەم ترسانە ئەبێت، سووکایەتیپێکردن بە کۆمەڵەکانی، برینداربوون و ژێر پێخستنی شەرەف، هەڵچوونەکان، سەرزەنشت و سووکایەتی پێکردنە وەهمیەکانی و ئەو درۆناسیونالیستیانەی بەدوایدا دێن..

من هەر کاتێ رووبەرووی ئەم جۆرە هەستانە ئەبمەوە، دەزانم کە پەنجە لەسەر جۆرێك لە تاریکی لە دەرونمدا دائەنێن. من زۆرجار خەڵك و کۆمەڵ و نەتەوەم لە دەرەوەی دنیای خۆرئاوادا بینیووە - من زۆر بە ئاسانی خۆم بە یەکێك لە ئەوان ئەزانم - کە تووشی ئەو ترسانە بوون و هەندێ جاریش تووشی کرداری وا بوون کە هەمووی ئەنجامی هەڵچوون و ترس لەوەی سووکایەتییان پێبکرێت. ئەزانم کە لە خۆرئاوادا - دیسانەوە زۆر بە ئاسانی خۆم بە

یەکێك لەوان ئەزانم – هەندێ نەتەوەو خەڵکانێك هەن کە ناز بە سەروەت و سامانەکانیانەوە دەکەن و شانازی بەوە ئەکەن کە ڕێنیسانس و ڕۆشنگەری و مۆدێرنیتە یان بە دیاری بۆ هێناوین، و هەندێ جار کەوتوونەتە ناو جۆرێك لە خودپەسەندییەوە کە هەر بەو ڕادەیە گەلۆرانەیە واتە تەنیا باوکم نەبوو، بەڵکو هەمووومان لە ڕادەبەدەر بایەخمان بە بیرۆکەی دنیایەکی خاوەن سەنتەرداوە. ئەو شتەی کە وامان لێئەکات لە ژوورێکدا خۆمان زیندانی بکەین و ساڵەهای ساڵ بنووسین. باوەڕهێنان بە پێچەوانەی ئەو بیرۆکەیە، باوەڕهێنان بەوەی کە ڕۆژێك دێت نووسینەکانمان دەخوێننەوەو لێی تێدەگەن، چونکە مرۆڤەکانی سەرانسەری دنیا لەیەك ئەچن. بەڵام ئەم گەشبینیە، هەر بەو جۆرەی نووسینەکانی خۆم و باوکمدا لێی تێدەگەم، جۆرێك گەشبینی تێدایە، لەبەرئەوەیە کە لە پەیوەندی بە عەشق و نەفرەتی لەگەڵ خۆرئاوادا لەگەڵ ئەم نووسەرە گەورەیەدا سەفەرم کردووە و ئەو دنیایەم بینیوە کە لەو دیوەوە بینای کردووە.

هەموو ئەو نووسەرانەی ژیانیان خستۆتە خزمەتی ئەم ئەرکەوە باش ئەم ڕاستیانە ئەزانن کە: ئامانجی سەرەتاییمان هەر چییەك بێت، ئەو دنیایەی کە ئێمە پاش ساڵەهای ساڵ نووسینی بە ئومێدەوە دەیخووڵقێنین، لە ئەنجامدا بۆ زۆر شوێنی جیاوازتر دەگوێزرێتەوە. ئێمە لەو مێزە دوور دەخەنەوە کە بە خەم و تووڕەییەوە کارمان لەسەر کردووەو ئەمانبەنە ئەودیوو خەم و تووڕەییەوەو ئەمانبەنە دنیایەکی تر. ئەکرێ باوکم بەو دنیایە نەگەیشتبێ؟ وەك شتێکی وشك و بەستوو کە وردە وردە نەرم ئەبێتەوەو شێوە پەیدا ئەکات، وەك دوورگەیەك کە پاش سەفەرێکی دوور لە دەریادا بە هەموو ڕەنگەکانیەوە لە نێوان هەڵمەکاندا دەرئەکەوێت، ئەم دنیایەی تر عاشقمان ئەکات. جادومان ئەکات، وەك ئەو گەشتیارانەی لە باشوورەوە ئەهاتن و ئەستەمبول لە نێوان هەڵم و دووکەڵدا دەرئەکەوت. لە کۆتایی ئەو سەفەرەی کە بە ئومێد و بزێوییەوە دەستی پێکردووە، شارو مزگەوت و گومەزەکان لە بەرامبەریان دەرئەکەوتن، تێکەڵەیەکی نارێك لە خانوو و شەقام و گرد و پردەکانی. دنیایەکی کامڵ. کە دەیبینین حەزئەکەین بچینە ناویەوە و خۆمانی تێدا ون بکەین، ڕێك ئەو کارەی کە لەگەڵ کتێبدا دەیکەن. چونکە وا هەستمان کردووە کە خەڵکانی شارە بچووکەکانی، لە پەراوێزین و تووڕەو زۆر خەمبارین، چوین لە پشتی مێزی کارکردنەکەمان دانیشتووین و لە پاش ئەم هەستانەدا دنیایەکی کامڵمان دۆزیوەتەوە. هەستی ئێستای من پێچەوانەی هەستی منداڵی و گەنجێتیمە، هەنووکە سەنتەری جیهان لای من ئەستەمبولە. هۆکارەکەشی تەنیا ئەمە نیە کە هەموو تەمەنم لەوێدا ژیاوم، بەڵکو هی ئەمەشە کە ماوەی 33 ساڵە بەدەوام وەسفی، شەقامەکانی، پردەکانی، مرۆڤەکان، سەگەکان، خانووەکان، فەوارەی ئاوەکانی، پاڵەوانە سەیرەو سەمەرەکانی، دووکانەکانی، شوێنە بەناوبانگەکان، دووکان و ڕۆژو شەوەکانیم کردووە، کردوومن بە بەشێکی بوونی خۆم، لە ئامێزم گرتوون. ساتێکیش هات کە ئەم دنیایەی بە دەستی خۆم دروستم کردبوو، ئەم

دنیایەی کە تەنیا لە مێشکی خۆمدا بوو، زۆر حەقیقی تر لەو شارەی تێدا دەژیم هاتە بەرچاو. لەو کاتەدا هەموو ئەو مرۆڤ و شەقام و بینایانە وەك بڵەیت دەستیانکرد بوو بە دوان پێکەوە، کارلێکردن لەسەریەکتری هەر بەو شێوەیەی من پێشبینیم نەکردبوو، وەك بڵەیت تەنیا لە خەیاڵی مندا یان لە کتێبەکانمدا نەژیابێتن بەڵکو بۆ خۆیان ژیانیان کردووە. من ئەم دنیایەم وەك ئەو کەسانە دروست کردووە کە بە دەرزی بیر هەڵئەکەنن و ئێستا ئەم دنیایە لە هەموو شتێکی تر حەقیقی ترە. ئەشێ باوکم لەو ساڵانەدا کە دەینووسی ئەم چەشنە خۆشبەختیەی تاقیکردبووەوە. کاتێ سەیری جانتاکەی باوکم دەکرد وا بیرم ئەکردەوە کە نابێ دەربارەی پێشداوەری بکەم، ئاخر، زۆر مەمنوونی بووم. ئەو هیچ کاتێ بۆ من باوکێکی ئاسایی نەبووە کە ئەمرم بەسەرا بکات و سزام بکات، بەڵکو باوکێك بووە کە هەمیشە ئازادی پێ بەخشیووم و ڕێزی لێئەگرتم. زۆر جار وا بیرم کردۆتەوە کە ئەگەر من توانیومە هەندێ جار ئازادانە یان منداڵانە هێزی خەیاڵی خۆم بەکاربێنم، هی ئەوە بووە کە بە پێچەوانەی زۆربەی هاورێکانم لە تەمەنی منداڵی یان گەنجێتیدا، هیچ لە باوکم نەترساوم. هەندێ جار لە ناخی دڵمەوە بیرم کردۆتەوە ئەگەر توانیومە ببمە نووسەر هۆکارەکەی ئەمە بووە کە باوکیشم لە گەنجێتیدا ویستوویەتی ببێتە نووسەر. ئێدی دەبوو بەبێ حەساسیەت نووسینەکانی بخوێنمەوە — هەوڵبدەم تێبگەم لەو ژوورانەی ئوتێلەکەدا چی نووسیووە.

بەم بیرۆکە پڕ ئومێدانە چوومە لای جەنتاکەوە. هێشتا هەر لە شوێنەکەی خۆی بوو، واتە ئەو شوێنەی باوکم لێی دانابوو. بە ئیرادەیەکی تەواوەوە چەند دانە لە دەستنووسەکانیم خوێندەوە. باوکم سەبارەت بە چی نووسیبووی؟

چەند دیمەنێك لە پەنجەرەی ئوتێلەکانی پاریس، چەند پارچە هۆنراوەیەك، چەند تێکستێك کە هەندێ شتی دژ و هاو دژی تێدا هێنابووە ئاراوە، هەندێکیش شیکردنەوەی تێدابوو.. کە ئەمانە دەنووسم لە پیاوێك ئەچم کە تازە تووشی کارەساتی ئوتومبیل بووە و هەوڵئەدات شتەکانی بیر بکەوێتەوە کە ڕوویانداوە بەلاّم لە هەمان کاتیشدا ئەترسێ لەوەی نەکو شتی زۆری بیر بکەوێتەوە. کاتێ منداڵ بووم و باوك و دایکم پێکەوە شەڕیان ئەکرد — و دوای ئەوە بێ دەنگیەکی مەرگ ئاسا دەستی بەسەرکەش و هەواکەدا دەگرت، باوکم خێرا رادیۆکەی دەکردەوە تاکو دۆخەکە بگۆڕێت و مۆسیقا یارمەتی دەداین تاکو زووتر ئەو دۆخەمان بیر بچێتەوە.

مۆڵەتتان لێدەخوازم منیش بە چەند وشەی جوان حاڵ و هەوا کە بگۆڕم و هیوادارم ئەم وشانە وەك ئەو مۆسیقایە کارتان تێبکات. هەر بەو جۆرەی خۆتان دەیزانن، ئەو پرسیارەی کە زۆر لە ئێمەی نووسەر دەپرسرێت، —هەر ئەو پرسیارەیە کە من حەزم لێیەتی — ئەمەیە: بۆچی دەنووسی؟ من ئەنووسم چوونکە پێداویستیەکی رۆحیم هەیە بۆ ئەوەی بنووسم! من ئەنووسم چونکە ناتوانم وەکو مرۆڤەکانی تر کاری ئاسایی بکەم — من ئەنووسم چونکە ئەمەوێ ئەو کتێبانە بخوێنمەوە کە لەو کتێبانە

ئەچن کە خۆم ئەیانووسم. من ئەنووسم چونکە لە هەمووتان تووڕەم، لە یەك بە یەکتان تووڕەم. من ئەنووسم چونکە حەز ئەکەم هەموو ڕۆژەکەم لە ژوورەکەمدا دانیشتم و بنووسم. من ئەنووسم چونکە تەنیا بە گۆڕینی ژیانی ڕاستەقینە دەتوانم لە ژیانی ڕاستەقینەدا بەشداربم، من ئەنووسم چونکە ئەمەویت کەسەکانی تر، هەمووتان، هەموو دنیا، بزانن کە ئێمە لە ئەستەمبوڵ، لە تورکیا، چۆن ژیاوین و هێشتا چۆن ئەژین. من ئەنووسم چونکە حەزم لە بۆنی کاغەز و قەڵەم و مەرکەبە. من ئەنووسم چونکە زیاتر لە هەموو شتێ باوەڕم بە ئەدەبیات و هونەری ڕۆماننووسینە. من ئەنووسم چونکە چەشنێکە لە خوو و عادەت، چەشنێکە لە عەشق و شەیدایی. من ئەنووسم چونکە ئەترسم فەرامۆش بکرێم. من ئەنووسم چونکە حەزم لەو بەهرەو شانازییانەیە کە نووسین وەك دیاری پێم دەبەخشێ. من ئەنووسم تاکو تەنیا بم. من ئەنووسم چونکە ئەشێ ئومێدم هەبێ تاکو تێبگەم بۆچی ئەوەندە لێتان تووڕەم. بۆچی لەیەك بەیەکتان تووڕەم. من ئەنووسم چونکە حەزئەکەم شتەکانم بخوێنرێنەوە. من ئەنووسم چوونکە هەر کە دەستم بە نووسینی ڕۆمان یان وتار یان تێکستێك کرد ئەمەوێت تەواوی بکەم. من ئەنووسم چونکە هەموو چاوەڕێی نووسینم لێ ئەکەن. ئەنووسم چونکە باوەڕێکی منالآنەم هەیە بە نەمر بوونی کتێبخانەکان، بە شێوازی دانانی کتێبەکانم لە ناو کتێبخانەکانمدا. من ئەنووسم چونکە شتێکی زۆر وروژێنەرە کاتێ هەموو جوانی و بلیمەتیەکانی ژیان ئەکەم بە وشە. من نانووسم بۆ ئەوەی چیرۆك بگێڕمەوە، بەڵکو ئەنووسم تاکو چیرۆك بخوولقێنم. من ئەنووسم چونکە ئەمەوێت لەم دڵەڕاوکیە ڕزگاریم ببێت وەکو بڵێیت شوێنێك هەیە بۆئەوەی بۆی بچم، بەلآم ڕێك وەك خەونەکان — ناتوانم بگەمە کۆتاییەکەی. من ئەنووسم چونکە هیچ کاتێ نەمتوانیوە بەختەوەربم. من ئەنووسم تاکو بەختەوەربم. باوکم هەفتەیەك دوای ئەو جارەی هات و جانتاکەی لا دانام، جارێکی تریش هات. وەکو هەمیشە نەستەلەی بۆ هێنام (بیری چوو بوو من تەمەنم 48 ساڵە) وەکو هەمیشە سەبارەت بە ژیان، سیاسەت، هەواڵەکان و پڕو پاگەندەی خزم و کەس و کار قسەمان کرد و پێکەنین. لە ساتێکدا باوکم سەرنجی ئەو شوێنەی دا کە جەنتاکەی تێدا دانابوو و زانی کە لە شوێنی خۆی نەمابوو.

سەیرێکی یەکترمان کرد. بێدەنگیەکی قورس دەستی بەسەر کەش و هەواکەدا گرت. پێم نەوت جەنتاکەم کردۆتەوەو سەیرم کردووە. ڕووم وەرگەڕاندەوە. بەلآم باوکم تێگەیشت. هەر بەو جۆرەی کە من ئەمزانی ئەو تێگەیشتووە. هەر بەو جۆرەی کە ئەو تێدەگەیشت کە من تێگەیشتبووم لەوەی پێیزانیوە.

بەلآم زنجیرەی ئەم تێگەیشتنانە تەنیا تا ئەو ڕادەیە درێژەی پەیدا کرد کە لەو چەند چرکەیەدا بڕی دەکرد. باوکم پیاوێکی شاد و ساکار بوو کە متمانەی بەخۆی هەبوو: زەردەخەنەیەکی پێشکەش کردم، هەروەکو هەمیشە. کاتێکیش بەجێیهێشتم هەمان قسە خۆشەکانی جارانی پێ وتم ڕێك وەك باوکێك.

وەك هەمیشە سەیری ڕۆیشتنە دەرەوەیم کرد و بەخیلیم بە بەختەوەری و ئارامی و

کەمتەرخەمبوونی برد. بەلاّم بیرم کەوتەوە کە ئەو رۆژە دڵخۆشـیەکم تێدا بوو کە لێی شەرمەزار بووم. هۆی شەرمەزاریەکەم ئەمە بوو وابیرم کردەوە دەشێ وەك ئەو لە ژیاندا ئاسوودە نەبم، دەشێ وەك ئەو ژیانێکی بەختەوەرانەم نەبووبێ، بەلاّم من ژیانم خستۆتە خزمەتی نووسین- ئەشێ لە قسەکەم گەیشتبن - شەرمم دەکرد بیر لەو شتانە بکەمەوە کە بە زیانی باوکم بێ. لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا رێك بە زیانی باوکێك کە هیچ کاتێ بێتاقەتی نەکردووم و ئازادی پێبەخشیووم. هەموو ئەمانە بیرمان ئەخەنەوە کە نووسین و ئەدەبیات پەیوەندییەکی زۆر نزیکیان بە نەبوونی سەنتەرێك لە ژیانمان و هەستکردن بە گوناه و بەختەوەریمانەوە هەیە.

بەلاّم چیرۆکەکەم ئاوێنەیەکی هەیە کە ئەو رۆژە خێرا شتێکی تری بیر ئەخستمەوە و دەبووە هۆی ئەوەی زیاتر و قووڵتر هەست بە گوناه بکەم. بیست و سێ ساڵ بەر لەوەی باوکم جەنتاکەیم بۆ بهێنێ و چوار ساڵ پاش ئەوە کە لە تەمەنی (22) ساڵیدا بڕیارمدا بوو ببمە رۆماننووس و هەموو شتەکانم واز لێهێنابوو و خۆم لە ژوورێکدا زیندانی کردبوو، ئاخرەکەی یەکەمین رۆمانم نووسی: (جەودت بیگ و کوڕەکانی). بەر لە چاپکردنی بە دەستی لەرزۆکەوە نوسخەیەکی تایپکراوم دا بە باوکم تا بیخوێنێتەوە و ڕای خۆیم پێ بڵێت. هۆکارەکەشی تەنیا ئەمەنەبوو کە فیکر و سەلیقەیم بە دڵ بوو. ڕای ئەوم لا گرنگ بوو چونکە ئەو بە پێچەوانەی دایکم ناکۆك نەبوو لەسەر ئەوەی من ببمە نووسەر. ئەوکاتە باوکم لەگەڵماندا نەبوو. چووبووە شوێنێکی زۆر دوور بێ سەبرانە چاوەڕێی هاتنەوەیم ئەکرد. پاش دوو هەفتە گەڕایەوەو من ڕامکرد دەرگای لێ بکەمەوە. باوکم هیچی نەوت، تەنیا دەستی کردە ملم هەر بەو چەشنەی کە هەموو کاتێ خۆشحاڵی خۆی دەرئەبڕی. ماوەیەك لە بێ دەنگی و شڵەژاندا نووقم بووین، ئەو جۆرە بێدەنگیانەی کە لە ساتە پڕ لە سۆز و هەڵچوونەکاندا دەست بەسەر دۆخەکەدا ئەگرێت.

پاشان کە ئارامیمان گرت و دەستمان بە قسەکردن کرد، باوکم بە ئاوازێکی تەواو ستایش گەرانەوە پێی وتم کە چەند باوەڕی بە من و یەکەم رۆمانەکەم هەیە. پێی وتم کە رۆژێك دێت ئەم خەلاّتەی ئێستا- کە بەوپەڕی دڵخۆشیەوە هاتووم وەریگرم- وەرئەگرم.

ئەمەی نەئەوت کە تەنیا لە باشبوونی ڕای خۆی دڵنیام بکاتەوە یان ئەم خەلاّتە بکاتە ئامانجی ژیانمەوە. بەڵکو وەك باوکێکی تورك دەیویست پشتگیری لە کورەکەی بکات و بۆ هاندانی پێی دەوت: "رۆژێك دێت کە تۆ دەبیتە پاشا!". ساڵەهای ساڵ باوکم بۆ هاندانم ئەم جۆرە رستانەی پێ ئەوتم.

باوکم لە دیسەمبەری ساڵی 2002 کۆچی دوایی کرد.

ئێستا و لە خزمەت ئەکادیمیای سوید و ئەندامە پایە بەرزەکانیدا ئەم خەلاّتە گەورەیە - ئەو شانازییە گەورەیە - یان پێ بەخشیووم، و لە بەرامبەر میوانە بەرێزەکانمدا لە ناخی دڵمەوە ئارەزوو دەکەم خۆزگە باوکم لێرە بوایە.

**سەرچاوە**

گۆڤاری نگاه نو ژمارە 72 بهمن 1385.

# خۆرخی لویس بۆرخیس

له فارسییەوە: حەمە ڕەسوڵ حەسەن پوور

خۆرخی لوییس بۆرخیس[1] ساڵی 1899 له بۆینس ئایرس هاتۆته دونیاوه. باوکی خۆرخی گیرمۆ بۆرخیس نوێنەرو مامۆستای دەروونزانیبوو. زمانی ئینگلیزی له داپیرەی و مامۆستای ماڵەوەی "میس ێنك"ەوه فێربوو و پاشان بەیارمەتی دایکی خوێندنی زمانی ئیسپانی فێربوو. لەڕاستیدا قوتابخانەی سەرەتایی ئەو، کتێبخانەکەی باوکی بوو. هەروەك خۆی دەڵێت :"ڕاستییەکەی ئەوەیە من له باخێك و لەپشت محەجەری ئاسنی چەشنی نێزه، و له کتێبخانەیەکی که پەرتووکی زۆرو بێ ئەژماری بەزمانی ئینگلیزی تێدابوو، گەورەبووم" ئەگەر پرسیارم لێبکەن چ شتێك له ژیانمدا گرنگ بووه، له وەڵامدا دەڵێم :"کتێبخانەی باوکم. جاری وایه بیردەکەمەوە لەڕاستیدا هەر لەم کتێبخانەیه دەرنەکەوتووم." لەوێدا "هڵکبری فین"ی مارك تواین، "جەزیرەی گەنج"ی ئیستیۆنسن، چەند بەرهەمی وێلز، هەزارویەك شەو و "ئینجیل"ی بەزمانی ئینگلیزی و........ خوێندنەوه و لەگەڵ نووسەرانی وەك: دیکینز، هاوسورن، جاك لەندەن، یۆو سێرڤانتس یەکتریان ناسی. له تەمەنی شەش ساڵان بەفەرمی ڕایگەیاند: دەمەوێت ببمه نووسەر. ساڵی 1908 یەکەم بەرهەمی که وەرگێڕانی شازادەی خۆشبەخت له نووسینی ئۆسکار وایڵد بوو، چاپکرا.

ئەو له سەرەتای منالییەوە دووچاری نزیك بینین بوو که بەمیرات بۆی مابۆوه، باوکیشی خەریکبوو کوێربێت. ساڵی 1914 گەشتی بۆ ئەورووپا کردو له جنێف درێژەی بەخوێندن داو شارەزای ئەدەبیاتی فەڕەنسابوو، زمانی ئەڵمانیش فێربوو، چونکی زمانی فەلسەفەیه. ئۆگری زۆری به نیچه، و بەتایبەتی شۆپێنهاوێر پەیداکرد. دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم، بۆ بۆینس ئایرێس گەڕایەوه و لەبەرئەوەی کتێبخانەکەی باوکی لەناو چووبوو هەموو ڕۆژێ بۆ کتێبخانەی گشتی دەچوو و بابەتی له قامووسی بریتانیکا دەخوێندەوه.

"ئەمیر رۆدریگز مۆنیگاڵ[2]" ڕەخنەگری بەناوبانگی ئۆرۆغوایی کە چەند کتێبێکی سەبارەت بە بۆرخس نووسیون دەڵێت:"قاموسەکان لە بواری داهێنانی ئەدەبی و گەلاڵە دارشتنی بنچینەیی و هەندێك لەشێوەی دارشتنەکان، گەلاڵە گەلێکن بۆ ووتارو تەنانەت بەشێکی زۆری داستانە بەناوبانگەکانی بۆرخس." ساڵی 1925 کۆمەڵە وتاری "شۆفارەکان"و ساڵی دواتر "مانگی بەرەو لەناوچوون"ی بەچاپ گەیشتن. ساڵی 1928 کتێبی "زمانە ئەرجەنتینیەکان"ی بڵاوکردەوە کە بەتایبەتی لێکۆڵینەوەیەکە سەبارەت بە"لوونفاردۆ[3]"، زمانی باوی گەڕەکە نزمەکانی بۆینس ئایرێس. پاشان دەفتەری سان مارتین (کۆمەڵە هۆنراوە)ی "ئێڤاریستۆ کاریگۆ[4]" و "پەیڤینەکان . کۆمەڵەوتار"ی نووسی. هەر لەو ساڵانەدا چۆوە نێو دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "سور[5]" کە "ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ[6]" بناخەوانەیی بوو و ئەم گۆڤارە بۆماوەی چل ساڵ دەوری سەرەکی لە بواری ڕوناکبیری ئەرجەنتیندا بینی. لەنێوان ساڵەکانی 1933ـ1935 بەرپرسی پاشکۆی ئەدەبی گۆڤاری "کرتیکا[7]"ی لەسەر شانبوو و لەوێدا دەستی بە چاپکردنی چیرۆکەکانی کرد. پاشان ئەوانی لە کتێبی"مێژووی گشتی بێ متمانەیی[8]"دا بڵاوکردەوە. لەم بارەوە وتوویەتی: "ئەوانە گەمەی مرۆڤی شەرمنن کە لەخۆیان ڕانابینن چیرۆك بنووسن و بە ساختەکاری و گۆڕینی بەرهەمی خەڵکی خۆیان سەرقاڵ دەکەن ." "ئەو گەلاڵە سەرەکییانەی بەرەو نووسینی چیرۆکی ڕاستەقینە هانیاندام".

ساڵی 1926 "مێژووی ئەبەدییەت"ی نووسی، کۆتایی ساڵی 1937 یەکەم پیشەی فەرمی لە کتێبخانەیەکی دەورووبەری بۆینس ئایریس وەدەست خست و بۆماوەی دە ساڵێك لەم پیشەیەدا مایەوە. لە ماڵەکەیەوە کە لە سەنتەری شاردابوو بە تراموا خۆی دەگەیاندە ئەو شوێنەو بە کەڵکوەرگرتن لەو دوو کاتژمێرەی بۆ ئەم گەشتەی دەخایاند، دەستی بە خوێندنەوەی کتێبی قەبارە گەورە دەکرد. بەم چەشنەو بێ زانینی زمانی ئیتاڵی و بە کەڵك وەرگرتن لەو شێوەی بە گەنجی لە جنێف یارمەتی دابوو بۆئەوەی ئەڵمانی فێر بێت و بە کەڵك وەرگرتن لە وەرگێڕدراوی ئینگلیزی پەخشانی "جۆن ئایتکین کارلایل[9]" سەرگەرمی خوێندنەوەی کۆمیدی ئیلاهی بوو. (دەگەڕێینەوە بۆ سەر ئەم بابەتە).

ساڵی 1942 بەهاوکاری "ئادۆلفۆ بیویی کاسارس[10]" ڕۆماننووسێکی خەیاڵی یان بەناوی "بۆستووس دومێك[11]" هێنایە بەرهەم کە ناوەکەیان لە ناوی بابووباپیرانەوە وەرگرتبوو، بۆستووس باپیرە گەورەی بۆرخس و دومێك باپیری بیویی بوو. بۆ خۆی دەڵێ:"ئەوەی لەگەڵ بیۆی کاسارس دا ڕوویدا زۆر سەیر بوو. نووسینمان بەیەکەوە دەستپێکردو بۆمان دەرکەوت واژۆکردنی، ئادۆلفۆبیوی کاسارس و خۆرخێ لوویس بورخس بەسەر کتێبەکەوە هەندێ خۆبەزل زانی و دەست و پێگیرە. پاشان یەکێکمان دۆزییەوە ناوی بۆستووس دومێك بوو، موعجیزەیەك ڕوویدا: ئێمە بە بیرکردنەوە بۆ بۆستۆس دومێکمان دەنووسی، ئەو نەبوو دەینووسی، من

نەبووم کە دەمنووسی ، بۆستووس دومێك بوو. شێوەی نووسینی خۆی هەبوو، جاریوابوو گاڵتەی ئەوتۆی دەکرد کە ئێمە حەزمان لێنەبوو، ئەو زمانەی کەڵکی لێوەردەگرت هی ئێمە نەبوو، وەلێ بەهەرحاڵ لەبووندا بوو. بەڵام کاتێك لەبووندا بوو کە ئێمە بەیەکەوە کارماندەکرد، چونکی ئەگەر ئەو بە تەنیایی بینووسیبا یان ئەگەر من تەنیا بمنووسیبا لەوانەبوو تەنیا دوو دێڕ بێت کەلەو دوورەوە بیرهێنەرەوەی بۆستووس دومێك بێت. دواکتێبی نووسیم "ڕۆژ ئەژمێری بۆستووس دومێك"ە لەوانەیە یەکێك لەم کتێبانە بێ کە لێرە هونەری مۆدێرنی ناوە." ساڵی 1944 چیرۆکە خەیاڵییەکانی چاپکرد (کۆمەڵە چیرۆك) کە کۆمەڵە چیرۆکێك بوو حەڤدە چیرۆکی خەیاڵی لەخۆگرتبوو، بەواتای بۆرخسی وشەوە، واتا شێوەی نووسینی فەلسەفی و ماوەڕای سروشتی خاپێنەر بوو، بابەتی سەرەکی چیرۆکەکانی ئەو "کتێبە" واتا نووسین و خوێندنەوەیە: ئەو کتێبانەی پێشتر نووسراون ("نزیکبوونەوە بە دەرگای ئەلموعتەسەم") یان دەنوسرێت: ("بیرمونارد کۆکەرەوەی دونکیخوەت"): ڕەخنەگرێك بەدیسانەوە داهێنانی ئەو هەلوومەرجەی بەرهەمهێنانی دۆنکیخوەتی ڕەخساند بەرەولایەك چوو کە بەرهەمی "سێرڤانتس"ی وشە بە وشە (سەرلەنوێ) نوێ بکاتەوە. کتێبی (سەرچاوەی ڕازونهێنی (تلون، ئوکبر، ئۆربیس، ترتیوس[12])یان کردنەوەی ڕازونهێنی (باغی کوێرە ڕێیە دابەشکراوەکانی، مردن و جەمسەرپێوە) کتێبی پێکهاتنی جیهان (کتێبخانەی بابل) وهتد.

هەروەك لەم چیرۆکانەدا تووشی بابەتی جێگەی سەرنجی بۆرخس دەبین، وەك بابەتی دوانە، یان هەزار "تۆ". ئەم کتێبە نمونەیەکی جیهانی بۆرخسییە کە لە چیرۆکی "کەلاوە خڕەکان " گەیشتۆتە چڵە پۆپە. ئەو پیاوەی بەنیازە هێزی داهێنەر ببەخشێتە خەونەکانی، بۆی دەردەکەوێت خۆشی جگە لە خەونی تاکێکی تر هیچی دیکە نییە.

کارتێکردنی "پرۆنیست"ەکان لە شانۆی سیاسی ئەرجەنتین زیابووبوو ئەمە بۆرخسی نیگەران کردبوو: "ڕەوشەکە لە ئەرجەنتین نابارە، بەچەشنێکی ئەوتۆ کە بەشێکی زۆری ئەرجەنتینیەکان بێئەوەی بەخۆیان بزانن خەریکە دەبن بەنازی.". بە هەڵبژاردنی ساڵی 1946، جنراڵ "پرۆن[13]" بوو بە سەرۆك کۆمارو "بەچوونەسەری" پۆستی بۆرخس بۆ پشکێنەری مریشك و کەروێشك لە بازاڕەکانی پایتەخت و لابردنی لەی پۆستی کتێبداری، بەتوندی سوکایەتی پێکرا. وتاری توندی بۆرخس لە بڵاوکراوەکاندا چاپ بوو: "دیکتاتۆرەکان هانی ستەمکاری دەدەن، دیکتاتۆرەکان هانی کۆیلایەتی دەدەن، دیکتاتۆرەکان هانی کلۆڵی دەدەن، و قێزەونتر لەمەش، هانی گەمژەیی دەدەن، " بەم چەشنە بۆرخس نزیکەی دەساڵ سەرچاوەی بەرەنگاری ئەرجەنتین لە عاست تۆتالیتاریزم بوو. کۆمەڵە چیرۆکەکانی دواتری "ئەلف"ی ناوە کە سەردێری دواین چیرۆکی کتێبەکەیە. ئەم کتێبە تێڕوانینی تەواوی بابەتەکانی جێگەی

سەرنجی بۆرخس، یاری فیکری، ("ڕواڵەتی"، "حەکیمە ئیلاهییەکان")، ناسینی قووڵی بۆینس ئایرس لە بواری گەشت و گوزارییەوە کە سەرنج بەگشت شتێ دەدات. "مردوو"، "چاوەڕوانی"، "ئیمازۆنێت"[14]. ڕاڤەکردنی ڕای خۆی بەداخبوون لە مێژوو ("ژیاننامەی تادئۆ ئیسیدۆ دۆکروس"، "مردنێکی تر") خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو چیرۆکانە خەیاڵیبوونیانە کە وەك ڕاهێنان بۆ ڕوح لەبەرچاو گیراوە بۆئەوەی ڕێگەمان بدا لەنێو ئەندیشەی فەلسەفی و هەمەچەشنی فەرهەنگ، یەکبوونی "ئەلف"ی نهێنی ئامێز بەدی بکەین، "ئەو خاڵەی کە بۆشایی هەموو شوێنێکی تر لەخۆی دەگرێت." لێرە بەدواوە بۆرخس بە هاندانی برادەرەکانی پەسەنی کرد لەعاست بیسەرە هەرە حولحولییەکانیدا باسی شتی ئەوتۆ بکات کە بۆی سەرنج ڕاکێش بوو. "خواناسی ئێرانی"، "بووزیسم"ی مارتین بۆبێر[15]، قەباڵە[16]، ئەدەبیاتی دێرینی جەرمەنی، سۆدینبۆرگ[17]، بلیك[18]، هەڵبەستی گاچۆ[19]، ئیکسپێرسیونسیم، سێرڤانتس.........

لەم نێوانەدا نەبینی بەرەبەرە تەشەنەی کردبوو و لە ناوەڕاستی ساڵانی 1950 وە بۆرخس سۆمای چاوی بۆ خوێندنەوەو نووسین بەتەواوی لەدەست دا. هەربۆیە زیاتر لەماوەی سێ ساڵ بێبەش لە بینایی چاو ژیاو کاری کرد. وەك میلتۆن ، جۆییس، و ئەو پیاوە گریمانەییەی پێی دەڵێن هۆمێر. بەشێکی بەرچاوی بەرهەمەکانی لە تاریکیدا خولقاندوە و لەپێشدا رستەکانی بە دایکی و پاشان بە برادەرەکانی و ئەوانەی دەچوون بۆ دیدەنی کردنی دیکتە دەکرد. دەستی بە گۆڕینی عادەتی تەکنیکی خۆی کردبوو، بە چەشنێك کە پەخشانی خستە ئەولاوە بە کەڵکوەرگرتنی هەڵبەستی کلاسیکی دەستی بە ئیشکردن کرد چونکی هۆشی باشتر ئەزبەری دەکردو هەر لەم کاتانەدابوو کە شانازی لەهەموولایەکەوە ڕووی تێدەکرد. ساڵی 1955 بە ئەندامەتی ئاکادێمیای ئەدەبیاتی ئەرجەنتین وەرگیراو هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ بێکت خەڵاتی کۆنگرەی نێونەتەوەیی بڵاوکەرەوەکانی پێبەخشرا. دوای سێ ساڵ ژیان لە چوار دیواریدا، بۆ شوێنە جیاجیاکانی جیهان بانگهێشت دەکرێت و کۆنفرانسی زۆر لە ئەمریکاو ئەوروپادا پێك دەهێنێ. ئەوکات بۆرخس بووبوو بە مرۆڤی ڕۆژگاری خۆی.

لەگەڵ ئەم هەموو دژواریانەدا، بۆرخیس قەت ئاواتی ژیانی چالاك و مەترسیکردنی بەرنەدا. زۆر جار ئاخی هەڵدەکێشاو دەیوت:"من نە دەستم بە ژیان ڕاگەیشت و نە بە مەرگ." بۆ قەرەبووکردنی ئەم بێبەشییە دەستی بە ڕێزگرتنی بابوو باپیرە سەربازەکانی کردو ڕووداوی کێشەی منداڵە شەڕفرۆشەکان، سەمای تانکۆ (*tango*) لە کۆلیتەکاندا (پیاوێك لە سووچی دیوارە ڕەنگ ڕەمڵییەکە) دزی کردن لەپامپا (*pampa*)، (مردوو)یان کۆکردنەوەی کۆمەڵێك بچووکترین جینایەت لەژێر ناوی "مێژووی گشتی بێ متمانەیی". بەڵام چونکی لەسەریەك ڕووداوی فیکری و دروستکردنی بەرهەمی هونەری لەم چەشنە ڕووداوانە پێ باشتربوو، هەروەك خۆی دەڵێت چەشنە

"ژیانێک"ی نمونە لە شێوەی ژیانی فلۆبێر و ڤالیری گرتەبەر. بەڵام ئەم شێوە ژیانە لە هەر حاڵدا بۆی بەژانبوو، دۆست و یاریدەدەرە ئەدەبییەکەی ئادۆلفۆ بیۆیی کاسارس، ماوەیەك بەر لە ئێستا لە ستوونی ڕۆژنامەی ئیتالی "ریپۆبلیکا"دا نووسی: "هەمیشە بۆرخسی بە عاشقی دیوە، بە هیوا بڕاوییەوە عاشق. بەڵام ئەم عەشقانە قەت دوو لایەنە نەبوون. ئەو دانپیادانانەی بۆرخس لە گۆشە و کەناری بەرهەمەکانیدا نووسیونی و بێ شك بە کینایەوەن و هیوادار بووە ئەم نووسراوانە نەدەنە پاڵ خۆی (دانپیادانانەکان بەژانن). دانپیانانی ئەو مرۆڤە داخ و کەسەر هاڕیویەتی. لە هەڵبەستێك لە ژێر ناوی "بەشێك لە مەراسیمی تازیە"دا دەڵێت:...

.. پیربوون لەم هەموو ئاوێنەدا

کنەوپشکنینی بێهوودەی نیگای مەڕمەڕی پەیکەرەکان

توێژینەوەی بەردە نوسراوەکان

قامووسەکان، کتێبی خەریتەکان،

بینینی ئەو شتانەی ئینسانەکان دەیبینن

مەرگ: "دەسپێك"ی دژوار، دەشت

ئەستێرە شۆخ و شەنگەکان

و نەبینی هیچ یان نزیك بە هیچ شتێ

جگە لە روخساری کیژۆڵەیەکی جوانی بۆینس ئایریس

روخسارێکی دڵخوازیی منی ناوێت"...

بۆرخس ماوەیەك بەر لە کۆچی ماڵئاوایی لەگەڵ خاتوو "ماریاکۆ داما – *mariakodma*" ژیانی هاوبەشی پێك هێنا. ئەوی لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە ناسیبوو، بەیەکەوە ئینگلیزی و ئایسلەندی فێربووبوون، بەیەکەوە گەشتیان بۆ دەوری دونیا کردبوو.. هەردووکیان یەکتریان خۆشدەویست. بەیەکەوە بەرهەمی "سنوری ئستولۆسون[20]"یان وەرگێڕابوو.

کاتێ چەند ڕۆژێ بەر لە مردنی، لەگەڵ "جۆن پییر برنیس *jean Pierre Bernes*، بە مەبەستی چاپکردنی بەرهەمەکانی لە چاپەمەنی "پلێیاد – *pleiade*"دا پێداچوونەوەیان دەکرد، لە پڕ بە دژی هەنێ لە بانگەشەکانی رابردوو تووڕە بوو کە بوو بوونە هۆی چارە رەشی بێ ئەملاو ئەولا..

لێرە بەملاوە دەیزانی ئەو بەختەوەرییەی هەردەم وەك ئەرکی سەرشانی سەیری دەکرد و لە ماوەی ژیانیدا خۆی لێ لادەدا، گونجاو بووە و ڕێگەی پێدراوە ئەزموونی بکات. لە کتێبی "هاوسوێندەکان" دوا دیوانی شیعری دا دەڵێت ڕۆژێ نەبووە بێئەوەی بۆ چرکەساتێك لە بەهەشتدا بین، تێناپەڕێت.

"هیکتۆر بیانسیوتی – *Hector Bianciotti*" نووسەری بەناوبانگی هاوشاری بورخس کە شەوی مردنی لە پەنای بووە دەنووسێت: "شەوی مردنەکەی – شەوێك لە شەوان – کازیوەی بەیانی وام هاتە بەرچاو هەناسەدانی کە تاکوو دە کاتژمێر پێشتر ئاسایی بوو، کەوتوونە ئەژماردن، بڕیارم دا ماریا بانگ بکەم کە خەوی لێبڕابوو ساتێ پشووبدات، بەڵام ئەو چەشنی ئەو فریشتەیەی لە تابلۆی – "کارپاتچو"[21] بە شوێن سێبەرەکەیدا دەچێتە ژووری "قەدیسە ئورسوڵا – *Sainte ursule*" لە شیپانەی دەرگاکە بوو. هاتە پێشەوە، دانیشت و دەستیگرت. بۆرخس بانگیکردبوو

بۆئەوەی تەنیا شتێ کە هی خۆی بوو بەوی بدات: مردنەکەی.

*Questi che mia da me non fia diviso…*

"ئەوانی قەت لێم جیانین."

بۆیە پەیم پێ برد ئەو دوو بوونەوەرەی یەکتریان خۆشدەوێت، شتی بە یەکدی دەڵێن کە هیچ لە خواحافیزی ناچێت.

بورخس ئەم وتەی دووپاتکردۆتەوە: هەموو خوێندنەوەکانی کتێب، دەوڵەمەندتری دەکات، کتێبەکان لەگەڵ زەمەن و وەچەی خوێنەرە – یەک لە دوای یەکەکان، تەنانەت دەتوانی گۆڕانی بەسەردا بێت. راڤەکردنی هیچ بابەتێکی رۆژانە نییە کە ئیحتمالی بوون بە ئاوازی شینگێری تێدانەبێت.. ئەو نەک تەنیا کۆمیدی ئیلاهی بەڵکوو راڤەکردنی زۆریشی لێ خوێندبۆوە و هەمدیس خوێندبوویەوە. بۆرخس خوێنەرێکی چێژخواز، هاوتایەکی ئاسایی و بەتایبەتی لە بابەتەکانیدا کە شێوەیەکی کەڵکوەرگرتنە لەو بابەتانەی خوێندونیەوە. شێوە وردبوونەوەیەکی ماندوویی نەناسانە بیندراوەکانمان پێ پێشنیاز دەکات کە ئێمە لە ناچاری یاخود پەلەکرد، جارێك و بۆ هەمیشە پەسەندمان کردوون.

لە یەکێ لە چیرۆکەکانی گەشتێکیدا دەڵێت: "لە سێ سەد یان چوارسەد مەتری هیرەمدا، داهاتمەوە، مشتێ رەملم هەڵگرت، هەندێ لەولاوەتر بە ئارامی رۆم کردەوە و بە دەنگی نزم وتم: "ئێستا خەریکی گۆڕینی بیابانم". بەم پێیە ئەو هەچ کتێبێکی خوێندۆتەوە بۆ ئێمەی گۆڕیوە، بۆ وێنە کتێبی دانتی..

## پەراوێزەکان:

1-بۆرخس سالی 1986 کۆچی دوایی کرد، ئارامگەکەی لە گۆڕستانی "لێروا"ی "جنێڤ"ی سویسرایە.

*2-Emir Rodriguez*

*3-Lunfardo*

*4-Evaristo*

*5-sur*

*6-victoria*

*7-critica*

*8-Histoire universalle de l in famie*

*9-john aitken carlyle*

*10-adolfo bioy casares*

*11-bustos domecg.*

*12-tionugbar,orbistertius*

13-*juan Domingo peron* – سەرۆکی کۆماری ئەرجەنتین لە سالانی 1946-1955.

*14-Emmazunz*

15-*martin Buber* فەیلەسووفی جوولەکە (1878-1965) نووسراوە فەلسەفی خواناسییەکەی زۆرتر لە فێرکاری جوولەکە و ئەوانیتردا کاریگەری بوو.

16-*kabbla* شیکردنەوەی نهێنی کتێبی پیرۆز لە نێو رەبێنە جووەکان و هەندێ خاچ "پەرست"ی سەدەی ناوەڕاست کە لە سەرەتادا دەماودەم دەگەڕا پاشان بوو بە کتێب.

17-*immamnuel Sweden borg* (1688-1772) زانا و فەیلەسووفی سویدی.

18-*william Blake* (1757-1827) هونەرمەند و شاعیری ئینگلیزی.

19-*Gaucho* گاچۆیان گائۆچۆ گاوانی ئەمریکای باشوور، نیشتەجێی پێدەشتی سەر سەوز و بێ دارو درەختی باشووری رووباری ئەمازۆن (بە ناوی *pampa*). ئەمانە لە رەگەزی (مەستیۆ - *mestiso*) و دوورەگەن و لە تێکەڵاویی. ئیسپانی و پرتوگالی لەگەڵ سوور پێستی نیشتەجێی ئەو شوێنە پێکهاتبوون. گۆرانی و داستانەکانی گاچۆ هەلومەرجی ناسیۆنالیزمی ئەدەبی بوو. هۆنەرو نووسەرانی ئەمریکای باشوور بەتایبەت ئەرجەنتین، برەویان بە بەرهەمی ئەدەبی و پاراستن و پەرەپێدانی فەرهەنگی گاچۆ دا. هۆنراوەی مارتین فیرۆ بەرهەمی خۆسێ ئەرناندز لە راستیدا بەناوبانگترین وێنەی ئەم چەشنە بەرهەمانەیە. لیئۆپۆڵدۆ لۆگۆنیس ئاگاداری بەشێکی بەرچاوی گاچۆکان لە مێژووی گەلی ئەرجەنتین بوو، و رۆمانە مێژووییەکەی "جەنگی گاچۆکان - 1905" باسی دەوری پاڵەوانە ونەکانی گوندی لە جەنگەکانی سەربەخۆییدا دەکات. بەناوبانگترین رۆمانی گاچۆ: (*Donsegundo sombra* - 1926 بەرهەمی ریکاردۆ گۆئیرالدز - *Ricardo Guiraldes*)ە.

20-*isturlusson* *snor* (1178-1241) مێژوونووسی ئایسلەندی و گەورەترین کەسایەتی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەدەبیاتی نۆرس. بەرهەمی بەناوبانگی "ئەدای سنووری" سەبارەت بە شێوەی هۆنەرییە و لە هەمانکاتا کۆمەڵێك ئۆستوورەی نورسی لەخۆ گرتووە. بەرهەمەکانی تری "ساکای گەورە ناسراو بە - پاشایانی نەرویج"، کە بەرواری 1177ی بەسەرەوە.

21-*carpaccio* *vittore* (1450-1522) نیگارکێشی ڤینیزیای، کارەکەی کاریگەری نیگارەکانی "بلینییەکان - جنتلە و جووانی" بەسەرەوەیە. تابلۆکانی قەدیسە ئورسۆلاو.. باشترین بەرهەمانی.

# دڵدارە هەرە ئازیزەکەم
# نامەی نێوان ئانتوان چیخۆف و ئۆلگاکنیپەر

له فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**چیخۆف**

**17ی نیسان - یاڵتا**

ئەمڕۆ پۆستەرێکی گەورەم پێگەیشت "خاڵ ڤانیا" کەم لە"پراگ" سەرکەوتنێکی نائاسایی بەدەست هێناوە. ئازیزم هەموو ڕۆژێك لە "یاڵتا" باران دەبارێت، هەوا شێدارە، بەهۆی ئەو شێ زۆرەوە لالەکانم دەبێت زۆر گەورەبن. لە مۆسکۆ چی دەکەیت؟ بنووسە چکۆڵە ، تەمەڵ مەبە، بەبێ تۆو نامەکانت دەستم ناچێتە هیچ کارێك { .... } گوڵە باخەکانم هێشتا نەپشکوتوون بەڵام بەم زوانە دەپشکون {...}

**کنیپەر**

**17ی نیسان - مۆسکۆ**

ئاخری گەیشتینە مۆسکۆ ئانتونی ئازیز! ئێستایش ناتوانم ئەو بیرە لەسەرم دەربکەم کە جیابوونەوەکەمان هۆیەکی ماقووڵی نەبوو بێجگە لەوەی کە من ژنێکی ئازادم. ئەمە هەر بۆ ڕواڵەت بوو وانیە؟ تۆ دەڵێی چی؟ کە وتیشم من لەگەڵ "ماشا"دا دەڕۆم تۆ تەنانەت یەك وشەیشت نەوت کە ناتەوێت من بڕۆم. تۆ هیچت نەوت، منیش بەو ئاکامە گەیشتم کە ناتەوێت ئەو کاتەی "ماشا" لەماڵەوە نیە من لەگەڵتا بم *que dirale mond*[1] ئایا ئەمە ڕاستیەکە بوو؟ من وای نابینم ، مێشکی خۆم گوشیوە تا هەموو شتێك بزانم ، هەرچەندە هیچ گومانێکم لە هەستی تۆ نیە، یان لەوانەیە بەتەواویی نەتوانم ئەو شتانەی لای من زۆر گرنگ بوون بە ڕاشکاوی پێتی بڵێم. لەبیرتە ئاخر ڕۆژ چەندە چووبوومە پێستەکەی خۆمەوە؟ وات دەزانی لە تۆ تورەم. ئێستا گەلێك بێزارم و حەزدەکەم زۆر شتت بۆ بنووسم .هەر شتێك کە هەستی پێ

دەکەم و تۆیش بتوانیت درکیان پێ بکەیت، داوات لێدەکەم وەك هەمیشە خۆتی لێ گێل نەکەیت. دەڵێی چی؟ ئایا لەبارەی ئەوشتانەوە کە ناتوانین قسەیان لەسەربکەین هەروا تێپەڕین و بێدەنگ بین؟ من دەزانم تۆ لە باسی جیدی و کێشەو چارەسەرکردنیان کەمتەرخەمیت، بەلآم من بەدوای چارەی کێشەیەکەوە نیم. دەمەوێت وەك هاوڕێیەکی نزیك لەگەڵتا بدوێم. ڕاستت دەوێت لەگەڵ ئەوەیشدا کە ماوەیەکی زۆرخۆشم لە"یاڵتا" لەگەڵ تۆدا بەسەربرد، بەلآم کە بیر لەو دوا دیدارە لەگەڵ تۆدا دەکەمەوە ناخۆشەو هێشتا شتێکم هەر لە دڵدایە، هەستم بەشتێك دەکردو نەمدەتوانی بیلێم، شتێکی نهێنی. ڕەنگە تۆ پێت خۆش نەبێت دەربارەی قسەبکەم، ئەگەر وایە بەڕاشکاوی پێم بڵێ، نامەوێت نارەحەتت بکەم. من تەواو چاوەڕێی بەهاربووم کە بتوانم لەجێگایەکدا پێکەوە دابنیشین. پێم خۆشبوو هەرنەبێت دووسێ مانگ لەگەڵ یەکتردا بین و لەیەکەوە نزیکترببین، بەلآم لەم دیدارەدا دیسانەوە من "میوان"ێك بووم لە "یاڵتا" بەڕاست بەلاتەوە سەیرنیە؟ وانیە؟ من کەمتر لەم لایەنەوە نووسیومەو ئێستایش لە نووسینی پەشیمانم، بەلآم دەزانم تۆ دەتوانیت هەستی پێ بکەیت و بەتەواوی تێی بگەیت. ئەگەر دەتەوێت بەڕاستی وەلآمی ئەم قسانە بدەیتەوە، یەکسەر وەلآمی نامەکەم بدەرەوە. تەنانەت ئەگەر لەگەڵ مندا تەواو پێچەوانەیشی هەرشتێك بڵێ. ئێستا ئازیزەکەم ماچت دەکەم ، مۆڵەت هەیە؟

لەمۆسکۆ هەموویان لە گەڕانەوەکەم سەریان سووڕماوە، نازانن بۆ، بەگشتیانم وتوە دایکم حەزی کردوە بیمەوەو کێشەی ئاپارتمانەکە چاربکەم. ئەمڕۆ سەرێکم لەشانۆ دا. لافاوی پرسیار بەسەرما ڕژا. ئێستا تۆ چۆنیت، بەسەرکەوتنی "سێ خوشکەکە" شادمانیت؟ کەی دێیت و پرسیاری بێ کۆتایی. "ڤیشنیڤسکی" دەڵێت نامەیەکی زۆر غەمگینت بۆ ناردوە، ڕاستە؟ عەسری ئەمڕۆ سەعات 7 لێدوانێك لەسەر "کریمەر" هەبوو، بەلآم زۆر سەرنج ڕاکێش نەبوو"نمیروڤیچ" بەم زوانە دێت بۆ یاڵتا، دەیبینیت، هەوای "یاڵتا" چۆنە؟ گوڵە سۆسنەکان پشکوتوون؟ چیمەنەکە ڕواوە؟ دایکم بەگەڕانەوەم زۆر خۆشحاڵە"ئیگروڤنا"[2] خەریکی دروست کردنی کێکی جەژنی پاکە. هەموو نازم دەکێشن، بڕیارە سبەینێ ددانم بکێشن. چەناگەی خوارەوەم هێشتا دێشێت. ئازارێکی وام چەشتوە حەز ناکەم بیری لێ بکەمەوە. وەلێ شتێك دەزانم. ئەگەر نەخۆش بکەوم تاقە کەسێك کە بهێڵم بەسەرمەوە بێت "ماشا"یە، زۆر چاکم لێ تێدەگات، تۆ ئاگاداریم دەکەیت؟ هەمووکەسێك پێم دەڵێت باشم ، کێشم زیادی کردوە، خەوێکی خۆش. سبەینێ دیسان بۆت دەنووسمەوە. ماچێکی گەورە. دەتەوێت؟

کنیپ شیز

زوو وەرە، زەماوەند دەکەین و پێکەوە دەژین، وایە ئانتونیۆی خۆشەویستم؟ ڕۆژەکانت چۆن دەگوزەرێنیت؟ بە وردی شتەکانم بۆ بنووسە و پەنامەبەرە بەر قسەی بێ مانا و گاڵتە.

ماچت دەکەم: ئۆڵگا

سـلاوی زۆرم بـه دایکـت بگەیەنـه، هـەوا خۆشەو هەتاوە، بە دەزماڵێکەوە دەچمە دەرەوە هەرچـەند هـەوای عەسـران کـەمێك سـاردە، دەشتەکان پڕن لە شکۆفە.

* * * * * *

**کنیپەر**

**18ی نیسان – مۆسکۆ**

سەعات دووی بەیانیەو من دیسانەوە نامەت بۆ دەنووسم ئانتونی ئازیزترینم! ناتوانم یادت لە سەرم دەربکەم، هەر کە بیرت لێ دەکەمەوە، لەپڕ هەست دەکەم کە تۆ لە من بێتاقەتیت، تۆ منت وەك جاران خۆش ناوێت و تەنیا دەتەوێت بـە جۆرێـك لـە بەردەسـتتدا بم، بـە چـاوی کەسێکەوە تەماشام ناکەیت کە لێتەوە نزیکە. من ناتوانم بێ تۆ بیر لە ژیان بکەمەوە، بمبوورە ئـازیزم کـە دیسـانەوە بـاس لـەم مەسـەلەیە دەکەمـەوە، تـۆ حـەزت بـەم قسـە ژنانەیـە نیـە، جارێکی تر وا ناکەم.

ئاخری ئەمڕۆ چووم بۆ لای پزیشکی ددان، وتی پێویست ناکات ددانم بکێشم، وتیشی وام بۆ پـڕ دەکاتـەوە کـە تـا بیست ساڵ هیچی لـێ نەیەت، ئەمڕۆ ئاپارتمانێکی زۆر بچووکم نزیك بە کۆلانی "لیونتیڤسکی"[3] پەیدا کرد. دایکم ناڕاستەوخۆو بـە پـێچ و پـەنا لێـی پرسیم ئایا لەگەڵ تۆدا دەژیم یان بیرێکی ترم هەیە. ئێمە هێشـتا بڕیارمـان نـەداوە و نـازانم چ وەلامێکـی دایکم بدەمەوە. من ناتوانم تـەنیا بە مووچەکەی خـۆم بـژیم. هەڵبەتـە ئەگـەر کـار بـە دەسـتی دەوڵـەت بوومایـە و لـە شـانۆدا کـارم نەکردایـە دەمتـوانی بـژیم. ئەوسـا دەمتـوانی داهـات و خەرجیەکانم ڕێك بخەم. ئەم کارە لـە شـانۆدا زۆر دژوارە. وام بـیر لێکردۆتـەوە کـە شـتەکان بـەم جـۆرە ڕێـك بخـەم: لـە ئاپارتمانـە تازەکـەدا دوو ژووری جیـا دەگـرم و 200 ڕۆبـڵ بـە دایکـم دەدەم. چـونکە ئـەم ئاپارتمانـە 200 ڕۆبـڵ لـە ئاپارتمانەکەی پێشوو گرانترە. بێجگـە لـەوە من چـەند بتـوانم دەبێـت بـە دایکمـی بـدەم. ئەگـەر لەگەڵ ئەودا نەژیم دەبێت لە شاردا کرێ گرتەی باشـــی بـــۆ پەیـــدا بکـــەم، چـــونکە ئاپارتمانەکـــە 1400 ڕۆبـــڵ دەهێنێـــت و زۆر ڕەحـەت و زۆریشـی تـێ ناچێت. دایکم گـەلێك خـەمبارە، کـە دەیبینم دڵـم دەگوشرێت. دەبێت ئێمە تا 15ی مایس ئاپارتمانێك پەیدا بکـەین. ئەگـەر زوو بێیـت حەزدەکـەم لـەم بارەیـەوە قسەت لەگەڵدا بکەم. تۆ وەلامم دەدەیتـەوە؟ یان لـە نووسـینی شـتی بـێ نـرخ لـێم تـووڕە دەبیت؟ وەلـێ بـۆ مـن ئـەم شـتانە بـێ نـرخ نـین. دەمـەوێت بـۆ زستان گۆشەیەکی چەپەك پەیدا بکـەم و ئیـدی ئـەم ئـازار و زەحمەتانـەی ڕابووردووم لە کۆڵ بکەوێت.

* * * * * *

**چیخۆف**

**19ی نیسان – یاڵتا**

ئەکتـەری ئـازیز، دڵدارەکـەم، دەتـوانین بـە درێژایی رووباری "ڤۆڵگا"دا بەرەو خوار بڕۆین، بۆ نموونە بۆ "ئاستەرخان" دەڵێی چی؟ بیرێکی لـێ بکـەرەوە. مـن دەتـوانم خێرا بێم بـۆ "یار و سلاڤل" یـان "نیژنی"[4] یـان بـۆ "ریبینسـك"[5] دەبێـت چـەند بتـوانین ئـەم هاوینـە خـۆش

بەســـەربەرین، مانـــای چـــەند بتـــوانین بـــڕۆین بـــۆ شـــوێنێك دوور لـــە خـــەڵك. لـــە یاڵتـــا بـــاران دەبارێت (...)

* * * * * *

**چیخۆف**

**19ی نیسان – یاڵتا**

تووتەڵـە چـكۆڵەكەم، ئۆڵگـا! لـە سـەرەتای مایسدا دێـم. هـەر كـە تەلگورافەكـەم گەیشت لـە ئوتێـل "درسـدن" بپرسـە كـە ئایـا ژووری ژمـارە 14 خاڵیـە. مەبەسـتم ئەوەیـە ژوورێكـی هـەرزان پەیدا بكە (...)

ئەگـــەر قایـــل بوویـــت وەك دوو ماســـی بـــە "ڤۆڵگـا"دا دەڕۆینـە خـواریَ (...) ئەگـەر قـەولم دەدەیـــتێ كـــە لـــە مۆســـكۆ كـــەس نـــەزانێت زەماوەندمان كردووە مەگەر دوای تـەواو بوونی ڕیَ و ڕەسمەكـە، ئەوسا هـەر تـەواو ئـەو ڕۆژەی كـــە دەگـــەم دەتـــوانین ببینـــە ژن و مێـــرد، لەبەرئەوەی لە زەماوەند دەترسم، لە پیرۆزبـایی لێكردن و شامپانیا، لە وەستانی ناو هۆڵ و پێك بەدەستەوە گرتن زەردەخەنەیەكی بیَ كۆتایی بە ڕوخسارەوە. (...)

* * * * * *

**كنیپەر**

**21ی نیسان – مۆسكۆ**

دوێنیَ شەو خەوم بە تۆوە بینی ئازیزترینم! دەزانیت لـە كوێدا؟ لـەواگۆنی شـەمەندەفەرێكدا كە پێكەوە لە سەفەردابووین، تۆ ماچت دەكردم و من لە خەو ڕابووم. بەم زوانە دێیت وانیە؟

تۆ خۆت نیت، ئەمە هەستی هەمیشەیی منە، نامەكـەی دوێنێـت ئەمـە دەسـەلمێنێت. ئانتونی ئـازیز لەگەڵمـدا سـانا و سـادەتر بـە، لەگەڵمـدا ڕاستگۆتر بە. ئەمـە لـە خـۆ گرتنت زۆر باشترە. دیارە كارناكەیت، هەرناچیت بۆ شار؟ كـیَ دێت بۆ بینینـت؟ ئایـا لەگـەڵ "ئۆڵگـا میخایلوڤنـا"دا بەم زوانە هاوسـەرگیری دەكـەیت؟ شیربایییەكەی چەند دەبێت؟

* * * * * *

**چیخۆف**

**22ی نیسان – یاڵتا**

كنیپ شیزی ئازیز و شیرین. من بۆیـە داوام لیَ نەكردیت بمێنیتەوە چونكە خـۆم لـە "یاڵتـا" بێزارم، بیرم لەوە كردەوە هەرچۆنێكە دەبێت بە زوویی لە هەر شوێنێكدا دڵمان پێی خـۆش بێت یەكـدی ببیـنین، دڵدارەكـەم تـۆ بـیَ هـۆ ئـازاری خـۆت دەدەیـت، مـن هـیچ نهێنیـەكم نیـە، مـن ئەوەی بە بیرمدا دێت دەیڵێم.

لە سەرەتای مانگی مایسدا لـە مۆسـكۆ دەبم، ئەگەر ڕیَ بكەوێت زەماوەند دەكـەین، سـەفەرێك بـەرەو ڕووبـاری "ڤولگـا" یـان "گـا" و پاشـان زەماوەندەكە دەكەین. تۆ چۆنت پـیَ خـۆش بێت وا. دەتـوانین بەلـەمێك لـە "یاروسـلاڤل" یـان "ڕیبوسـك"[6] بگـرین و تـا "ئاسـتراخان" بچـین. لەوێوە بۆ باكۆ و لە باكۆیشەوە بۆ "باتوم" ئەمـە بۆ تۆ باشە؟ یان ئەگەر پێت چاكە بەرەو باكوور لە "دونیا"[7] وە بۆ "ئارخان گلسك"[8] و لەوێوە بۆ دوورگەكانی "سولوڤیتسكی" بڕۆین، تۆ هـەر شـوێنێكت پـیَ خـۆش بێـت دەچـین. پاشـان زۆربـەی زسـتان لەگـەڵ تـۆدا، لـە مۆسـكۆ و لـە

ئاپارتماندا دەمێنمەوە. بەو مەرجەی نەخۆش نەبم، کۆکە توانای لێ بڕیوم، ناتوانم گەشبینانە بیر لە ئاینده بکەمەوە، ئەمەیش هەر بەبێ شەوق و شادی دەنووسم. بەڵام تۆ دەتوانیت بیر لە ئاینده بکەیتەوە، مامۆستامبە، وەك چۆن خۆت دەیڵێیت و منیش دوایی هەر لەم بارەیەوە بیر دەکەمەوە، ئەگەر وانەبێت ناتوانین ژیانی تەواو بەسەربەرین. وای لێدێت کە هەر ساتەو کەوچکێکی لێ بخۆین.

باشە، کەواتە تۆ نەخشەی تازەت نیە؟ زۆر چاکە، ئەمڕۆ وتارێکیان لە بارەی "سێ خوشکەکە"وە لە بلاوکراوەی "ریڤوبلانش"[9] ەوە بۆ ناردوم، وەڵامەکەی تۆلستوویشم پێ گەیشت کە بۆ شورای کڵێسەی ناردبوو دەربارەی دەرکردنی ئەو لە کڵێسە. هەروەها گۆڤاری "لیس فلاوەرزنوردا"[10] یان بۆ ناردووم کە چیرۆکی "شەو لە دەریادا"ی منیان تیا چاپکردووە. "ئیڤان" نووسیویەتی کە نەخۆشە، لە شانۆی ئولۆمپیاوە تەلگورافێکم پێگەیشتوە مۆڵەتی نمایش کردنی "سێ خوشکەکە"م لێ دەخوازن. ئەمڕۆ بارانە، بایەکی ترسناك هەڵیکردووە، بەڵام ناوەوە هەوا گەرمە و خۆشە، لاقی سەگەکەم "شاتان"[11] یان شەل کردووە کە تۆ ناوت لێ نابوو "لەرو"[12] ناچار بووم بیپێچم و ئێستا هەموو ئەم ناوە بۆنی دەرمانی گرتووە. رۆبلێکت لەسەر مێزەکە لێ بەجێماوە (...) من ئەسڵەن نامەی خەمگینم بۆ "ڤیشنیڤسکی" نەنووسیوە.

گەر بێم بۆ شانۆ چی دەبینم؟ پرۆڤە لە چیدا دەکەن؟ "میشیل کریمەر؟" یان "قازی کێوی؟" زۆر حەز لە نووسینی شانۆگەریەکی گاڵتە جاڕی یان کۆمیدیایەکی چوار پەردەیی دەکەم. ئەگەر شتێك رێگام لێنەگرێت حەتمەن دەینووسم. بەڵام تا پێش 1903 نایینێرم. بەکەس مەڵێ و خۆت بە تەنیا وەرە بۆ وێستگە، گوێت لێیە؟ خودات لەگەڵ دڵەکەم، ئازیزترینم، کچە نازەنینەکەم. خەم داتنەگرێت و ئەم بیرکردنەوانەت کە خودا دەزانێت چین لە سەری خۆتیان دەربکە. بەڵێنت پێ دەدەم کە هیچ شتێکم نیە لە تۆی بشارمەوە بۆچرکەیەکیش بێت، میهربانبە، تووڕەمەبە، ماچێکی گەورە بۆ تووتەڵە چکۆڵەکەی خۆم.

ئانتونەکەت

* * * * * *

**کنیپەر**

24 **نیسان – مۆسکۆ**

ئەمە یەکەمین جارە کە بە رۆژی رووناك بۆت دەنووسم ئازیزم، ئاسایی شەوانە دەنووسم، دوشێك دەکەم، بەرگی خەو دەپۆشم، لەتاریکیدا کاتێك کە ماڵ بێدەنگەو وەرەو بڕۆو دەنگەدەنگ نامێنێت دەست بە نووسین دەکەم.

هەرچەندە هەوای ئەمڕۆ گەرمترە، هێشتا ژوورەکە ساردە، دوێنێ زۆر ترسناکبوو، لەسەرماندا پێستم تەزووی پێدادەهات و حاڵم خراو بوو، [....]دوێنێ لەگەڵ ئامۆزاکەمدا چووین بۆ بینینی نمایشنامەی تیپێکی فەرەنسی [...] زۆر بێزارکەر بوو، نمایشنامەی "سیرانو دیبرژاك"م بینی، نواندنەکان ساکار بوون، بۆیە هیچ کاریگەریەکیان نەبوو، دەمەوێت سبەینێ لەگەڵ "ماشا"دا بچم بۆ بینینی (خانمێك لای ماکسیمەوە).

سـەرم لـە شـانۆ نـەداوە، دەخـوازن پرۆڤـە لـە"قالاوی کێـوی" و"میشـیل کریمـە"دا بکـەن. مـن ئـازادم [...] لـە ڕۆژنامەکانـدا لەسـەر "خـاڵ ڤانیـا"م خوێنــدەوە، گـەلێکم پــێ خۆشـبوو، ئازیزەکەم زوو دێیت؟ لێرە ژیان بەبێ تۆ زۆر بێ تامە، هەموو چرکە ساتێك بیر لـەتۆ دەکەمـەوە ، لێم بووە بە خـوو [...] کەواتـە دێیت، زەماوەنـد دەکـەین و دەڕۆیـن بـۆ شـوێنێك ، ئەگـەر حـەزت بەهیچ شوێنێك نەکرد دەڕۆین بۆ "یاڵتـا" بـزانین زستان چۆن دەبێـت ، هـەر چۆنێك بێت ئەمساڵ بەسەر دەبـەین، ئەگـەر کێشـە زۆر بێت پێویستـە بیری لێ بکەینەوە. قبوڵتە ئازیزم؟

ماچێکی گـەورە وەك دیاری و ئـۆقرە براوانـە لەچاوەڕێتدام.

توتەڵەکەت

بەڕاست عاشقی کنیپ شیزیت؟

* * * * * *

کنیپەر

24نیسان – مۆسکۆ

تـازە نامەیـەکم بـۆ نووسـیبوویت و بـەنیاز بـووم لـەماڵ بڕۆمـە دەرەوە کـە نامەیـەکتم لـە سـندوقی پۆسـتدا بینـی. بەرنامەکـەت لـەبارەی "ڤۆڵگا" وە نایابە، من زۆر دڵشادم و وەك منداڵ زەوقــم پەیــداکردوە، مــن هــەرگیز "ڤۆڵگــا"م نـەدیوە. ئـانتونی ئـازیزم ، هـەموو شـتێك زۆر بـاش دەبێـت. مـن دڵـم گـەلێك ڕووناکـە، کەواتـە بڕیــارەو دراوە بــۆ "ڤۆڵگــا" ماچــت دەکــەم و لەچاوەڕوانیتدام .

ئۆڵگاکەت

چیخۆف

24نیسان - یاڵتا

دڵدارەکــــەم ، دیســــانەوە هــــەمان هــــەوا ناقۆڵاکــەی "یاڵتــا" ســارد، بارانــاوی، زریــان. دوێنێ "نمیروڤیچ" لێرە بوو، هێور، بـەڵام دڵ و سەری باش نەبوو، لـەوە دەچوو ئـەم ڕۆژانە پیر بووبێــت، زۆر حــەز بەنووســین دەکــات (.....) بڕیــارت داوە بۆکــوێ بچــین؟ لــەو بارەیــەوە بــیر بکــــەرەوە ئــــازیزم (.....) نووســــیوتە ئــــەو بەڵگەنامانــەی بــۆ هاوســەرگیریەتی پێویســتن بیــــانهێنم، مــــن بێجگــــە لــــە گوزەرنامــــە چ بەڵگەنامەیــەکی تــرم نیــە. کەواتــە ماڵئــاوا "لــوتران"[13]ی چــکۆڵەم . ئاگــاداری خۆتبــە، شـادبە، بێزارمەبـە، ئەڵمانیـەکی ڕەسـەنی گـوپ سوور ، حەزدەکـەی نـاوت لێ بنـێم ئۆلیا؟ باشـە، تەندروست بیت ئولیاکەم.

ئانتەکەت

* * * * * *

کنیپەر

26نیسان –مۆسکۆ

8ی دوای نیوەڕۆ

ئـەمڕۆ لەبەیانیـەوە سـەرم دێشـێ بـەڵام ورەم باشـە، نامـە جوانەکـەتم ، کـە لـەجوان جـوانترەو تیایــدا مــاچ بارانــت کــردووم پێگەیشــت. سەرم چاکترە. "ماشا" و"لیلیا"ی ئامۆزام بـاش بـۆم دەشـێلن تاخـەوم لێ بکـەوێت. دیسـانەوە ئــــەمڕۆ گەرمــــەو هــــەتاوە. [...] ئەمشــــەو "سولرژینسـکی"، "ڤیشنیڤسـکی"و "ماشـا" بـۆ ئێـرە دێـن. "ڤیشنیڤیسـکی" تۆقیـو بەتـەواوی

پیرۆزیـەکانی ئاسمـان و زەوی سـوێند دەخـوات کـە تـا یـەك دووسـاڵی دی مـن دەبم بـەژنی. بـەردەوام ئـەم گاڵتانـە دەکـات. دوێنـێ کـەمی مابوو لێی زیزبم.

دوێنـــێ "خانمەکـــە"مـــان بینـــی، گاڵتـــە جارپیەکـە لەسـەرەتادا. لەگـەڵ ئەوەیشـدا کـە ئەکتەرەکان لە پلەی یەکەمدا نەبوون بەڵام زۆر پێکـــەنین "لیلینـــا" و "ستانسلاڤســـکی" لـەوێ بـوون [...]لای ئێمـە دانیشـتن. مەسـەلەی ئـەو شـانۆگەریەی کـە دەتـەوێت بـۆ شـانۆی بنووسـیت چـیە؟ زۆر بـاش دەبێـت هـەروەها کۆمیدیاکـەیش!! بەرنامـەی سـەفەرەکەمان بـۆ "یاروســـلاڤل" و "ئاســـتراخان"و "بـــاکۆ"و "بـاتوم" زۆر سـەرنج ڕاکـێش دێتـە بەرچـاو، خۆزگا دەتزانی کە بیرکردنەوە لەم سەفەری دوو کەسـیە چـەند خۆشـحاڵم دەکـات ! مـن لـە چـــاوەڕوانیتا ئـــارامم لێ بـــڕاوە، ئێســـتا تەندروستیت چۆنە؟ کۆکـەت باشترە؟ لـە باران بارینـدا مەچۆرە دەرەوە [...]

* * * * * *

**کنیپەر**

**29نیسان- مۆسکۆ**

زۆر گریمانـــەی ئـــەوە دەکـــەم کـــە ئـــەم نامەیـــە لـــە "یاڵتـــا" بەدەســـتت ناگـــات، چـــونکە دەزانم ئەگـــەر بـــەپێی بڕیارەکـــەی خۆت بێیت ئـەوا یەکـەم یـان دووەم ڕۆژی مـایس لەوێ نابیت.

ئـاوو هـەوای ئێرە نایابە، دنیا هـەتاوە بـەڵام باشەو گـەرم نیـە. درەختـەکان لـە سـەوزبووندان، زەنگەکان لێ دەدەن دەڵێی ڕۆژانی پشوە، دوێنێ پێش ئەوەی بچم بۆ شانۆ پاڵ کەوتم و گوێم لـە دەنگیـان گـرت، هەنـدێك جـار ئـەو دەنگانـە ئاسـوودەییم پـێ دەبەخشـن. بـەڵام دوێنـێ منـی بێتاقـەت کـرد، گـوێ لێ گرتنیـان چـاکە ، بـەڵام دەردناك و ناڕەحـەت کـەرن. بیرێکـی بـێ سـەرەو بەرەم هەبوو (.........)

**تووتکەکەت**

* * * * * *

**چیخۆف**

**2مایس - یاڵتا**

(.....) 5ی مـایس یـان بەلایـەنی زۆرەوە 10ی مـانگ "یاڵتـا" بـەجێ دێڵـم . بـەپێی ئاووهەوا، پاشان بەدرێـژایی "ڤۆڵگا"دا دەڕۆین . بەکورتی دەچین بۆ شوێنێك کە تۆ پێت خۆش بێت، من لەژێر فەرمانی تۆدام.

ئەگـەر "ڤیشنیڤسکی" بتهێنێت لەعیشقەوە نیە، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی تایبەتیە. وەلێ زۆر پیـاوێکی خـراپ نیـە. بـیری لـێ بکـەرەوە ، واچاکترە شوو بەو بکەیت. بێگومان ئـەو لـەوەوە قسە دەکات کە تۆ زوو بێوەژن دەکـەویت. بـەڵام بـا بزانێـت کـە مـن پیـاوێکی کینـە لـەدڵم و لـە وەسیەتنامەکەمدا مۆڵەتی ئەوە نادەم دوای من تۆ شوو بەو بکەیت.

لەگـەڵ هـەموو ئەمانەیشـدا ئـازیزم ئێمـە بەزوویی یەکدی دەبینین و پێکەوە قسەدەکەین. خۆرنشینەو حاڵم لـەم بەیانیە چاکترە. لەوانەیە سبەینێ بگەمە مۆسکۆ. چونکە لـە4ی مایسـدا شـــەمەندەفەرێکی خێـــرا بەڕێدەکـــەوێت. تەلگورافت بۆ دەنێرم [...]

کنیپەر

6ی مایس - مۆسکۆ

تەلگوراف

تەندروستیت. بەگەیشتنت تەلگورافم بۆ بکە.

ئۆلگا

* * * * * *

چیخۆف

6ی مایس - یالتا

تەلگوراف

ڕەنگە هەینی (11ی مارس) بێم، تەندروستیم باشە.

* * * * * *

چیخۆف

9ی مایس - یالتا

حەتمەن ڕۆژی هەینی دێم تووتکەکەم.

* * * * * *

چیخۆف

24ی مایس -

مۆسکۆ

هەموو شتێك لەماڵدا ئامادەیە، دەبێت پێش سەعات یەك یەکدی ببینین و قسەبکەین. حەتمەن هەینی دەڕۆین.

ئا ـ چیخۆف

* * * * * *

لەبەرئەوەی چیخۆف خۆشیی لە زەماوەند نەدەهات ڕێ و ڕەسمێکی تایبەتی سازاند. کە دایکی کنیپەر بیستی زەماوەندەکە بەنهێنی و بێ تەشریفات دەکرێت تەواو تێك چوو، چیخۆف زۆر سپۆرتانە نەخشەیەکی داناو نەیویست کەس پێی بزانێت. ئێوارە خوانێکی لە 25ی مایسدا سازکردو هەموو هاوڕێو ئەندامانی خێزانەکەی بانگهێشت کرد. دوای چاوەڕوانیەکی دووروودرێژی پڕ لەنیگەرانی بۆ هاتنی بوك و زاوا، هەواڵیان پێ گەیشت کە ئەوان گرێ بەستێکی پەلەیان کردووەو ئێستا بۆ مانگی هەنگوین بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر دەچن. ڕێگاکەیان بەدرێژایی "ڤۆلگا" بە "کاما"و "ڕووباری سپی"دا تێدەپەڕی، دوا هەواریان ئاسایشگای "ئاکسیونوف" بوو بۆ ئەوەی چاکتر بتوانن پارێزگاری لە تەندروستی چیخۆف بکەن.

کنیپەر، یاداشت.

ئێمە 24 سەعات لە"دارستانی مەست"[14] لەپاڵ "کاما"دا گیرمان خوارد. ناچار بووین لە کوخێکدا کە چەند کیلۆمەترێك لە کەنار دوور بوو لەسەر زەوی بنووین. بەڵام خەومان لێ نەکەوت ، چونکە نەمان دەزانی دەبێت کەی بەلەم بۆ "ئوفا" بگرین. ناچاربووین هەموو شەوەکە بڕۆین و تەماشا بکەین ئایا بەلەمێك دێت یان نا. چیخۆف فەزای سەوزی "ئاکسیونوف"ی لاخۆشبوو، سێبەرە درێژەکانی دوای سەعات شەشی مێرگەکە، خڕوپفی ڕەوە ئەسپ، گوڵ و گیای خۆماڵی و ڕووباری "دیوما" کە هەموو ڕۆژێك بۆ ماسیگرتن دەچووینە ئەوێ. ئاسایشگاکە لە

دارستانێکی جوانی بەڕوودا دروست کرابوو. بەڵام بینایەکی سەرەتایی و کەمترین ئاسوودەیی تیابوو. تەنانەت بۆ سەرین پەیداکردن ناچار بووم تا "یوفا" بچم . لە سەرەتاوە چیخۆف ڕژێمی مەیاندنی شیری ماینی پێ خۆشبوو. بەڵام زوو لەبەرچاوی کەوت ، ئێمە شەش هەفتە لەوێ ماینەوە. بەدرێژایی کەناری "ڤۆڵگا"تا "تزارینیتسا"[15] و "نوڤوروسیسک"[16]ڕۆیشتین و پاشان بەڕێگای "سامارا"[17] دا گەڕاینەوە بۆ یاڵتا، 20ی ئاب لەیاڵتا بووین. پاشان من ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ مۆسکۆ. کاری شانۆ دووبارە دەستی پێ کردەوە.

## پەراوێزەکان:

1-خەڵکی چی دەڵێن؟

2-ئانا ئیگرۆڤنا سوتوگینا ماوەیەکی زۆر چێشتلێنەری ماڵی کنیپەر بوو.

3-*Leontievski*

4-*Nizhni*

5-*Rybinsk*

6-*Ribosk*

7-*Dunya*

8-*Arkhanglesk*

9-*revue blanche*

10-*Les fleurs du nord*

11-*chataigne*

12-*Leroux*

13-*Lutheran*

14-*Drunken wood*

15-*Tsarinitsa*

16-*Novorossiska*

17-*Samara*

